ئەحسین حەمەغەریب

# دوابینەکان

دوایین عاریف، دوایین فەیلەسوف، دوایین فەقیە

خوێندنەوەی فیکری سەعید نوورسی و ئەحمەدی موفتیزادە و ناصری سوبحانی

ساڵی ٢٠٠٧ زایینی

## بەناوی خودای بەخشەندە و میهرەبان


- پرۆژەی کتێبی هەژە: ژمارە یەك.
- بابەت: کتێبی فیکری.
- ناوی کتێب: دواییینەکان.
- ناوی نووسەر: تەحسین حەمەغەریب
- دیزاینی بەرگ: شێرکۆ خانزادی.
- دیزاینی ناوەوە: یاسین حەمەسەعید.
- تایپ: مەریەم موحەمەد.
- هەڵەچن: مەریەم موحەمەد ـ یاسین حەمەسەعید.
- ساڵی چاپ: ٢٠٠٧
- نۆرەی چاپ: یەکەم.
- تیراژ: ١٥٠٠ دانە
- ژمارەی سپاردن: ( ١٠٤٤)ی ساڵی (٢٠٠٦) دراوەتێ.



- چاپ: چاپخانەی یاد

## وتەیەك:

بابەتەکانی ئەم کتێبە پێش ئەوەی لەم کتێبەدا سەرهەڵبڕن پێشتر لە ژمارەی هەڤدە و هەژدەی گۆڤاری هەژاندا راکشابوون، ئەوە بوو لەبەر هەلومەرجی ئابووری گۆڤارەکە نەمانتوانی دووبارە چاپی بکەینەوە ئەگەرچی ئەوە داوای بەردەوامی خوێنەران بوو!.

بۆیە ئەو هزرە لە زەینمدا دروست بوو ئەو بابەتەکانی خۆم کە لەو ژمارەیەدا نووسیومن وەك کتێبێك چاپ بکەم بۆ ئەوەی ئەگەر نەمانتوانی بێت هەموو بابەتەکانی ئەو ژمارەیە چاپ بکەینەوە، ئەوا لانی کەم هەندێك لە بابەتەکانی ئەو ژمارەیە بەم کتێبە بخەینە بەر چاوی خوێنەران کە داوایەکی زۆر زۆر لەسەر چاپکردنەوەی هەبوو!.

ئەگەر پێداچوونەوەی بابەتەکانی خۆم لەو ژمارەیەی هەژاندا بکەمەوە ئەوا بە دڵنیاییەوە گۆڕان لە هەندێك لە راکانمدا دەکەم، بەڵام هێشتا _وێڕای ئەوەش_ باوەڕم بە را بنەڕەتیەکانی ئەو بابەتانە هەیە: واتە تا هەنوکەش باوەڕم وایە کە نوورسی دوایین عاریف و ئەحمەدی موفتیزادە دوایین فەیلەسووف و ناصری سوبحانیش دوایین فەقیهی شارستانیەتی ئیسلامین، هەر بۆیە کتێبەکەش بە ناونیشانی (دوایینەکان)ە، بێگومان ئەگەر کورد نەبوونایە ئەوا ئەزموون و داهێنانی هەر کام لەو سێ بلیمەتە زۆر لەوەی ئێستایان زێتر جێگەی گرنگی پێدان دەبوون، خوازیارم توانی بێتم بەم نووسینانە کەمێك لەو چاکانەی هەر کام لەو دواییینانە لە تەك مندا بە بیروڕا و بابەتەکانیان کردوویانە بە ئێوەی خوێنەری ئازیزی بگەیەنم، ئەمەش نەك لەبەر ئەمەك بەڵکو لەبەر مافیان لەسەرمان و سوودیان بۆ ئەم قۆناغەی رۆشنبیری کوردی!.

زۆر سوپاسی کاك یاسین حەمەسەعید دەکەم کە کتێبەکەی بۆ چاپ ئامادە کرد و سوپاسی کاك ئومێد حەسەنیش دەکەم لە گۆڤاری هەژان کە ئەرکی گواستنەوەی بابەتەکانی لە دونیای وتنەوە بۆ دونیای نووسین گرتە ئەستۆ، هەر بە هەمان چەشن گەلێك سوپاسم بۆ هاوسەرم خاتوو مەریەم موحەممەد هەیە کە شەونخوونی زۆری کێشا لە تایپکردنی بابەتەکاندا. دواجاریش سوپاس بۆ ئێوەی خوێنەریش کە داوا و پرسیارەکانتان بوونە هۆی ئەوەی ئەم بابەتانە ببنە کتێب و هیوادارین لە نزاکانتاندا لە حزوری پەروەردگاردا لەبیرمان نەکەن!

تەحسین حەمەغەریب

سلێمانی

٢٠٠٦/١١/٢٥

# له نێوان عاریف و فەقیه و فەیلەسوفدا
## خوێندنەوەیەک بۆ فیکری:
## سەعید نوورسی، ناصری سوبحانی، ئەحمەدی موفتی زادە

پێشەکی:

ناتوانین له قووڵایی فیکری هەرکام له (سەعید نوورسی، ناصری سوبحانی، ئەحمەدی موفتیزادە) تێبگەین هەتا دونیای دوێنێ... جیهانی پێش سەردەمی نوێ نەناسین، چونکە ئەوان دوایین نوێنەری ئەو دونیایە بوون لە سەردەمی نوێدا، بەڵکو دوایین نوێنەری ئەو سەردەمە بە هەموو بلیمەتی و بوێری و سادەیی و کوردبوونی خۆیانەوە، دوایین نوێنەری جیهانێك کە له بەرامبەر عەقڵانی و بچووکی و وردەکاری و رووکەش و چێشتانی و بینراوی سەردەمی نوێدا پڕ لە راز و گەورەو پڕ لە مەدهۆشی و قووڵ و زیندوو و نەبینراو ، بەڵکو دیوە نەبینراوەکەی لە دیوە بینراوەکەی فراوانتر، هاتن لەو دونیایەوە و سەردەرهێنان لە پەنجەرەکانیەوە یەکەم خەسڵەتی هاوبەشی ئەو (سێ پیاوەیە)، دواجار هەر ئەو خەسڵەتەش وایکردووە ئەوانی کورد ببنە کۆتا و دیارترین کەسی سەردەمی پێش مۆدێرنە لە سەردەمی مۆدێرنەدا، واتە لە (کورد)دا نوێنەری سەردەمی پێشتر هەڵبکەوێت، هەر بۆیە ئێمە ئەو پرسیارەمان کردبوو بۆچی دەبێت دوایین (عاریف و فەقیه و فەیلەسوف) کورد بن؟ کە سێ تایپی نوخبەی پێش سەردەمی مۆدێرنەن، راست ئەمەشە داستانی بوونی کورد لە سەردەمی پێش سەردەمی نوێ و ئیدی ئەم داستانە زۆر بەلەزەت و زۆر لەمە زیاتر قسە لەسەر کردن دەخوازێت _واتر دێمەوە سەری_ ئەگەر نەتوانین لەو سێ کەسە تێبگەین ئەگەر لە سەردەمی پێش مۆدێرنە تێنەگەین، ئەوا ئەو سەردەمە لەم سەردەمەدا ناتوانێت حزووری زەمەنی و فیزیکی ببێت ئەگەر بڵێین

وەك بونیاد پێشتریش حزوری فیزیکی هەبووە، چونکە لە رووی زەمەنی مێژوویی رووکەشەوە بە هاتنی سەردەمی نوێ ئیدی ئەو زەمەنە کۆتایی هاتووە، هەم لە رووی فیزیکیشەوە سەردەمی پێشتر لە بواری فیکری و رۆحی و کردەییەوە سیستەمێکی تەواو بووە، دووبارە بە هاتنی سەردەمی نوێ و ئامرازەکانی کەشتی ئەو سیستەمە تەواو کونی تێبوو و لە دەریای مێژوودا نیشت، رەنگە تاك و تەرە سەرنشینانی ئەو کەشتیە هەنووکە لە رووی دەریادا دەستیان بەر دارێك.. تەختەیەك کەوتبێت ئێستا لە رووی دەریادا بن کە یان دەبێت بگەنە دوورگەی سەردەمی نوێ و یان ئەوانیش وەك سەرنشینانی پێشتر لە دەریادا نغرۆ بن و بنیشن، هەر لێرەوە (نوورسی و سوبحانی و موفتیزادە) لەو سەرنشینانەی سیستەمی (فیکری، کردەیی، رۆحی) وەلامگۆی پێویستیەکانی سەردەمەکە بوون لە رووی فیکریەوە فەلسەفەی میتافیزیك و کەلامی کۆن و لە رووی کردەییەوە شەریعەت و ئەحکامەکانی و لە رووی رۆحیشەوە زانستی عیرفان و ئەخلاق (زەین و کردە و رۆحی) مرۆڤەکانی ئەو جیهانەیان کەیل دەکرد، سەردەمی نوێ بە هەردوو دەستەکەی خۆیەوە (عیلم، عەقڵی پارەیی) ملۆزمێك بوو لە کەشتی ئەو جیهانە و سیستەمەکەی پەیدا بوو بە کون تێکردنی بووە مایەی نیشتنی ئەو کەشتیە، ئیدی ئەو سەردەمە وەك سیستەمێك کە جیهانێك بخولقێنێت هەنووکە بوونی نیە و ناتوانێت ببێت، بەلام دەکارێت مرۆڤەکانی ئەو سەردەمە لێرە وەك مرۆڤی پاڵەوان و بوێر و زیرەك و رۆحانی و دەرەوەی مێژوو و نامۆ و تەنانەت (شێت) بوونیان ببێت، سەیری چیرۆکی ژیانی ستایلی نەگونجاوی لەگەڵ ئەم سەردەمە و بە شێت لە قەڵەمدانی و زیرەکی بێ وێنەی نوورسی و هەروەها جیدیەت و زیرەکی و کەم خەوی و سادەیی و هتد..هەرکام لە سوبحانی و موفتیزادە بکە !.

بەلام ئەگەر هەرکام لەوان راست جیهانی پێش ئەم سەردەمەمان بهێننەوە بیر و ئەوەش هاوبارترین خاڵی هاوبەشی هەرسێکیان بێت، رەنگە سەیرترین نوکتەش بێت: کە ئەوان چۆن توانیان وابن، واتە هەرسێکیان چۆن توانیان ئەو ئەرکە پاڵەوان پروکێنە بگرنە ئەستۆی خۆیان کە لە هەناوی مۆدێرنەدا بتوانن لە سەردەمی پێش مۆدێرنەدا بژین (بژین نەوەك باسی ئەو سەردەمە بکەن) و ئەمەش بەهێزترین خاڵی ئەوان بێت، ئەوان نەك هەر لەو سەردەمەدا ژیان، بەڵکو توانیان شیمانە و ئیمکانە کۆتایی پێهاتووەکانی ئەو سەردەمە بۆ ناساندن و پڕکردنەوەی بۆشاییەکانی

سەردەمی نوێ بەکاربهێنن لەوانەیە رۆشنبیری حوجرە و نەریتی هەرکامیان و پاشان کورد بوون و زیرەکیان یارمەتیدەریان بووبێت لەو کارەدا، بەڵام هەزاران بەڵکو ملیۆنەها مرۆڤی دیکە هەن کە تا هەنوکەش بەو رۆشنبیریە گۆش دەکرێن و لە حوجرە و قوتابخانە نەریتیەکاندا خەریکی خویندنن و دەق و کتێبە پەڕە زەردەکان ئەزبەر دەکەن و لەوانەیە خاوەنی زیرەکیش بن بەڵام وەك ئەوان نابنە (عاریف) و (فەقیه) و (فەیلەسوف)، وەك ئەوان نابنە نوورسی و موفتیزادە و سوبحانی، ئەگەر پیرە فەیلەسوفی ناوداری ئێرانی (داریۆش شایگان) لە کتێبەکەیدا (ئاسیا لە نێوان رۆژهەڵات و رۆژئاوادا) هەرکام لە (ماوتسی تونگ و گاندی) بە نوێنەری شارستانیەتی رۆژهەڵات بزانێت، لە بەرامبەر رۆژئاوادا دایان بنێت(١)، بە بۆچوونی من ئەگەر نوورسی و سوبحانی و موفتیزادەی بکردایەتە نوێنەر ئەوا باشتر مەرامەکانی دەپێکا، بەڵام (کوردبوون) دووبارە لێرەش رێگرە کە ئەو کەسانە لە سەردەمی نوێدا بناسرێن، بەڵام پێش ئەوەی هەرکام لەوان بە تایبەتمەندی خۆیەوە بناسێنین، پێویستە لەم پێشەکیەدا تایبەتمەندیەکانی سەردەمی پێش مۆدێرنە باس بکەین، بەمەش رەهەندەکانی فیکری هەرکامیان زیاتر روون دەبێتەوە!

ئەگەر لە بابەتێکی دیکەدا باس لە ماهیەت و چیەتی سەردەمی نوێ کراوە ئەوا لێرەدا باس لە چیەتی سەردەمی پێشتر دەکەین و دیارترین تایبەتمەندیەکانی ئەو سەردەمە (ئەگەر چی تایبەتمەندیەکانی زۆرن) دەکەینە دەستکەلامان، بۆ ئەمەش هەندێك لەو تایبەتمەندیانەی کە هەندێك لە نووسەران کە بۆ ئەو سەردەمە دیاریان کردووە دەهێنن، لەوانە تایبەتمەندی (راز) و ئەفسون بوونی ئەو جیهانە (mystified) کە لە لایەن (ماکس ڤیبەر)ەوە کراوەتەوە تەعلیلی ناسینی ئەو سەردەمە و لەوێشەوە (حەیران) بوونی مرۆڤەکانی ئەو سەردەمە و پاشتر (فراوانی) ئەو جیهانە لای (عەبدولکەریم سروش) و خەسڵەتی کەشفکاری مرۆڤەکانی لای شەبستەری و پاشان زیندوویەتی (الحی) ئەو جیهانە لە بەرامبەر (مردن و چشتانی) بوونی سەردەمی نوێ کە لە لایەن زۆرێك لە فەیلەسوفەکانەوە باس کراوە و بە گواستنەوەیەك لە فەلسەفە و سۆسیۆلۆژیاوە بۆ ئێرە کە خۆمان پێی هەڵساوین لێرە ئەو جیهانە دەناسێنین ئیتر خەسڵەتەکانی:

١- راز ئامێز بوون.

٢- فراوانی.

٣- کەشفکاری مرۆڤەکانی.
٤- زیندوویەتی.

ئەو خەسڵەتانەن زۆر بە کورتی باسیان لێوە دەکەین جیهانی (نوورسی و موفتیزادە و سوبحانی)یان پێدەناسێنین و دواتر بە جوێ لە هەرکامیشیان دەنووسین.

## ١- جیهانی پێش مۆدێرنە سەرزەوی راز ئامێزی ئەفسوناوی:

راز ئامێز بوون (MYSTIFIED)، ئەفسون ئەو کلیلەیە کە سۆسیۆلۆجێستی بەناوبانگ (ماکس فیبەر) پێی سەردەمی پێش مۆدێرنە لە سەردەمی نوێ جیادەکاتەوە(٢)،"بە بۆچوونی من (ڤیبەر) باشی بۆی چووە و (راز) ئەو شفرەیەیە بەهۆیەوە رەمزەکانی دەروازەکانی چوون بۆ ئەو جیهانەمان بۆ دەکەنەوە، بەڵام بە مەرجێك نەکرێتە حوکمێکی ئەخلاقی و بەراوردی ئەخلاقیانەی ئەقڵانیەتی سەردەمی نوێی پێبکرێت، بەو مانایەی کە سەردەمی نوێ سەردەمی (عەقڵ) و (زانست) و پێشکەوتنە سەردەمی پێش مۆدێرنەش سەردەمی خورافە و سیحر و نهێنی ئەفسون و دواتر سەردەمی دواکەوتنە، کە ئەمە رای زۆرێك لە رۆشنبیران و مۆدیلی باوی رۆشنبیری کوردیشە، کە مامەڵەیەکی نازانستیانە و لە بنەڕەتدا تێنەگەیشتنە لە میتۆدی زانایەکی وەك (ڤیبەر)یش، من لێرەدا بێ ئەوەی بە درێژی باس لە میتۆدی کەسێکی وەك ڤیبەر بکەم و بێ ئەوەش چاك یان چاکتر بوونی ئەخلاقی هەرکام لە سەردەمی کۆن و نوێش پیشان بدەم هەوڵدەدەم مەبەست لە (راز) ئامێز بوونی ئەو جیهانە و نهێنیەکەی پیشان بدەم بەمەش دەرگایەکی گەورەمان لەو جیهانە و ناسینی کەسەکانی بۆ دەردەکەوێت و وەك ئەوەی لە ناسینی کەسێکی وەك (نالی)دا لە (قوڵاییەکانی نالی)دا لە شوێنێکی دیکەدا کردمان.

دیوی نەبینراوی شتەکانی پێشتر و حیکمەتە نەزانراوەکانی بوونیان زۆر فراوانتر و زێترن لە بوون و حیکمەتی بینراویان، ئیتر هەمیشە مرۆڤی ئەو سەردەمە وای بینیوە دیوە نەبینراوەکەی بوونی هەر شتێك زۆر فراوانتر و بگرە ئەصلی بوونیەتی کە لە چاو ئەودا بوونی دەرەکی وەك نەبوو وایە، واتە دیوە نەبینراو و نەزانراوەکە حەقیقەتی بوونیەتی و دیوە بینراوەکە حەقیقەتی لاوەکی بەڵکو زۆرجار سەرتێکدەری بینەرە وەك ئەوەی مەولانا دەفەرموێت:

گر به ظاهر آن پری پنهان بود
آدمی از پریان پنهانتر بود(٣)

(ئەگەر لە رووکەشدا فریشتە شاراوەیە، ئەوا مرۆڤ لە فریشتە شاراوەترە)

هەروەها شاعیر دەڵێت:

هەرچەندە کەو ئینسانە لەبەرچاوی من و تۆ
مومکین نیە ئەم لوتفە لە ئینسان و بەشەردا(٤)

کەواتە ئەم مرۆڤە مرۆڤی بینراو نیە، شیمانەی ئەوە نیە ئەو هەموو وردەکاریە لە مرۆڤێکی سروشتی و بینراودا ببێت، ئەمە تەنها بۆ مرۆڤ وانیە لەو سەردەمەدا بەڵکو هەموو شتەکانی دیکەش هەروەها بوون، کە ئەصڵ لە بوونیان بوونی شاراوەیان و حیکمەتە زەبەندە نەبینراوەکانیان زۆر زۆرتر لە حیکمەتە زانراوەکانیانە، ئیتر هەمیشە نهێنی لەو بوونە نەزانراو و رازێك بەڵکو گەلێك رازی حیکمەتی نەزانراو و دیوی نەبینراوی بووندا هەن کە مرۆڤ نایزانێت.. ئیدی رازەکان زۆر و زۆرتر کە لە چاویاندا بوونی لەبەرچاو وەك نەبوو وایە، ئیتر ئەوێ سەرزەوی رازەکان و نهێنی و حیکمەتە نەزانراوەکانە کە مرۆڤ گەشتی کەشفکردنیانی دەست پێکردووە، ئەمەش هەرگیز مانای خورافە بوون و نازانستی بوونی ئەو سەردەمە نیە.

**٢- فراوانی جیهانی پێش مۆدێرنە.**

یەکێك لە بیریارەکانی سەردەمی نوێ بە سەردەمی سیکۆلاریزم (العلمانیة) سیکۆلاریزمیش بە کورتکەرەوەی بواری درێژی مرۆڤ دەزانێت(٥)، مێژووی مرۆڤ لە سەردەمی پێش مۆدێرنەدا تەنها لە دایك بوونیەوە دەست پێناکات و بە مردنیشی کۆتایی نایەت، بەڵکو ئەو پێش لەدایك بوونی هەزاران ساڵ لە سنووری نەبوونەوە تاگەشتۆتە هەرێمی بوون و دوای مەرگیش لە جیهانی بەرزەخ و پاش مەرگدا هەزاران ساڵ تا قیامەت بەرێوەیە و (مەولەوی تاوگۆزی) گوتەنی رێی دووری مەحشەر تەی دەکات، حافیز وتی:

از سرحد عدم تا به اقلیم وجود این همه راه آمده‌ایم(٦)

(لە سنوری نەبوونەوە تا هەرێمی بوون ئەو هەموو رێگەیەمان بریوە)

ئیتر مرۆڤ لە سەردەمی پێشتردا زۆرتر دەژی ژیانیش بەردەوامە و ژیانی فراوانترە، لە لایەکی دیکەوە جیهانی پێش مۆدێرنە تەنیا لە شتە ماددی و بینراوەکاندا کورت نابێتەوە، بەڵکو بوون تەنیا لە گەردووندا قەتیس نابێت، ئیتر ئەو

شتانەی لەو جیهانەدا حزوریان هەیە زۆر زۆرترن لە شتەکانی مۆدێرنە، لەوێ سەرزەویەکە بێجگە لە مرۆڤ جیهانەکەیی و مەخلوقاتەکانی سەر زەوی و خۆر و مانگ و ئەستێرەکانی ئاسمان لەوێ خوداو پەری و فریشتە و هەزاران هەزار هەبووی دیکە هەن کە هەبوونی فراوانی بوونیان تەنیوە و هەمیش ئەو بوونەیان فراوانتر کردووە ئیتر ئەو جیهانە لەم جیهانە میکانیکیەی ئەمڕۆ گەلێك فراوانترە!.

لەلایەکی دیکەوە ئەگەر دیوی نەزانراو زیاتر حەقیقەتتر بێت ئەوا هەر بەو دیوە نەزانراوە فراوانە ئەو جیهانە لە دیوە (دەرککراو) و زانراوەکەی ئەمڕۆ زۆر فراوانتر دەبێت، لێرەوە فراوانی، ئەو جیهانە دەرەنجامێکی لۆجیکی رازئامێز بوونی ئەو جیهانەیە، واتە ئەم خەسڵەتە (فراوانی جیهانی کۆن) لە خەسڵەتی یەکەمەوە دێت (کە راز ئامێز بوونی ئەو جیهانەیە) ئەوەی کە دەرەنجامی نهێنی و حیکمەتە زۆر و نەزانراوەکانی ئەو جیهانەیە.

هەر لێرەوە جیهانی هەرکام لە سەعید نوورسی و موفتیزادە و سوبحانی زۆر فراوانە و تارادەی ئەوەی لای ئەوان جیهانی بینراو بە حاڵ بوونی هەیە و ئەمەش لە پەیامەکانی نوورسی و شیعر و کاسێتەکانی (ئیسرا و میعراج) و (دین و ئینسان) و هەموو نووسین و نەواری تەفسیر و بەتایبەت نامەکەی سوبحانی بۆ پێغەمبەراندا دەردەکەوێت (دواتر زیاتر لە سەری دەڕۆین).

### ٣-خەسڵەتی کەشفکاری مرۆڤی سەردەمی کۆن:

دەووترێت فەلسەفە لە سەردەمی پێش مۆدێرنەدا کەشفی ماهیەتی هەبوو و جێگیری شتەکانی دەکرد لە کاتێکدا لە سەردەمی نوێدا لە بری ئەوەی کەشفی حەقیقەتی شتەکان بکات خەریکی گۆڕینی شتەکانە، فەلسەفە لەو سەردەمەدا بوونی رازئامێزی و نهێنی شتەکانی دەخستە روو ئەو بوونەی پڕ لە حیکمەتی نەدیتراو و ئەفسون بوو، زۆرتری شاراوە و کەمتری لەبەرچاو بوو، ئیدی مرۆڤ لەو سەردەمەدا هەمیشە بەرامبەر بەو رازە نەزانراو و نهێنیانە کە کەمترین شتی لێدەزانین (مەدهۆش)، (حەیران) دەبوو هەر بۆیە (حەیران) بوون لە دیارترین خەسڵەتەکانی مرۆڤی ئەو سەردەمەیە، کە ئەو هەرگیز حەقیقەتی فراوانی بوونی بۆ دەرنەکەوتووە، بەردەوام توخمێکی نهێنی لە نێواندا بووە و ئەونهێنیە پەردەی عیشقی بە رووی خۆیدا راکێشاوە، چونکە عاشیق بوون تەنها ئەو دەمە دروست

دەبێت کە هەموو شتەکان دەرنەکەون ئەفسونەکان پوچەڵ نەبنەوە، هەموو پەردەکان هەڵنەدرێنەوە مەولانا گوتەنی:

پەردەیەك لە نێوان من و تۆدا هەیە

ئەگەر نەمێنێت نەمن دەمێنم و نەتۆ(٦)

مرۆڤی ئەو دەمە عاشیق بوو، عاشیق بە رەگەزی بەرامبەر عاشیق بە سروشت، چونکە هەموو نهێنیەکانی رەگەزی بەرامبەر وسروشتی نەدەزانی هەموو نهێنیەکانی کەشف نەکردبوو، عاشیقانەش هەوڵی ئەو کەشفکردنەی دەدا، ئەو بەردەوام کەشفکارێك.. عاشیقێك بوو، بەڵام مرۆڤی سەردەمی نوێ هێندەی باسی عیشق دەکات هێندە عاشیق نیە چونکە رازەکان نەماون نهێنیەکان نمایان بوون، مرۆڤ لەم سەردەمەدا تا هەناوی سروشت رۆشتووە چیش هەیە لە رەگەزی بەرامبەردا نەیزانێت!.

هەر بۆیە دەبینین نوورسی عاشقێکی کەشفکارە عاشیق بە هەموو بوون چونکە هەرکام لە شتەکان با وردترین شتیش بن پێشانگای پیشاندانی ناوێك لە ناوەکانی پەروەردگارن و بەڵکو هەرکام لەو شتە مۆرێکی خودایی پێوەیە و کورتکراوەی هەموو بوونن، یەکێك لە زەقترین زیکرەکانی سەعید نوورسی زیکری (فیکر)بووە کە دەتوانین بڵێین لە هەموو عاریفەکانی دونیا زێتر ئەو زیکرەی پارێزگاری لێکردووە و قوتابیەکانی فێر کردووە کە چۆن (فیکر) بکەنەوە و عاشیقانە هەوڵی کەشفکردنی نهێنیەکانی بدەن(٧)، تەنانەت لە گەشتەکانیدا گوڵ و گەڵا و میوەکانی پیشان دەدان و ناسك ناسك دەیگرتن وەك باڵی پەپوولە بگریت هەتا نەوەرێت بۆ ئەوەی یارمەتی بیرکردنەوەیان بدات ئەو و هاورێی ژوورە دارینەکەی سەر داری نزیك ئەو خانووەی سەردەمی نەفیکردنی خۆی تێدا بەسەر دەبرد و نیشانەی مامەڵەی عاشیقانە و هاورێیانەی ئەو پیاوە لە تەك ئەستێرە و ئاسمان و درەخت و گیاندارانە و هەر لەو خانووەدا لەگەڵ شارەمێرووڵەیەك دراوسێیەتی کردووە و لەو خواردنە کەمەی کە بۆی هاتووە بەشیداون (کاسەی دراوسێیەتی لەتەکدا گۆڕیونەتەوە)(٨).

هەروەها ژیانی پڕ لە رازی سادەیی موفتیزادە و سوبحانیش داستانی عاشیق بوون و هاورێیەتی ئەو دوو پیاوە لەگەڵ بووندا دەگێڕێتەوە، ئەو نهێنیانەی کە هاورێکانی هەردووجار زیندانی موفتیزادە کە سەردەمی شا و کۆماری ئیسلامیشدا لێیدەگێڕنەوە کەشفی ئەو هاورێیەتیەیە، هەروەها ئەو تاسە قووڵەی بۆ هەژاران

هەبووە خۆی شانازی بەوە کردووە بە دەربڕینی خۆی کە فەقێیەکی بچکۆلەی نێو هەژارەکانی کوردستان بووە(٩)، ئەو میوانەی نەخواردووە کە ئەوان پێیان نەکرڕا بێت، شێوازی جلوبەرگی وەك هەژارەکان بووە، ئەو گەشتە فراوانە و هاتووچۆیانەی لە نێوان جیهانی (زەین) و جیهانی (دڵ)دا ئەنجامی داون و هەروەها ئەو شیعرانەی نەك هەر غەریبی هاوڕێکانی بەڵکو غەریبی سروشتی کوردستانیشی پێدەربڕیون، تارادەیەك دەتوانرێت بوترێت لە دوای (گۆران)ی شاعیر هیچ شاعیرێکی کورد هێندەی (موفتیزادە) سروشت لای ئەو حزوری نیە و تەنانەت شتە سروشتیەکان ئامرازی دەربڕینی بابەتەکانی دیکە و تەنانەت بابەتە زۆر ڕۆحیەکانیش بوون{١٠}، پاشان سوبحانی و هەستی ناسك و خۆشەویستی بۆ گوڵی جوان و دیمەنە سروشتیەکان، خەتی جوان و دەنگی خۆش و بەخشینی زۆربەی خۆراکی زیندانی بە پیرەژنێکی زیندانی لە تەکیدا و سەرسوڕمانی لە بەرامبەر گۆڕانە سروشتیەکان (بۆ نمونە زۆر جوان ئەم بابەتە لە تەفسیری سورەتی (النحل)دا تەواو دیارە) لەگەڵ هەموو گۆڕانێکی سروشتیدا زیکر کردنێك و تەنانەت بە (واجب) زانینی زیکری بەیانی و ئێوارە و کردنەوەی دەروازەی باڵکۆنی ماڵەکەی لەوکاتەدا و سەیرکردنی سروشت و هەموو ڕۆژێك دووبارەکردنەوەی ئەم کارە ئەگەر خەریکی ئەنجامدانی گرنگترین کاریش بووبێت{١١}، و هەست ناسکی و نەرمی و گوتار و مامەڵە کردنی سووك، مانا وەرگرتنی قووڵی لە شیعری شاعیر و عاریفە گەورەکان و دەرکەوتنی هەستی قووڵی مرۆیی لە نووسینەکانیدا نەك هەر دەلیلی بەهێزی خەیاڵی سوبحانی دەکەن بەڵکو چیرۆکی ئەزموونی ڕۆحی مامەڵەی هاوڕێیانەی ئەو لەتەك بووندا دەگێڕنەوە.

**٤-زیندوویەتی بوون.**

لێرەوە هەرکام لەوان تەنیا تەماشاچیەکی نەبوون بەڵکو هاوڕێی بوون و خۆشەویستیان لەتەکدا گۆڕیوەتەوە، ئیتر سروشت تەنیا مادە و مردوو نەبووە لای ئەوان بەڵکو زیندوو وەك مرۆڤ شایستەی هاوڕێیەتی بووە لە هەموو کاتێکدا، هاوڕێیەکی بێ ئازار.

بوون لای هەموو مرۆڤێکی پێش سەردەمی مۆدێرنە هەر وابووە ئەی پێغەمبەر نافەرمووێت (ئوحود کێوێکە ئێمەی خۆشدەوێت و ئێمەش ئەومان خۆشدەوێت).

هەربۆیە نوورسی گلەیی لە مرۆڤناسی سەردەمی نوێ دەکات، دەڵێت مامەڵەی ماددی سەردەمی نوێ لەتەك مرۆڤدا نیە وەك مرۆڤ، بەڵکو زانست لە سەردەمی نوێدا

بۆ ئەوەی مرۆڤ بناسێت مرۆڤ دەکوژێت و دەیکاتەوە بە ماددە، تا ئەو ماددانە بباتە تاقیگە؛ بێ ئەوەی بزانێت ئەو لەباتی لێکۆڵینەوە لە مرۆڤی زیندوو لێکۆڵینەوەی لە ماددەکانی مرۆڤ کردووە، بۆیە جیهانی نوورسی جیهانێکی زیندووە هیچ شتێکی مردوو لە نووسینەکانیدا بوونیان نیە، تەنانەت شتە مردووەکانیش زیندوون و بە گوتەی خۆی (بە زمانی حاڵ) کە ئەم زاراوەیە زۆرترین ئامادە بوونی لە پەیامەکانی نووردا هەیە!

تەنانەت ئەو وێکچواندنەی سەبارەت بە پەیوەندی خۆی بە پەیامەکانی نوورەوە دەهێنێتەوە خۆی بە مێوێك دەچوێنێت کە دارێکی هەژار و رەقە، بەڵام ئەو مێوە رەق و وشکە ترێی تەڕوئاودار بەرهەم دەهێنێت، هەر ئەم مامەڵە زیندوانەی نوورسیە ئەوی کردۆتە هاوشانی شاعیرە گەورەکانی وەك (دانتی و [illegible] (ماجید سامی) گەورە شاعیری تورك وادەڵێت{١٢}.

ئەم زیندوویەتیەی بوون لای موفتیزادەو سوبحانیش هەروایە..سەدان بگرە هەزاران نموونەت لای هەردووکیان بۆی دەست دەکەوێت، ئەو قسە کردنەی موفتیزادە لەگەڵ سروشت و شاخ و دەشتی کوردستانی دەکات و ئەو هەموو نموونانەی بە داری بەردار و بێ بەر بەردتێگرتنی لق راکێشانی (لەسەر کێشی قژ راکێشان) لای موفتیزادە و تەنها ئەو نامە قووڵەی کە سوبحانی بەناوی سەرزەوی رووداوەکان (أرض البلایا) کە مەبەستی هەڵەبجەیە بۆ پێغەمبەرانی دەنێرێت نیشانەی زیندوویەتی رۆحی بریندارى هەڵەبجە و هەموو بوونە لای سوبحانی..ئەم خەسڵەتەشیان لە قورئانەوە وەرگرتووە کە مامەڵەی ئەو کتێبە پیرۆزە لەتەك سروشتدا مامەڵە کردنە لەگەڵ مەخلوقێکی زیندوودا ﴿والصبح اذا تنفس﴾{١٣}، (بەیانی کاتێك کە هەناسە دەدات)، ئەم روانینەش لای هەموو مرۆڤێکی پێش سەردەمی نوێ هەر وایە و هەر مرۆڤێکی سەردەمی نوێ کە تێڕوانینی رەق و تەقی مردووانەی بۆ سروشت هەیە لەو مامەڵە رۆحیە تێناگات!.

### ٥- بوێری مرۆڤی پێش مۆدێرن:

وەك (مەك ئەنتایر) گەورە فەیلەسوفی فەلسەفەی ئەخلاق باس لە نۆرمی ئەخلاقی پێش مۆدێرنە دەکات و بە ئەخلاقیاتی پاڵەوان ناوی دەبات ئیتر ئەگەر فەزیلەتەکان لە هەر نۆرمێکەوە بۆ نۆرمێکی دیکە جیاوازبن، ئەوا ئازایەتی و بوێری یەکێك بەڵکو دیارترین فەزیلەتی نۆرمی ئەخلاقیاتی پاڵەوانە، ئیدی ئەو فەزیلەتە زۆر

بە توندی هەم لای نوورسی و موفتیزادە و سوبحانیش بوونی هەیە، ڕووبەڕووبوونەوەی هەرکامیان لەگەڵ ڕژێمی ستەمکاردا و بەکارهێنانی توندترین سزا و هەوڵی لەناوبردن ئەگەر چی هەموو کاتێك هەلی ژیانی خۆشگوزەران لەبەردەم هەرکامیاندا هەبووە، بەڵام بوێری و خۆگری هەرکام لەوان لەبەردەم دژوارترین ڕووبەڕووبوونەوەدا و بەردەوامی هەرکامیان لەسەر هەڵوێستەکانیان وێڕای سەختی بەرگریکردن نیشانەی بوێری هەرکامیانە و مانای بوونی ئەو فەزیلەتەیە لایان.

بۆ ئەمە ژیانی دژوار و نزیکەی نیوسەدە نەفیکردن و دادگایی کردنی نوورسی و زیاد لە حەڤدەجار دەرمانخوارد کردنی و سەختی سزاکانی سوبحانی و بوونی هەموو هەلێك بۆی ئەگەر تەنها لە (یەکێك) لە وتەکانی پەشیمان بێتەوە بڵێت: ئەی ئەگەر من ڕازی بووم و پاشان چوومە دەرەوە و ئۆتۆمبیلێك لەسەر شەقام لێیدام وەڵامم بۆ خودا چی دەبێت{١٤}.

داستانی بوێری موفتیزادە بەرامبەر بە دەسەڵات و ڕەخنەگرتنی لە دەستوری ئێران و وتاری هۆڵی وەزارەتی ئیرشادی بە دەسەڵات، کە بڵێیت: دەستتان بشکێت بۆ خۆتان و دەستورێك کە نووسیوتانە، تەنانەت وتاری بەناوبانگی (نگڵ)ی کە بەرامبەر توێژێکی باڵادەست لە کۆمەڵگەدا و هەروەها چیرۆکی سزا و زیندانی (ئینفیرادی) و نەخۆش و مەرگی تراژیدی ئەو پیاوە نیشانەی بلیمەتیەتی.

ئیدی ئەم پێنج تایبەتمەندیەی پێشتر باسمان لێوەکرد، (سەعید نوورسی)یش پێش سەدەیەك لە ئێستا ئەو دەمەی بەرگری لە خۆی دەکات و لە شێتخانە تۆمەتی شێتی لە خۆی دووردەخاتەوە و بە پزیشکەکان دەسەلمێنێت ئەو نەك هەر شێت نیە بەڵکو یەکێك لە مرۆڤە زۆر بلیمەتەکانە، ئیدی باسی لەو پێنج خەسڵەتە دەکات کە زیرەکی و نامۆیی و بوێری و متمانە و سادەیی بەو بەخشیوە ئەوانە خەسڵەتی هەموو (کورد)ێکن کە لە دەرەوەی پایتەخت و شارە مەدەنیەکان دەژین واتە خەسڵەتی مرۆڤەکانی پێش مۆدێرنەن.

دوای ئەوەی باسی پێنج خەسڵەتی ناسێنەری سەردەمی پێش مۆدێرنەمان کرد خەسڵەتی هەموو مرۆڤێکی نۆرماڵی پێش ئەم سەردەمە بوون پێم باشە هەر لەم پێشەکیەدا لە ناو ئەو هەڵکەوتوانی مرۆڤانەدا باسی تایبەتمەندیە هاوبەشەکانی نێوان نوورسی و موفتیزادە و سوبحانی بکەم دوواتر لە بەشی تایبەت بە هەرکامیان تایبەتمەندیەکانی هەرکامیان بووروژێنم.

## جیهانی هاوبەشی

### (نوورسی، موفتی زادە، سوبحانی)

**١-کوردبوون لە سەردەمی مۆدێرنەدا:**

پێشتر ئاماژەم بەوەدا کە هەرکام لە نوورسی و موفتیزادە و سوبحانی، دووایین عاریف و فەیلەسوف و فەقیهن، هەرسێکیشیان کوردن بەڵام پرسیارەکە لەوەدایە بۆچی دەبێت دواین عاریف و فەقیە و فەیلەسوف کورد بن؟ ئایا کوردستان تا هەنووکەش سەرزەوی دەرکەوتنی مرۆڤەکانی پێش مۆدێرنەیە، ئایا ئەمە تەنها رێکەوتنێکە یاخود تایبەتمەندیەك لەو کارەدا هەیە؟ و تا هەنووکەش کوردستان سەرزەوی پێگەیاندنی مرۆڤەکانی پێش مۆدێرنە و هێشتا کورد لە دەرەوەی مێژووی نوێدایە و بەهۆی نەبوونی دەوڵەتی نەتەوەوە شوناسی هاتنە نێو جیهانی نوێی بۆ نیە و ئیتر لە دەرەوەی ئەو جیهانەدایە، هەموو مرۆڤەکانی ئەو سەردەمە مرۆڤی پێش مۆدێرنەن بە گوتەی ئەو رۆژهەڵاتناسەی کە دەڵێت: کوردەکان هەموو شاعیرن، ئیدی کوردەکان دوایین نەتەوەن کە پێدەنێنە سەردەمی نوێوە وەک نووسەری ناوداری ئەمریکایی (فۆکۆیاما) دەڵێت؟!.

تۆ بڵێیت هەر لەبەر ئەمەش بێت کە دووایین عاریف و فەیلەسوفی میتافیزیك و فەقیە کورد بن، لە راستیدا ئەوە بابەتێکە تا رادەیەکی باش باوەڕم پێیەتی، ئیدی نوورسی و موفتیزادە و سوبحانی کوردن و بەشی تاکە کەسی هەرکام لەوانیش لە لێهاتوویی لەوەدایە کە هەرکام لەوان دوای چوونە نێو بابەتەکانی سەردەمی نوێوە تواناکانی پێش مۆدێرنەیان بۆ چارەسەرکردن و پڕکردنەوەی نەتوانینەکانی سەردەمی نوێ بەکارهێناوە واتە هەم تواناکانی پێش مۆدێرنەیان دۆزیەوە و نەقسەکانی مۆدێرنەشیان بینی و هەوڵیاندا بەو توانایانە ئەو نەقسانە پڕبکەنەوە، واتە نوورسی لە رێی عیرفان و سوبحانیش بە توانا فیقهیەکان و موفتیزادەش بە

هاتوچۆی نێوان (زەین) و (دڵ) واتە چرکە فەلسەفیەکان لەگەڵ چرکە ڕۆحیەکان و تەوزیفکردنی فەلسەفەی کۆن!.

**٢- خوێندنی نەریتی و لە حوجرە و دوور لە ئەکادیمیادا:**

(نوورسی و موفتیزادە و سوبحانی) پێگەیشتووی حوجرە و خوێندنی نەریتین و دوور لە پەروەردە و پرۆسەی ئەکادیمیا بوون ڕۆحی عاشیقانە و خوێندنی دارستاناتەی پێش مۆدێرنە لە بەرامبەر پرۆسەی پێشتر ئامادەکراوی باخچەییانەی سەردەمی مۆدێرنە، پێگەیشتوون، سەختی و گرانی ئەو جۆرە خوێندنە بۆ کەسی جیددی بەهەند گرتنی تەواو وەرگرتن و لەبەر کردنی مەتنەکان و تێکەڵبوونی بە لۆژیك و فەلسەفە و زانستی ئەخلاق و ئەدەبیاتی کۆن وادەکات قوتابی ئەو جۆرە خوێندنە تینوو بێت بە مەعریفە، بەمەش ئاسانتر لە بابەتە نوێکان بگات ئیدی هەرکام لەوان دوور لە خوێندنی نوێ بە تەواوەتی شارەزای زانستە پێشترەکان و کولتووری پێشتر بوون دواتر کاتێك بابەتە نوێکانیان بینیوە واتە ئەو فەرهەنگەیان بینیوە جیاواز لە ڕۆشنبیری ئەوان هەر بەو قووڵیە لێی چوونەتە پێشەوە و تینوبوون پێی، هەر بۆیە نوورسی لە ماوەیەکی زۆر کەمدا زیاتر لە دەقی (٩٠٠) کتێب لەبەردەکات و موفتیزادەش تا ئاستی مامۆستایەتی زانکۆ لە زانکۆی سنە و تاران وانە دەڵێتەوە و سوبحانیش تا ڕادەیەکی باش لە زانستە ئەزموونیەکان و قوتابخانە فیکریەکان بە قووڵی دەخوێنێتەوە و ڕەخنە قووڵەکانی هەرکام لە موفتیزادە و سوبحانی لە دەستووری ئێرانی مایەی تێڕامانی مرۆڤن و ناشێت مرۆڤێك ڕۆشنبیریەکی قووڵی یاسایی نەبێت بتوانێت بەو شێوەیە ڕەخنە بگرێت، ئەم جۆرە خوێندنەش وایکردووە هەم هەرکام لەوان لە تواناکانی کولتوور بە تایبەت (ئایین) (مەزنترین بەشی کەلتوور) باش بزانن هەم بە خوێندنەوەی سەردەمی نوێش باش سەردەمی نوێ بناسن و باش لە ئەگەرەکانی گۆڕان لە سەردەمی نوێدا بگەن، تۆ سەیری سەعید نوورسی بکە وێڕای بوونی زیاتر لە پەنجا هەزار قوتابی گوێڕایەڵ، بەڵام هەرگیز شۆڕشی چەکدارانە دەست پێ ناکات{١٦}، و سوبحانیش سەرەڕای ئەوەی هەموو چواردەوری ئەو پڕە لە چەکداری پارتە کوردیە ئێرانیەکان و سوپای ڕژێمی ئێرانی و گوێڕایەڵی خەڵکی دەڤەری پاوە و هەورامان بۆ ئەو و هاوڕێکانی کەچی بێجگە لە خۆپیشاندان و خەباتی مەدەنی شتێکی دیکە ئەنجام نادات{١٧}، و موفتیزادەش دوای بێ ئەنجام بوونی هەوڵە سیاسیەکانی بێجگە لە کۆچکردن بۆ

کرماشان هیچ کارێکی دیکە دەست پێناکات{١٨}، ئەمەش نیشانەی تێگەیشتنی قووڵی هەرکامیان ناسینی سەردەمی نوێ و سیاسەتی زۆری هەبووە لەلایەن هەرکامیانەوە، بە بڕوای من تا ئێستەش سیاسیەکانی کورد ئەو تێگەیشتنە قووڵەیان نیە !.

ئەگەر بڕیار بێت بۆ ئەوەی ماسی لەئاو تێبگات (وەك مەولانا دەڵێت) دەبێت بڕواتە دەرەوەی ئاوەوە ئەوا بۆ ئەوەی مرۆڤ لە سەردەمی مۆدێرنەش تێبگات دەبێت یان بڕواتە دەرەوەی مۆدێرنەوە یاخود لە دەرەوەی مۆدێرنەوە بۆ مۆدێرنە بێت هەر ئەمەش وایکردووە نوورسی و موفتیزادە و سوبحانیش کە لەبەر ئەوەی لە سەردەمی مۆدێرنەدا ژیاون و هەم لە دەرەوەی مۆدێرنەوە بۆ مۆدێرنە هاتوون، کەواتە دەرەوەی مۆدێرنەیان دیوە و هەم بەخۆرۆشنبیر کردنیان لە سەردەمی مۆدێرنەدا لە مۆدێرنەش چوونەتە دەرەوە، ئەمەش پێچەوانەی ڕەوتی هەموو ڕۆشنبیرە ئاینیەکانی دیکەیە کە ڕۆشنبیرە ئاینیەکانی دیکە وەك (د.سروش) لە ڕۆشنبیری نەریتیەوە بۆ ڕۆشنبیری مۆدرێن بزواون، هەر بۆیە قۆناغەکانی خوێندن و ڕۆشنبیری هەرکام لە نوورسی و موفتیزادە و سوبحانی سێ قۆناغن:

قۆناغی یەکەم: بریتیە لە قۆناغی خوێندنی حوجرە و تا ئیجازە وەرگرتنیان و بوون بە مەلایەکی ناودار و تەنانەت (فەتوا)دانیش.

قۆناغی دووەم: خۆ ڕۆشنبیر کردن بە ڕۆشنبیری نوێ و کەیل بوون لە زانستە نوێکاندا ئیدی لەم قۆناغەدا هەرکامیان زانستی پێشینەکان و زانستی پاشینەکانیش واتە زانستە نوێکان، ئیدی (علم الأولين والآخرين) کۆدەکەنەوە و سەعید نوورسی دەبێتە بێ وێنەی سەردەمی خۆی (بديع الزمان) و موفتیزادە دەبێتە مامۆستای زانکۆ و ڕۆشنبیری فراوانی ئەو خوێندەوارانی سەردەمی خۆی دەهێنێتە سەرسوڕمان و سوبحانیش هێندە ڕۆشنبیری کۆدەکاتەوە کە جێگەی سەرسوڕمانی سەرکردە ئیسلامیەکانی وڵاتەکانی دیکە و ڕۆشنبیرە ئێرانیەکان و ڕابەر و سەرۆك کۆماری ئێران دەبێت.

قۆناغی سێیەم: ئەو قۆناغەیە کە هەرکامیان بە تەواوەتی بۆ ڕۆشنبیری ئاینی دەگەڕێنەوە...قورئان دەبێتە سەرچاوەی یەکەمی مەعریفەی هەرکامیان ئەم قۆناغە لای نوورسی لە ساڵی (١٩٢٣)وە دەست پێدەکات و تا ساڵی (١٩٦٠) بەردەوام دەبێت و موفتیزادەش بە گوتەی خۆی لە ساڵی (١٣٤٣) هەتاویەوە دەست

پێدەکات و تا کۆتایی ژیانی بەردەوام دەبێت، ئەم قۆناغەش لای سوبحانی دوای نائومێد بوونی لە سەرکردایەتی شۆڕشی ئێرانی و لە کاتی نووسینی کتێبی بەناوبانگی (الولاية والامامة)وە.. ئەو کتێبەی سەرۆك كۆمار و رۆشنبیرە ناودارەکانی ئێران دەیخوێننەوە و سەنای دەکەن تا کۆتایی ژیانی و شەهید کردنی بەردەوام دەبێت.

**٣- زیرەکی بێ وێنەی هەرکامیان:**

ئەگەر بە شێوەیەکی گشتی مرۆڤە خوێنەوارەکانی پێش مۆدێرنە بە حوکمی پشت بەستن بە زیرەکی کەسی خۆیان لە خوێنەواری سەردەمی مۆدێرنە زیرەکتر بن، بەتایبەت بۆ لەبەرکردن و هێشتنەوەی زانیاری لای خۆیان (تۆ سەیری ژیانی کەسایەتیەکی وەك مامۆستا عەبدولکەریمی مودەڕیس) بکە ئەوا لەناو ئەو زیرەکانەدا نوورسی و موفتیزادە و سوبحانی زۆر زیرەکتر بوون، خەڵکی و هاوڕێکانیان زۆرجار تاقیان کردوونەتەوە و شایەتیان بۆ داون.

نوورسی زۆرجار لەلایەن هەموو زانایانی شەرع زانەوە پرسیاری لێکراوە و وەڵامی هەموو پرسیارەکانی داوەتەوە و تەنانەت لە زانستە نوێکانیشدا لەلایەن هەموو خوێندەوارانی ئەستەمبوڵی پایەختی دەوڵەتی عوسمانیەوە پرسیاری لێکراوە کەچی وەڵامی هەموو پرسیارەکانی داوەتەوە و بە (بدیع الزمان) (بێ وێنەی زەمانە) ناوبانگی دەرکردووە و هەر ئەو زیرەکیەشی زۆرجار گرفتی بۆ دروست کردووە و تەنانەت جارێکیش بۆ شێتخانەی راپێچ کردووە{١٩}.

سوبحانیش ئارامگری لەسەر خوێندن و زیرەکی هەر لە منداڵیەوە نیشانەی زیرەکی ئەو بوون، هەر لە خوێندنی سەرەتاییەوە مامۆستاکانی داوا لە باوکی دەکەن کە لەسەر ئەرکی ئەوان بخرێتە بەرخوێندن و تا ئەوەی بۆ زیاد لە سێ مانگ لەسەر کتێبەکانی خەوی پێدا دەکەوێت و مامۆستاکانی شایەتی ئەوەی بۆ دەدەن کە تەنیا شوێنێك شایستەی خوێندنی ئەو بێت زانکۆی ئەزهەرە و قورئانی پیرۆز و زۆربەی زۆری دەقی کتێبەکانی لەبەر بووە و دوای چەند ساڵ نەچوونەوە سەریان هەروەك خۆیان لە زەینیدا وەك خۆیان مانەتەوە و تا ئەو پرسیارانەی لە شێخ عوسمانی نەقشبەندی دەکات و ئەویش دەڵێت من ناتوانم وەڵامی ئەم پرسیارانە بدەمەوە و تا ئەوەی کاتی سەرباز بوونی گوێی لە زانایەك دەبێت وانەی شەرع لەسەر کتێبێك دەڵێتەوە هەڵە دەکات و ئەم بۆ راست دەکاتەوە ئیدی زۆر تکا لەم

دەکات کە وانەی پێ بلێتەوە و تا گفتوگۆکانی لەتەك مەلا و رۆشنبیرانی لایەنە سیاسیە کوردیەکان کە هەرهەموویان دان بە زیرەکی بێ وێنەیدا دەنێن تا ئەوەی رابەری شۆڕشی ئێران خومەینی و تەنانەت موفتیزادەش لێهاتوویی دەنرخێنن ئەم خەسڵەتانە و چەندین خەسڵەتی هاوبەشی دیکەش وەك گفتوگۆ لەگەڵ جیهانی پێغەمبەران و رازاندنەوەی وەك شاکاری نزایی بێ وێنە لەلایەن هەرکامیان و سادەیی لە مامەڵە و جلوبەرگی کوردی: چاکەت و شەڕواڵ لەلایەن کاك ئەحمەد و وەك هەژارەکانی سنە و کوڵەباڵەکەی سوبحانی و مێزەرە کوردیەکەی نوورسی کە هەرکام لەوان ئاماژەی سادەیی و بێفیزی لەگەڵ هەژاران و کوردانە ژیانی هەرکامیان بووە، دەکارێت بە خەسڵەتێکی دیکەی هاوبەشی هەرکامیان بزانرێت.

ئیدی بۆ لەمەودوا هەوڵدەدەین بە جوێ باسی تایبەتمەندی و کایەی کارکردنی هەرکامیان بناسێنین دەبێت روونی بکەینەوە کە ئەم نووسینە دەرەنجامی چاوپێکەوتنێکی (٩) کاتژمێری و بەری (١٥) ساڵ خوێندنەوە و مامەڵە لەگەڵ ئەو سێ کەسایەتیەیە، کە ئەو چاوپێکەوتنە لە لایەن برای رۆشنبیر (کاك ئومێد حەسەن)ەوە لەسەر نوورسی عاریف و سوبحانی فەقیە و موفتیزادەی فەیلەسوف ئەنجام درا کە دەبێت زۆر سوپاسی بکەم و هەوڵە بەردەوامەکانی لەگەڵ ئەم جۆرە پرۆژانەدا دەنرخێنم...

# بەشی یەکەم

## (نوورسی)

## دوایین ئەزموونی عیرفانی لە شارستانیەتی ئیسلامیدا

### ناساندنی سەعید نوورسی:

(سەعید نوورسی) یەکێکە لەو کەسایەتیانەی زۆر بە داخەوە هەتا هەنووکەش نەناسێنراوە و قەدرو گەورەیی نەزانراوە، من بەش بە حالی خۆم لە مێژە لەگەڵ نووسین و کتێبەکانی مامۆستا (نوورسی)دا تێکەڵم و ئەم تێکەڵیەشم دەگەڕێتەوە بۆ قۆناغی سەرەتایی خوێندنم، ئەوکاتەی کە هێشتا لە پۆلی شەشەمی سەرەتایی بووم..لە بیرم دێت کە یەکەم کتێبی سەعید نوورسیم خوێندەوە، پاشان هەرچەندە پچڕان هەبووە لە خوێندنەوەمدا بۆ (پەیامەکانی نوور) بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا بەردەوام چوومەتە خزمەتی ئەو پەیامانە و لەگەڵیاندا ژیاوم، ڕەنگە لەو سەرەتایەوە هەندێك شت بوو بێت خوێندبێتمەوە و دەرکم نەکردبێت، بەڵام ئێستا و دووای گەشە کردن و پێگەیشتنی توانای عەقڵی و فیکریم دەرکی ئەو مانا و مەفهومانە بکەم کە لەوەو پێش خوێندوومەتەوەو باشتر دەرکی قووڵایی ئەو قسانە دەکەم، لێرەوە بە بۆچوونی من (نوورسی) کەسایەتیەکی گەورە و دوواهەمین کەسی هەوڵدەری پێش سەردەمی مۆدێرنەیە، دوایین کەسی شارستانیەتی ئیسلامیە بۆ ئەم سەردەمە ماوەتەوە، لەبەر ئەوە بە بۆچوونی من فەیلەسوفی گەورەی ئێرانی (داریوشی شایگان)، ئەو ئەگەر (ماوتسی تۆنگ) و (گاندی) دەکاتە نوێنەری ڕۆژهەڵات لەبەرامبەر ڕۆژئاواوە، ئەوا من دەڵێم باشتر بوو بۆ فەیلەسوفێکی وەکو ئەو بلیمەتێکی وەکو (نوورسی) نوێنەری ڕۆژهەڵات بێت لای بۆ مامەڵەکردنی لەگەڵ

مۆدێرنەدا، چونکە دوواجار هەریەکە لە (گاندی) یاخود (ماوتسی تۆنگ) بواری کارکردیان زیاتر کورت بووبوویەوە بۆ ناو بوارە سیاسییەکە و لە ململانێ سیاسییەکاندا زیاتر دەرکەوتوون، ئەوا ئەوە نوورسیە تەنانەت لەعنەت لە (سیاسەت) دەکات و لە سیاسەت دوور دەکەوێتەوە بەلام ململانێی خۆی بەردەوام درێژە پێدەدات و بە تەنهایی دەمێنێتەوە! ئەگەر بمەوێت بە کورتی و لەیەك رستەدا پێناسەی نوورسی بکەم، دەتوانم بڵێم نوورسی ژیرێکی سەردەمی پێش مۆدێرنەیە، عاریفێکی سەردەمی پێش مۆدێرنەیە کە لە سەردەمی مۆدێرنەدا بە شێت دانرا و خرایە شێتخانەوە! ئەگەر ئێمە لە شارستانیەتی ئیسلامیدا سێ جۆر لە (دینداری)مان ببێت – کە ئەمە زۆر بیریاری دیکەش باسیان کردووە و لە شوێنی دیکە و نووسینی دیکەشدا ئاماژەم پێکردووە– ئەوانیش دینداری فەیلەسوفانە و دینداری فەقیهانە و دینداری عاریفانەیە، ئەوا بە بۆچوونی من دینداری سەعید نوورسی دینداریەکی عاریفانەیە، هەرچەند زۆرجار خۆی ئەم سیفەتە لەخۆی دووردەخاتەوە، لەبەر ئەوەی ئەو کاتە لە دەوڵەتی تورکیادا سۆفیگەری و دروستکردنی تەریقەت قەدەغە بووە بۆیە رایدەگەیەنێت کە ئەم سەردەمە سەردەمی تەسەوف نیە، ئەم سەردەمە سەردەمی شێخایەتی کردن نیە، تەنانەت ئەگەر عاریف و شێخەکانی سەردەمەکانی پێشتر لەم سەردەمەدا بژیانایە وازیان لە رێگەکەی خۆیان دەهێناو دەهاتنە سەر رێگەکەی ئەم و بە تەعبیری خۆی دەبوونە خزمەتگوزاری قورئان{٢٠}.

### (نوورسی) و ئەزمووونە تایبەتیەکەی:

بێگومان عاریفەکانی پێش سەردەمی مۆدێرنە خەریکی بەر چنینەوەی (ئیمان) بوون، بەری ئیمانیان دەچنیەوە، بەو مانایەی کە باخی ئیمان باخێکی سەر سەوز بوو، تەنانەت ئەمە هەر خودی میتافۆرێکی نوورسی خۆیەتی کە فەرموویەتی ئەگەر ئێمە بە باڵی خەیاڵ یاخود رۆح بە زاراوەی ئەو لەم سەردەمەوە بفرین و بچینەوە بە مێژوودا بگەرێین سەیر دەکەین لە سەردەمی نبووەت و پێغەمبەرایەتی پێغەمبەری خودادا (د.خ) جەزیرەیەك هەیە، جەزیرەیەکی سەر سەوز کە لە هەموو مێژوودا دیارە، کە مرۆڤەکان لەوێ سەرشارن لە موحیبەت، سەرشارن لە (ئیمان)، لێرەوە ئەگەر سەردەمی پێش مۆدێرنە سەردەمێك بووبێت سەردەمی (ئیمان) بووبێت و

باخی ئیمان بەری بوو بێت و هەرکەس بە ئەندازەی خۆی —کە ئێمە لە شوێنی دیکەش باسمان کردووە— بەری ئیمانی چنیبێتەوە، ئەوا نوورسی لە کۆتاییەکانی ئەو سەردەمەدا کە سەردەمی پێش مۆدێرنەیە و لە سەرەتاکانی دەست پێکردنی مۆدێرنەدا لە شارستانیەتی ئیسلامیدا هەستی بەوە کردووە کە ئەگەر چی ئەو دەتوانێت بەری ئیمان بچنێتەوە بەڵام ئەو سەردەمە بەسەر چووە، ئەو باخەی کە دارەکانی پیربوون یاخود بڵێین جەنەڕاڵێك لە رۆژئاواوە هاتووە بەربۆتە درەختەکان و دەیەوێت بیانبڕێتەوە — کە ئەم تەعبیرە لای زۆرێك لە ئەدیبەکان باسکراوە— کە دەوترێت رۆژئاوا لە جەنەڕاڵێك دەکات کە تەورێکی بە دەستەوەیە و هاتووە لە شارستانیەتی رۆژهەڵاتدا باخی مەعنەویەت ببڕێتەوە، بۆیە نوورسی دەرکی بەوە کردووە کە سەردەمی ئەوە نەماوە کە ئەو لەژێر ئەو دارانەدا دابنیشێت و خەریکی بەرچنینەوە بێت، بەڵکو دەبێت وەکو باخەوانێك هەڵبسێت بەرگری لەو باخە بکات، هەر خودی ئیمان و عیشقەکەی وای لێکردووە کە لەبری ئەوەی دانیشێت و لەو درەختانەی کە هێشتا ماون خەریکی بەرچنینەوە بێت، خەریکی لەزەت بردن لە ئیمان و رۆحانیەتی خۆی بێت ئەوا بە پێچەوانەوە خەریکی بەرگریکردن لە بەری درەختەکانی ئیمان بووە، دەرکی بەوە کردووە کە ئیتر سەردەم سەردەمی بەرگریکردنە لە (ئیمان) نەك چنینەوەی بەری ئیمان وەك ئەوەی لای عاریفەکانی پێش ئەم هەبوو، بە بۆچوونی من (نوورسی) دوایین عاریفی شارستانیەتی ئیسلامیە، بەڵام جیاوازی ئەو لەگەڵ عاریفەکانی دیکەدا ئالەو شوێنەدایە کە ئەوان ویستوویانە بەری ئیمان بچننەوە، بەڵام ئەم ئەو ئیمانەی وایلێکردووە کە لە جیاتی ئەوەی بە شوێن کەرامەتدا بگەڕێت..ئەو ئیمانەی والێکردووە کە لە جیاتی ئەوەی بە شوێن شتە گەورەکاندا بگەڕێت کە لە (ئیمان)ەوە دەردەهێنرێت، وتوویەتی نا من دەبێت بەرگری لە ئیمان بکەم، کە ئەم تەعبیرە لە زۆر شوێنی پەیامەکانیدا دووبارە بۆتەوە کە ئەو (بەرگریکار)ە لە ئیمان{٢١}.

## (نوورسی) و پەیوەندی لەگەڵ عاریفەکانی پێش خۆی:

بێگومان سەعید نوورسی زۆر موعجەب بووە بەرامبەر بە عاریفە گەورەکان، کە ئەو قەناعەتی وایە شارستانیەتی ئیسلامی دوو دیوە، دوو رووی هەیە، روویەکی ماددی ئەوەی کە لەبەرچاوە، لەگەڵ روویەکی مەعنەوی، رووە ماددیەکەی کە لە

سەرەتاوە نەپچڕان و سەیر و ڕەو و بەردەوامی تێدا بووە و گەیشتووە تا ئەمڕۆ، فلان سولتان بووە بە خەلیفە و دووای ئەو کەسێکی دیکە هاتووە، فەقیهەکان بە شوێن یەکدا هاتوون، بەلام ئەم شارستانیەتە ڕوویەکی دیکەی نەبینراوی هەیە کە لە پێغەمبەری خوداوە (د.خ) دەست پێدەکات، کە بریتیە لەوەی پێغەمبەری خودا بووە بە (نبی) و ئەزمونی (نبووەت) دەستی پێکردووە، ئەم ئەزموونە (مەعنەوی)یە هاتووە تا ئەمڕۆ. کەواتە شارستانیەتی ئیسلامی دوو ڕووی هەبووە ڕوویەکی ماددی لەگەڵ ڕووە مەعنەویەکەدا{٢٢}، ئەو بەردەوام بووە و ئەمیش بەردەوام بووە، کە کارکردنی سەعید نوورسی زۆرتر کارکردنە لە دیووە نەبینراو و مەعنەویەکەیدا، هەتا ئەو شتە عەقلانیانەش کە لە پەیامەکانی نووردا باسیان دەکات دەشێت بلێین لەناو دیوە مەعنەویەکەدان{٢٣}، وەکو ئەو تەشبیهەی کە (مەولانا) دەیکات، ئەگەر ناوی بنێین تەختەیەکە لەناو دەریایەکدا{٢٤}، واتە خەڵکی وادەزانێت نوورسی کاری عەقلانی کردووە، وەلامی ماددی داوەتەوە، ڕاستە بەلام ئەمە تەنها تەختەیەك بووە لەناو مەعنەویەتێکی گەورەتردا، واتە ئەو لە جیهانی ویلایەتەوە ئەوەی کردووە.

بۆ ئەوەی زۆر دوور نەکەوینەوە لە بابەتەکە، ئەگەر مرۆڤ بەراوردێك بکات لە نێوان (مەسنەوی مەعنەوی)ی مەولانای ڕۆمی لەگەڵ (مەسنەوی نووری)یەکەی مامۆستا نوورسیدا، بێگومان مامۆستا نوورسی بەهۆی سەرسوڕمان و کاریگەربوونی بە کەسایەتی (مەولانای ڕۆمی)یەوە ئەو کتێبەی نووسیوە و ناوی (مەسنەوی) لێناوە، کە ئەوەی (مەولانا) مەسنەوی مەعنەوی بووە، واتە دەرخستنی شتە مەعنەویەکانی عالەمی ڕۆح، شتە مەعنەویەکانی عالەمی عیشق – بە زاراوەی عاریفە کۆنەکان– ئەوەی کە بەچاو نابینرێت، تەنانەت ئەگەر مرۆڤ مەسنەویەکەی (مەولانا) بخوێنێتەوە هەست دەکەیت باس لەوە دەکرێت کە دەکارێت چی لە جیهانی ڕۆحەوە بێتە دەرەوە کە خەڵکی دیکە نایبینن و نایزانن جگە لە عاشیقەکان؟، ئەوا مەولانا لەو کتێبەدا هەمووی هێناوەتە دەرەوە! واتە بەری ئیمان و عیشقی چنیوەتەوە، بەلام لەولاوە ئەگەر سەیری مەسنەوی سەعید نوورسی بکەیت کە بە موعجەب بوونی بەو دایناوە، جارێك ئەو مەسنەوی مەعنەویە، کەشفکردنی شتە مەعنەویەکانە، ئەو مەسنەوی نووریە نووری ئیمان، چۆن بەرگری لەو ئیمانە بکات، ئەگەر ئەوەی مەولانا بە زمانی فارسی پەهلەویە ئەوا ئەم بە زمانی عەرەبی نووسیویەتی، بە کورتی سەیر دەکەیت لە (مەسنەوی نووری) مامۆستا نوورسیدا ڕێگاکانی ئەو عالەمە ڕۆحیەی لەوێدا هەیە بریتیە لە بەرگریکردن لە مەعنەویەت نەك خودی مەعنەویەت و بەرهەمەکانی و دەرەنجامەکانی مەعنەویەت{٢٥}.

## نوورسی لە نێوان سەردەمی کۆن و سەردەمی نوێدا:

### یەکەم:(فراوانی جیهان و زۆری سەرچاوەی مەعریفی نوورسی)

بۆ ئەوەی باشتر لە (مامۆستا نوورسی) تێبگەین بە بۆچوونی من دەبێت وردتر لەم بابەتە بچینە خوارەوە، دەکرێت بزانین جیاوازیەکانی سەردەمی کۆن و سەردەمی نویَ چیە هەتا باشتر لە مامۆستا نوورسی تێبگەین، بە بۆچوونی من کەسی مۆدێرنیزم ناتوانێت لە (سەعید نوورسی) تێبگات ئەگەر چی نووسینەکانی نوورسی زۆر سادەن، بۆ نموونە زۆرترین شتێك لە پەیامەکانی (نوور)دا هاتبێت نموونە هێنانەوەیە (ضرب الأمثال)ە، ئەمەشی لە قورئانەوە وەرگرتووە، بەلاّم لەگەڵ ئەوەشدا زۆرجار لاوەکان بۆم دەگێڕنەوە کە چرکەساتی لەزەت بردنیان هەیە لە پەیامەکان کەچی لێی تێناگەن، یان بلێین بێتاقەت دەبن پێی ناتوانن لەگەڵی بڕۆن، راستە زۆری پەیامەکان (سەدوسی کتێب) رەنگە مرۆڤ والێبکات نەتوانێت لەگەڵیدا بڕوات، وەك ئەوەی رۆمانێك بخوێنێتەوە لە شەو رۆژێکدا تەواوی بکات، بەلاّم کێ حەوسەڵەی ئەوەی هەیە کە ئەوەی لە ماوەی نزیکەی بیست و چوار ساڵدا لە ساڵی (١٩٢٦-١٩٥٠){٢٦} نووسرابێت بخوێنێتەوە، بەلاّم چیرۆکەکە لە شوێنێکی دیکەدایە، بابەتەکە ئەوەیە کە جیهانی مامۆستا نوورسي جیهانێکی فراوانترە لە جیهانی سەردەمی مۆدێرنە، ئەو تایبەتمەندیەی سەردەمی کۆن کە لە (فیبەر)ەوە وەرمانگرت و پێشتریش لای (نالی) باسمان لێکرد، کە سەردەمی پێش مۆدێرنە یەکەم تایبەتمەندی بریتیە لە (رازئامێز بوونی)، دووەم تایبەتمەندی بریتی بوو لە فراوانی ئەو سەردەمە، جیهانێکە فراوانتر لە سەردەمی مۆدێرنەیە، سێیەم تایبەتمەندی ئەوەیە کە ئەو جیهانە جیهانی کەشفە، کەشفکردنی ئەو شتانەی کە نابینرێن بەلاّم حەقیقەتێکی وەستاویان هەیە، حەقیقەتێك لە ئانی گۆڕاندا نیە ئەمەش یەکێکی دیکەیە لەو تایبەتمەندیانەی کە لای مامۆستا نوورسی زۆر بە زەقی دیارە، بریتیە لەوەی ئەو دیوەی بوون کە نابینرێت دیوە فراوانترەکەی بوونە، ئەگەر هەموو شتێك خەلق و دروست کردنی ببێت لەگەڵ حیکمەتدا (الا له الخلق والامر){٢٧}، واتە ئەو ئەرکەی کە دراوە بە سەریدا، ئەوا هەموو شتێك حیکمەتە نەبینراوەکەی؛ دیوە نەبینراوەکەی تەنانەت ئەگەر دیوە وەزیفیەکەشی حساب بکەین دیوە وەزیفیە نەبینراوەکەی زۆر فراوانترە تا دیوە بینراوەکەی، بۆیە لە بابەتی قووڵاییەکانی (نالی)دا وتمان تەنانەت مرۆڤەکانی پێش سەردەمی مۆدێرنە

مرۆڤی ئاسایی نین، تەنها ئەو مرۆڤە بینراوە نین کە جەستەیەکیان هەیە و عەقڵیان هەیە و دەیانهێننە سەر شاشەی تەلەفزیۆنەکان و ئێمە دەیانبینین! بەڵکو ئەوان جیهانێکی زۆر فراوانترن، ئەگەر خوێنەر سەیری پەیامەکانی (نوور) بکات نوورسی لە زۆر شوێنی پەیامەکاندا ئەو نموونەیە دەهێنێتەوە کە مرۆڤ ناوکی هەموو بوونە موعجیزەی ناو بوونە کە هەموو حیکمەتەکانی ناو بوون لەناو مرۆڤدا هەیە، بەڵام ئەمە دیار نیە لە دیوە نەبینراوەکەیایەتی{٢٨}.

هەروەها باسی ئەوە دەکات ئەگەر مرۆڤ پوختە و گوشراو و کورتکراوەی هەموو بوون بێت ئەوا پێغەمبەر (د.خ) کورتکراوەی هەموو مرۆڤەکانی دیکەیە{٢٩}، بزانە ئەو دیوە نەبینراوەی پێغەمبەر چەند فراوانترە! چونکە حەزرەت وەکو جەستە تەنها مرۆڤێکی ئاسایی بووە، بەشەرێکی (رسول) بووە، بەڵام دیوە (ریسالی)یەکەی مەبەست بووە کە چەند فراوانبووە! کەواتە ئەو جیهان و مرۆڤەی نوورسی باسی لێوە دەکات، خوێنەر نابێت چاوەڕوانی ئەوەی ببێت کە باسی بوونێکی ئاسیی و مرۆڤێکی ئاسایی دەکات، ئەو باسی جیهانێك دەکات کە زۆر فراوانترە هەمیشە دیوە نەبینراوەکان دەهێنێتەوە، لە حیکمەتە نەبینراوەکان باس دەکات کە ئەمە یەکێك لە تایبەتمەندیەکانی پەیامەکانی نوور و جیهانی (نوورسی)ە، کە مرۆڤ ناتوانێت لە رێی مامەڵەی ئاساییەوە دەرکی بکات، رەنگە مایەی سەرسوڕمان بێت کە جاری واهەبووە لە ماوەی بیست خوولەکدا کتێبێکی سەد لاپەڕەیی نووسیوە، جار هەبووە بە دوو سەعات کتێبێکی سەدوسی لاپەڕەیی، دووسەد لاپەڕەیی و سێسەد لاپەڕەیی نووسیوە{٢٩}! ئەوە یەکێکە لە تایبەتمەندیەکانی سەردەمی پێش مۆدێرنەو مامەڵەی (شهودی) لەگەڵ شتەکاندا{٣٠}، ئاخر لە سەردەمی نوێ یاخود مۆدێرنەدا سەرچاوەکانی مەعریفە وەکو سەردەمی پێش مۆدێرنە نەماونەتەوە، کە ئەمە زۆر لە بیریارانی دیکەش باسیان لێوە کردووە و بە دیاریکراوی لای (مصطفی ملکیان) ئەوەی لایە سەرچاوەکانی مەعریفە لە پێش مۆدێرنەدا بریتی بوون لە:

١-شهود، شهود مامەڵەیەکی رۆحانیانەیە، لە رێگەی رۆحانیەت و قەلبەوە هەندێك زانیاری و هەندێك حیکمەتت بۆ کەشف دەبێت کە بە عەقڵ و رێگەکانی دیکە ناکرێت.

٢-عەقڵ، کە یەکێکی دیکە بووە لە سەرچاوەکانی مەعریفە لە سەردەمی پێش مۆدێرنەدا، بەڵکو لە سەردەمی مۆدێرنەدا (عەقڵ) نیە، ئەمە رەنگە خوێنەر تووشی

شۆکه‌یه‌ك بکات! به‌لام له راستیدا وایه، سه‌رده‌می مۆدێرن سه‌رده‌می عه‌قل نیه، ئه‌و عه‌قله‌ی پێش مۆدێرنه بریتیه له عه‌قلێکی گه‌ردوونی که توانای خوێندنه‌وه‌ی هه‌موو شتێکی هه‌یه ده‌کرێت بکرێته پێوه‌رێك بۆ هه‌موو شتێك عه‌قلێکی گه‌ردوونیه و پێوه‌رێکه سه‌راپاگیره..گشتگیره بۆ هه‌موو کاتێك و هه‌موو شوێنێك، ته‌نانه‌ت ئه‌وه‌تا نوێنه‌ری ئه‌و عه‌قله بریتیه له زانستی لۆجیك – علم المنطق– که (قیاس) بڕبڕه‌ی پشتی ئه‌و زانسته‌یه، واته (قیاس)ه بۆ هه‌موو شتێك، ئامرازێکه هه‌موو هه‌له‌کانی پێ راست ده‌کرێته‌وه به زمانی فه‌یله‌سوفه پێشینه‌کان، که‌واته پێوه‌رێکه جێگیره بۆ هه‌موو شتێك ده‌شێت، کاتێکیش ئه‌م پێوه‌ره جێگیره هه‌بوو ئیتر شته‌کانی دیکه که به‌و پێوه‌ره جێگیره کێشران ئه‌وانیش جێگیری خۆیان وه‌رده‌گرن، بۆیه زۆرێك له زانسته‌کانی پێش مۆدێرنه زانستێکی جێگیر بوون، له کاتێکدا ئێستا هه‌موویان له حاله‌تی گۆڕاندان.

٣–(نه‌قل)،یه‌کێکی دیکه‌ی سه‌رچاوه‌کانی مه‌عریفه‌یه له پێش مۆدێرنه‌دا، که له خوێندنه‌وه‌ی (موعجیزاتی ئه‌حمه‌دی) که یه‌کێکه له په‌یامه‌کانی (نوور) زۆر سه‌رم سوڕماوه له‌وه‌ی که (نوورسی) زۆر بلیمه‌تانه نه‌قلی کردۆته یه‌کێك له موعجیزه‌کانی پێغه‌مبه‌ر (د.خ) یه‌کێك له به‌لگه‌کانی له‌سه‌ر (نبووه‌ت)، چونکه ئه‌و هه‌موو نه‌قله‌ی که هه‌زاران هه‌زار پێغه‌مبه‌ر، هه‌زاران هه‌زار ئه‌ولیا، هه‌زاران هه‌زار جنۆکه و ئیرهاسات و ئه‌و شتانه‌ی که له سه‌رده‌می مۆدێرنه‌دا هه‌ر باسی نیه، ئه‌وانه هه‌مووی باسی (نبووه‌ت) ده‌که‌ن که له سنووری ته‌واتوریش به‌ولاتره، ئه‌وه هه‌مووی به‌لگه‌یه له پێغه‌مبه‌رایه‌تی پێغه‌مبه‌ر، که‌واته یه‌کێکی دیکه له سه‌رچاوه‌کانی مه‌عریفه لای (نوورسی) بریتیه له (نه‌قل){٣١} که له سه‌رده‌می مۆدێرنه‌دا نیه، ئێمه ته‌نانه‌ت (نه‌قل)یش ده‌خه‌ینه ژێر نه‌قد و له سه‌رده‌می مۆدێرنه‌دا ره‌خنه‌ی لێده‌گرین.

٤– ئه‌زموون، که سه‌رچاوه‌ی چواره‌می مه‌عریفه‌یه له سه‌رده‌می پێش مۆدێرنه‌دا، ئه‌زموونی که‌سی، ده‌شێت بلێم ئه‌گه‌ر گه‌وره‌ترین پانتایی هه‌یه له سه‌رده‌می مۆدێرنه‌دا، که زۆربه‌ی شته‌کان هه‌ولی ئه‌زموون کردنیان ده‌درێت، ته‌نانه‌ت (نوورسی) نموونه‌یه‌کی جوانی هه‌یه له‌مه‌دا، که باسی مرۆڤ ده‌کات له سه‌رده‌می نوێدا له په‌یامی (سروشت هونه‌ره یان هونه‌رمه‌ند)، ده‌لێت سه‌رده‌می نوێ ناتوانێت مرۆڤ بناسێت، یان بلێین (عه‌قلی ماددی به زاراوه‌ی ئه‌و) ناتوانێت مرۆڤ بناسێت، له‌به‌رچی؟! له‌به‌ر ئه‌وه‌ی سه‌رده‌می نوێ مرۆڤ وه‌کو مرۆڤ ناناسێت، مرۆڤ ده‌کوژێت

لەناوی دەبات و دەیباتە تاقیگە و تاقیدەکاتەوە، واتە دەیباتە ناو تاقیگەوە ئەزموونی دەکات، لەگەڵ ماددەکانیدا مامەڵە دەکات، ئەوکاتەش هیچ جیاوازیەك لە نێوان مرۆڤ و بێ گیان، مرۆڤ و گیانەوەرێکی دیکەدا نابێت، لەبەر ئەوە سەردەمی نوێ و (بە زاراوەی (نوورسی) _ماددیەت) ناتوانێت لەگەڵ (رۆحی مرۆڤدا) مامەڵەی ببێت لێرەوە (ئەزموون) رەنگە لە پەیامەکانی (نوور)دا کەمترین جێگەی ببێت، کەمترین ئامادەیی ببێت، راستە زۆر نموونەی لێدەهێنرێتەوە، وەکو — زیندەوەرزانی و کیمیا و فیزیا— ئاخر یەکێك لە جیاوازیەکانی (نوورسی) لەگەڵ عاریفەکانی دیکەدا ئەوە بووە کە ئاگای لە زانستە نوێکان بووە و دواتریش دەچینە سەر ئەو بابەتە، بەڵام زۆرتر ئەوەندەی من سەرنجم دابێت لە (پەیامەکانی نوور)دا بۆ نموونە جارجار ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کە ئەوەی من دەیڵێم نموونەی پیاوێکی پیرە (واتە خۆی کە تەمەنی گەورەو پیر بووە) یان ئەوە ئەزموونی چەند ساڵەی منە، ئەزموونێکە لێم وەربگرە، ئیتر باسی خودی ئەزموونەکە ناکات! دەرەنجامی ئەزموونەکە دەگێرێتەوە، واتە بە بۆچوونی من ئەمە شتێکە کەمترین (نوورسی) ناسەکان ئاماژەیان پێکردووە. ئەویش ئەوەیە ئەگەر (تەجرەبە) بڕبڕەی پشتی سەردەمی نوێیە ئەوا لای (نوورسی) کەمترین حزوری هەیە{٣٣}.

• لێرەدایە جیهانی (نوورسی) چوار سەرچاوەی هەیە (شهود، بەقل، عەقل، ئەزموون)، کەوابوو کەسێك کە تەنها مامەڵەی لەگەڵ (ئەزمون)دا هەیە نابوابێت لەزەت لەو جیهانە فراوانە بەرێت، تۆ سەیری فراوانی سەرچاوەکانی (پەیامەکانی نوور) بکە، بۆ نموونە لە (پەیامی ئیجتیهاد)دا باسی گەورەیی صەحابە دەکات کە تەرکیز و ناوکۆی فیکری (نوورسی) لەوێدا بریتیە لەوەی کە ئەوان تەنها بەوەی کە راستەوخۆ لەگەڵ (ئەزموونی نبووەت)دا بەرامبەر بوونەتەوە، ئەوەندەی بچووکترین تیشکێك بەر صەحابیەك کەوتبێت ئیتر بەسە بۆ ئەوەی لە هەموو ئەولیا گەورەتر بن، ئەمە ئەزموونێکی شهودیە کە (نوورسی) لەوێدا باسی دەکات، ئاخر خۆ صەحابە وەك خەڵکەکەی دیکە هەر مرۆڤ بوون، بەڵام لە جیهانی رۆحدایە، لە جیهانی تیشك هاویشتنی نبووەتدایە، یاخود بڵێین ئەصحاب لەگەڵ (نبووەت)دا مامەڵەیان کردووە، بۆیە ئەوان گەورەترن، لە کاتێکدا گەورەترین وەلیەکانی دووای ئەصحاب، گەورەترین ئەولیایان ئەگەر چی تەجرەبەکەشی زۆر گەورە بێت ئەوا گەیشتۆتە ئەوپەڕی ویلایەت — (نوورسی) زۆرجار عیرفان بە ویلایەت ناودەبات—

ئەگەر هەموو ئەزموونی ویلایەتیش لای کەسێك کۆببێتەوە ئەوا هەر ناگات بە تۆزی پێی سەحابەیەك کە تەنها یەك تیشك لە ئەزموونی نبووەتی بەرکەوتووە، ئەمە سەرچاوەیەکی شهودیە، یاخود لەوێدا کە باسی (ئیبن عەرەبی) دەکات، بێگومان خەسڵەتێکی دیکەی زۆر جوان کە لای (نوورسی) هەیە و ناسك بوونەوەی رۆحیەتی ئەویش ئەوەیە کە بە – پێچەوانەی زاناکانی ئەهلی سوننە و جەماعە ئەوانەی دواتریان (المتأخرين) کە زۆر زەمی (ئیبن عەرەبی) دەکەن– کەمترین زەم لای (نوورسی) دەبینیت، کە باسی کەس بە خراپە ناکات و ئەمەش یەکێك بووە لە سیفەتی عاریفە گەورەکان، ئەو زۆر سەری سوڕ دەمێنێت لە ئەزموونی (ئیبن عەرەبی) دەڵێت من جارێك ئەوەم بۆ دروست بوو کە بۆ دەبێت ئیبن عەرەبی سەحابە نەبێت؟! لەگەڵ ئەو هەموو تەجرەبە جوانە، ئەو هەموو عیرفانە، ئەو هەموو ئەزموونە رۆحی و بەری ئیمان چنینەوەیەی کە لە کتێبەکانیدا هەیە! کە ئەگەر مرۆڤ ئەهلی ئیشارە و عیرفان نەبێت لێی تێناگات، باشە بۆ ئەسحاب نەبێت، دەڵێت لە سوژدەدا شتێکم بۆ دروست بوو، دیارە ئەوە عالەمی مەعنەویەتی خۆی بووە: کە نا.. زۆری ماوە زۆر، زۆر دوورە لە جیهانی نبووەتەوە{٣٤} زۆر شت هەیە لای (نوورسی) کە بە بۆچوونی من ئەوانەی زۆر خەریکی (پەیامەکانی نوور) دەبن و لەسەری دەنووسن بەو بابەتە پەی نابەن، ئەویش ئەوەیە کە وادەزانن سەرچاوەی (نوورسی) تەنها عەقڵە، دەیانەوێت خوێندنەوەیەکی (عیلمی) بۆ (پەیامەکانی نوور) بکەن، وەك ئەوەی کە ئەو بە عیلم وەڵامی عیلمی داوەتەوە، لە کاتێکدا مامەڵەی (نوورسی) لەگەڵ بووندا مامەڵەیەکی تەنها عیلمی و (ئەزموونی)نیە.

تۆ سەرنج بدە لە یەکەم ئەزموونی (نوورسی) لە بواری گەیاندنی (دین)دا یان لە بواری (بەرگریکردن لە ئیمان)دا بەو مانایەی باسم کرد، کە بریتیە لەوەی خەوێك دەبینێت بە (شێخ عەبدولقادری گەیلانی)یەوە، برۆ بۆ لای فلاّن سەرۆك عەشیرەت پێی بڵێ ئەگەر نوێژ نەکەیت دەتکوژم! ئەمە بە هیچ پێوەرێکی عەقڵی و فیقهی کەسێك بۆی نیە بڕوات کەسێك لەبەر نوێژنەکردنی بکوژرێت – (نوورسی) زانایەکی گەورە بوو لە بواری فیقهدا– ئەگەر هاتوو بە گوێی نەکرد چی؟! دەبێت بیکوژێت؟! بەلاّم نا..سەرچاوەی ئەمە بریتی نیە لە (عەقڵ)، بەڵکو (شهود)ە، کە کۆمەڵێك زانستی گەورە هەبووە سەرچاوەکەیان (شهود) بووە و ئێستا هیچیان نەماون کە گەورەترینیان زانستی (تەئویلی خەو)ە{٣٦}. لێکدانەوەی (خەوبینین) یەکێك لە

زانستەکانی پێش مۆدێرنە بووە و ئێستا باوی نەماوە، یان بە شێوەیەکی سادە بڵێین یەکێك لەو شتانەی کە زوو زوو لای (نوورسی) دووبارە بۆتەوە بریتیە لە (خەو بینین)، یەکێك لە سەرچاوەکانی ئەو (خەو بینین) بووە، خەوی بینیوە بە پێغەمبەری خوداوە (د.خ){٣٧} کە خەوەکانی (سەعید نوورسی) زۆرن، یەکێکی دیکە لە شتەکانی بریتیە لە خوێندنەوەی داهاتوو، یەکێك لە قوتابیەکانی دەیگێرێتەوە لە یادەوەریەکانیدا، کە زۆرجار شتی وتووە دوایی رێك وەکو خۆی بەدیهاتووە، براکەی دەیگێرێتەوە کە ئەو پێشبینی جەنگی جیهانی دووەمی کردووە پێش چەند ساڵێك{٣٨}، ئەم سەرچاوەیە بە ئەزموونی نوێ ناناسرێتەوە و دەرك ناکرێت، هەربۆیە کاتێك ئەم شتانە لای (نوورسی) دەخوێنیتەوە هەست دەکەیت جیهانی ئەو تەنها ئەم جیهانە بینراوە نیە، بەڵکو گەورەترە لە بینراو، بۆ نموونە هەر ئەو کاتەی دادەبرێت و دەچێتە سەر شاخەکانی (ئەرەك)، لەوێ بەخۆیدا دەچێتەوە، یەکەمین ئەزموونی (نوورسی) لە بواری رۆحانیەت و عیرفاندا روودەدات. لەوێدا بیر لەوە دەکاتەوە کە ئێستا لەبەردەم ئەودا کە لەسەر ئەو شاخە بڵندە لەژێر دارێکدا وەستاوە، هەشتا هەزار جەنازە لەبەردەمی ئەودا هەیە، دیارە ژمارەکانی لای (نوورسی) تەنها بۆ پیشاندانی فرەیین نەوەکو خودی چەندێتی ژمارەکە، کە ئەمەشی لە (قورئان)ەوە وەرگرتۆوە، چونکە وەك خۆیشی دەڵێت هەموو (پەیامەکانی نوور) تەنها تیشکێکە لە تیشکەکانی نووری قورئان، بۆیە باسی ئەوە دەکات کە لەو چرکە ساتەدا هەزارەها هەزار مرۆڤ لەسەر زەویدا مردوون کە ئەویش یەکێکە لەوان ئەمە بە چاوی بینین مرۆڤ دەرکی ناکات{٣٩}، یان بۆ نموونە لە شوێنێکی دیکەدا دەڵێت من هەشتا هەزار مامۆستام هەیە! من کاتێك کە بۆ یەکەمجار ئەوەم خوێندەوە تووشی شۆکە بووم، کەسێك چۆن دەتوانێت بانگەشەی ئەوە بکات هەشتا هەزار مامۆستای ببێت؟ ئەگەر تەمەنیشی هەشتا هەزارساڵ بوو بێت ئینجا دەتوانێت هەشتا هەزار مامۆستای ببێت! بەڵام من بۆم دەرکەوت مامۆساتاکانی (سەعید نوورسی) مامۆستای ئاسایی نین، مامۆستاکانی (نوورسی) مامۆستایانێکن کە تەنانەت (بە تەعبیری خۆی) مێشیش مامۆستای بووە! کە مێش هەمیشە خەریکی پاککردنەوەی خۆیەتی، جیهانی (سەعید نوورسی) زۆر فراوانترە لەو جیهانەی کە هەرکام لە ئێمە هەستی پێدەکەین، جیهانێك کە لە یەك چرکەدا هەشتا هەزار مامۆستای لەبەرچاوی ئەو هەبووە و لە رۆحی ئەودا حزوری بووە.

**دووەم: مەعریفی بوونی نوورسی.**

یەکێکی دیکە لەو شتانەی کە لای (نوورسی) هەیە و کەمتر ئاماژەی پێکراوە، مەعریفەیە، (نوورسی) هەتا تەمەنی چلوپێنج سالّی کەسێك بووە کە ئەگەر چی مەعنەویەت وەك سەنتەر لای (نوورسی)دا هەر بوونی هەبووە، پێشتر لە یەکەمین کتێبێکدا کە نووسیویەتی، تەنانەت لە تەفسیرەکەشیدا کە لە کاتی جەنگی جیهانی یەکەمدا و لەسەر ئەسپ و لە گەرمەی شەڕدا نووسیویەتی (مەعنەویەت) دەبینێت، تەنانەت لە بنەماڵەکەیاندا ئەمە هەر هەبووە، کە باوکی سۆفی بووە و بەلاّم هەست دەکەیت تا تەمەنی چلوپێنج سالّی هەولّی بە دەستهێنانی مەعریفەی سەردەمی حوی زور داوە، زیرەکیەکەی زۆر هاوکاری بووە لەو بابەتەدا، بەلّکو بڕانی ئەو لە رەفاهیەت و ژیانی نوێ ئەگەر چی بەهۆی زیرەکی خۆی توانیویەتی ببێتە کەسێکی ناوداری ناو خەلافەتی عوسمانی، بەلّکو یەکێك بێت لەو پێنج کەسەی (دار الحكمة) کە یەکێك لە بەناوبانگترین دەزگا و دەسەلاّتی مەعریفی بووە لە سەردەمی دەسەلاّتی حکومەتی عوسمانیدا، هەتا تەمەنی چلوپێنج سالّی هەر خەریکی کۆکردنەوەی (مەعریفە) بووە، دەشێت بلّێم (نوورسی) ئاگادار بووە بەسەر زۆربەی مەعریفەی سەردەمی خۆیدا، تەنانەت ئەمە دەردی سەری بۆ دروستکردووە، کە ممکن نیە مرۆڤی سەردەمی مۆدێرنە ئەوەندە زیرەك بێت، چەند جار باسی دەکات کە تووشی گرفت بووە بەهۆی ئەم بابەتەوە تەنانەت بە (شێت) تاوانبار کراوە{٤١}!

بە کوکردنەوەی ئەو مەعریفەیە و لەگەلّ ئەو سەرچاوە مەعریفیانەی پێش مودیرنە بوویان هەبووە (پێشتر باسمان کردن) توانای پێشبینی کردنیان بە ئەو بەخشیوە. توانای زیرەکیان بە ئەو بەخشیوە، رۆح پاکییان بە ئەو بەخشیوە، لەتافەتی رۆحی و ناسکیان پێبەخشیوە کە یەکێك لە تایبەتمەندیەکانی دونیای عیرفان و عاریف بوون بریتیە لەوەی مرۆڤ ناسك دەبێتەوە، هەرچیەك دەلّێت ئەدەبیاتە، کە یەکێك لە گەورەترین شاعیرەکانی تورکیا دەلّێت (نوورسی) لە (گۆتە) و لە (دانتی) شاعیرتر بووە{٤٢}، ئەو مەعریفەیەی پێشووتری لەتافەتی رۆحی پێبەخشیوە، بەلاّم (سەعیدی نوێ) سەعیدێك نیە مەعریفەی نوێ تەوزیف بکات ئەسلّەن ئەو پچڕاوە لە سەردەمی نوێ، بۆ نموونە کاتێك (ریکۆرد و تەسجیل و رادیۆ) دروست دەبێت، ئەم دەزگایە کە دەگاتە دەستی (نوورسی) هەرکەس

دەڕواتە لای پیشانی دەدات و دەڵێت ئەوەتا دەزگایەکی لەم جۆرە داهاتووە و (پەیامەکانی نوور)ی تێدا تۆمار دەکرێت، ئەوەندە لە سەردەمی نوێ بڕاوە!(ئەو دوو جیهانە لەیەك دوورە) کە تا ساڵی شەستەکان نە سەیری تەلەفزیۆنی کردووە، نە گوێی لە رادیۆ گرتووە، تەنانەت رۆژنامەکانیشی زۆر نەخوێندۆتەوە، لە مەعریفەی سەردەمی نوێ بچڕاوە، بەڵام ئەو هەموو مەعریفەیەی هەڵڕشتوە!.

(سەعیدی نوێ) سەعیدی مەعریفە نیە بەڵکو تەوزیف کردنەوەی مەعریفەکانی (سەعیدی کۆن)ە، ئەو سەعیدەی پێش ئەوەی ئەم حاڵەتە رۆحی و ئەزموونە مەعنەویە گەورەیەی بەسەردا بێت.

**بەراوردی نێوان سەعید نوورسی و عاریفەکانی پێش مۆدێرنە:**

با بەراوردێك بکەین لە نێوان (سەعید نوورسی) و عاریفەکانی سەردەمی پێش مۆدێرنە، بە بۆچوونی من هەموو ئەو شتانەی کە بەسەر عاریفەکانی پێش مۆدێرنەدا هاتووە یاخود بڵێین تایبەتمەندی هەمەگیر و گشتگیری هەموو عاریفەکان بوون بەسەر سەعید نوورسیشدا هاتوون، دیارە کە هەموو کەسێك ئەزموونێکی تایبەتی خۆی هەیە لە بواری عیرفاندا، بەڵام ئەو شتەی بۆ زۆرینەیان راستە بەسەر (سەعید نوورسی)یشدا راستە.

گەر بەراوردێك بکەین لەنێوان (نوورسی) و (مەولانا)دا، (مەولانا) دەبێتە موفتی دیار، گەورەترین فتوادەر لە (ئەرزەرۆم)دا واتە لە تورکیای ئەو کاتەدا، لە شاری (قونیە) و دەوروبەریدا، دەبێتە جێی متمانەی والی ئەو دەڤەرە، مامۆستایەکە سەدان قوتابی و فەقێ و مەدرەسەی هەیە، ئەم پیاوە بەهۆی تێپەڕبوونی بە ئەزموونێکی رۆحیدا واز لە هەموو ئەو شتانەی خۆی دەهێنێت، دوای ئەوەی کە (شەمسی تەبریزی) دەبینێت{٤٤} — کە ئەوە چیرۆکێکی دوورودرێژە و لێرەدا کاتی گێڕانەوەی نیە— بەڵام (سەعید نووورسی)ش بە هەمان شێوە بووە، یەکێك بووە لە گەورەترین زاناکانی سەردەمی خۆی و جێی متمانەی خەلیفە بووە، تەنانەت ئەو کاتەی کە لە روسیا دەگەڕێتەوە، خەلیفە خۆی دەڕوات بۆ پێشوازی لێکردنی{٤٥}، لەم رووەوە تەجرەبەکەی (مەولانا) و (نوورسی) زۆر نزیکە لە یەکترەوە، نوورسی مامۆستایەکی ئەوەندە گەورە بووە کە لەناو هەموو کوردستانی تورکیادا مەلایەکی زۆر ناسراو بووە، تەنانەت (شێخ سەعیدی پیران) بۆ

هەڵگیرساندنی شۆڕشەکەی پێویستی بە فەتوای ئەو بووە کە خەڵکی ناردۆتە لای (نوورسی) فتوای بۆ بدات{٤٦}، ئەمە مانای ئەوەیە کە (سەعید نوورسی) مەلایەکی زۆر گەورە بووە و فەقێی هەبووە، تەنانەت یەکێك لە سەرۆك عەشیرەتەکان کە دەڕوات زەکاتی بۆ دەبات، نیوکیلۆ ئاڵتون زەکاتی بۆ دەبات! ئەمە دیارە کە ئەو مامۆستایە ئەوەندە فەقێ و قوتابی هەیە کە نیوکیلۆ ئاڵتون بکات بە مەسرەفیان{٤٧}، لێرەوە هیچ گومان لەوەدا نیە کە (نوورسی) یەکێك لە زانا و ناودارەکان و (بەدیعوزەمان)ی زەمانی خۆی بووە، ئەمیش بە هەمان شێوەی (مەولانا) بە ئەزموونێکی رۆحیدا دەڕوات و ئیتر واز لەو هەموو ژیانە رەفاهیەتەی خۆی دەهێنێت{٤٨}.

دوای ئەوەی کە لە روسیا دەگەڕێتەوە و لە حاڵەتێکی رۆحی سەیردا کاتێك کە کتێبەکەی (ئیمانی رەببانی) دەخوێنێتەوە و تەعبیری (وحد القبلة) — قیبلەت یەکلایی بکەرەوە— دەبینێت ئەگەر (مەولانا) راستەوخۆ (شەمسی تەبریزی) ببینێت ئەو کودەتایەی بەسەردا بهێنێت، دوای ئەوەی (شەمس) پرسیارێکی فەلسەفی لە (مەولانا) دەکات، بێگومان ئەو پرسیارە فەلسەفیە بۆ وەڵام نیە، بەڵکو بۆ شۆکە دروست کردنە لە (مەولانا)دا، لێرە بە دواوە (مەولاناش ئەو حاڵەتەی بۆ دروست دەبێت، (نوورسی)ش کاتێك کتێبەکەی (ئیمامی رەببانی) دەخوێنێتەوە، لەوێدا لەگەڵ ئەودا رووبەڕوو دەبێتەوە، بەڵام لە عالەمی رۆحدا، چونکە ئیمامی رەببانی نەماوە و چوارسەد ساڵ پێش نوورسی ژیاوە، تووشی ئەو شۆکەیە دەبێت کە تەعبیری (وحد القبلة) دەبینێت و ئیتر دوای ئەوە بڕیار دەدات ببێتە خزمەتکاری قورئان{٤٩}، لێرەوە قۆناغی (سەعیدی تازە) دەست پێدەکات، ئەمەش تەجرەبەیەکی دیکەیە، کە دوای ئەوە وەکو (مەولانا) ئیدی هەر شتێك دەڵێت بۆ ئەوە دەشێت بنووسرێتەوە، وەك ئەوەی لای (مەولانا)ی دوای بینینی (شەمسی تەبریزی)، (مەسنەوی) دروست دەبێت، دیوانی (شەمس) دروست دەبێت و بەو جۆرە هەر شتێکی وتووە ئەدەبیات بووە و نووسراوەتەوە{٥٠}، هەمووی زانستی رۆحی و عیرفان بووە و بۆ ئەوە شیاوە کە بنووسرێتەوە، (سەعید نوورسی) بەهەمان شێوە دوای ئەو ئەزموونەی لەگەڵ (ئیمامی رەببانی)دا هەرچیەك دەڵێت بۆ ئەوە دەشێت بنووسرێتەوە و (پەیامەکانی نوور) دروست دەبن.

ئیمامی (غەزالی) بەهەمان شێوە دوای ئەوەی کە گەورەترین کەسی مەعریفی سەردەمی خۆیەتی و بەڕێوەبەری (نیزامی)یە سەرۆکی گەورەترین زانکۆی سەردەمی خۆیەتی، تووشی ئەزموونێکی رۆحی دەبێت و ئەوە بەجێدەهێڵێت و دەڕوات تەنانەت (ئیبن عەرەبی) و (حەلاج)یش بە هەمان شێوە بوون{٥١}، لێرەوە دەتوانین بڵێین نزیکیەك یاخود دووبارە بوونەوەیەك دەبینین لە ئەزموونی عاریفەکاندا، من هیچ گومانم لەوەدا نیە کە (سەعید نوورسی) دوایین عاریفی شارستانیەتی ئیسلامی بووە، دوای ئەو ئیتر تا ئێستاش هیچ عاریفێکی گەورە دروست نەبووە، بە بۆچوونی من ئەگەر بشێت دروست ببێت ئەوا هێشتا زۆر زووە، ئەمە ئەگەر نەڵێم کە قەد دروست نابێت، واتە ئەگەر عیرفانی ئیسلامی کۆتایی پێهاتبێت ئەوا لە (سەعید نوورسی)دا کۆتایی پێهاتووە، من بەڵگەم زۆرە لەسەر ئەوەی کە ئەزموونی عیرفانی فراوان ئەوەی کە کەسێك بتوانێت عاریف بێت و عیرفان مەلەکە بێت لای شیمانەی بوونی نیە، دەشێت کەسێك ببێت چرکەسات یان حاڵەتێکی ئیمانی و عیرفانی بۆ دروست ببێت، بەڵام ئەوەی هەرچیەك بڵێت بۆ ئەوە بشێت بە (عیرفان) دابنرێت، ئەستەمە دروست ببێت، ئەو سەردەمە کۆتایی پێهات، ئەوەتا تەنانەت رێگەکانی تەسەوفیش کۆتایی خۆیان راگەیاند، کە (شێخ عوسمانی تەوێڵە) خۆی لە وەسیەتنامەکەیدا دەڵێت ئەوەی دوای ئێمە بانگەشەی لەو جۆرە بکات ئەوە بۆ دونیای خۆی دەکات، چونکە کاری ئێمە کۆتایی پێهات؛ دەی ئیدی (سەعید نوورسی) کۆتا عاریف بووە، هەرچیەکی وتووە ئەزموون بووە. تەنانەت خۆیشی هەستی بەوە کردووە کە درێژەپێدەری رێگاکەی (مەولانا خالیدی نەقشبەندی)یە، بۆ نموونە دەگێڕنەوە یەکێك لە کچە نەوەکانی (مەولانا) عەباکەی (مەولانا) بە دیاری دەنێرێت بۆ (سەعید نوورسی)، بەڵام ئەو ئەمە دەزانێت کە (سەعید نوورسی) هەرگیز دیاری راستەوخۆی بۆ خۆی قەبوڵ نەکردووە، بۆیە دەیداتە یەکێك لە قوتابیەکانی (نوورسی) وەك ئەوەی کردبێتیە دیاری بۆ ئەو بێ ئەوەی پێی بڵێت ئەمە دیاریە بۆ تۆ، ئەویش وادەزانێت بۆ خۆیەتی، ئەمیش دەیبات پیشانی (سەعید نوورسی) دەدات، (نوورسی) دەڵێت ببەن بیشۆن (واتە بۆ خۆی) قوتابیەکەی پێی سەیر دەبێت، هەرگیز مامۆستا (نوورسی) نەبینیووە دیاری بۆ خۆی وەربگرێت، بۆیە قوتابیەکەی کە دەبینێت مامۆستا عەباکە ماچ دەکات و دەفەرموێت برۆن بیشۆن، زۆر سەری سوڕ دەمێنێت دیارە مامۆستا (نوورسی)

تەعەلوقێکی رۆحی بەو حاڵەتەوە هەیە جا ئەو قوتابییەی کە هێناویەتی دەڕواتەوە بۆ لای ئافرەتەکە و دەپرسێت نهێنی ئەم مەسەلەیە چیە؟ ئافرەتەکە دەڵێت لە راستیدا من ئەو عەبایەم بۆ (سەعید نوورسی) ناردووە، بەڵام زانیم کە ئەو راستەخۆ هیچ دیارییەك قەبوڵ ناکات بۆیە دام بە تۆ! جا (نوورسی) سەدساڵ دوای (مەولانا خالید) لە دایك بووە، واتە درێژەپێدەری رێگەی ئەوە {٥٢}.

لێرەوە ئەزموونی عیرفانی (سەعید نوورسی) ئەزموونێکە بە زاراوەی خۆی ناکرێت بە جیهانی رۆح قسە بکات وەکو عاریفەکانی پێشووتر، لەبەر ئەوەی سەردەمی نوێ خزاوەتە نێو ئەو زەمەنەی کە ئەو تێیدا ژیاوە، ئەو تەنها ئەوەی پێکراوە خۆی لە سەلبیاتەکانی سەردەمی نوێ بەدوور بگرێت، لێرەوە (سەعید نوورسی) دوایین عاریفی سەردەمی نوێیە.

## کوردبوون و دوایین ئەزموونی عیرفانی لای (نوورسی):

باشە بۆ دەبێت دوایین عاریفی شارستانیەتی ئیسلامی کورد بێت؟ تەنانەت لە شارستانیەتە مەعنەویەتگەراکانی وەکو شارستانیەتی هیندیشدا، بۆ دەبێت دوایین عاریف و دوایین کەسێك کە ئەزموونی رۆحی ببێت، بتوانێت نزیکەی چل ساڵ هەرچیەك بڵێت هەمووی ئەزموونی رۆحی بێت، بە بەردەوامی و بەبێ ئەوەی پچڕانێك ببێت، بەبێ ئەوەی خورپەیەك بە دڵیدا بێت کە با سەربکاتەوە بە تونێلەکانی سەردەمی نوێ و شارستانیەتی مۆدێرندا!، واتە لە سەردەمێکی نوێی وەکو مۆدێرنەدا بۆ دەبێت کۆتا عاریف لەناو (کورد)دا دروست ببێت؟! بە بۆچوونی من ئەمە چیرۆکێکە قسە زۆر هەڵدەگرێت، کە ئەم پرسیارە بە چرکەساتیش لای کەسانی دیکەش دەرکەوتووە، بۆ نموونە ئەو رۆژهەڵاتناسەی کە هاتووە وتوویەتی هەموو کوردەکان شاعیرن، یاخود ئەو کەسەی وتوویەتی کوردەکان لە دەرەوەی مێژوون (مێژووی سەردەمی مۆدێرنە) یاخود ئەوانەی وتوویانە کوردەکان کۆتا مرۆڤن دێنە سەردەمی مۆدێرنەوە، من هیچ گومانم لەوەدا نیە بە حوکمی ئەوەی کورد کە هێشتا دەوڵەتی نەتەوەی نیە، بە حوکمی ئەوەی دوو پایەکەی سەردەمی نوێ کە بریتین لە (عەقڵانیەتی تەجزیئی — عەقڵی ئامێری— لەگەڵ زانست)دا هیچ کامیان لەناو (کورد)دا جێیان نەگرتووە بە حوکمی ئەوەی کە هێشتا دەوڵەت نیە، کە دەوڵەتیش نەبوو زانستی سیستەماتیزەکراو یاخود زانکۆ جێگیر نابێت، راستە کە

تەلەفزیۆن و ئۆتۆمبێل و فرۆکە و... ئامێرە جیاوازەکان هاتوون، بەڵام زانست بە ماتا مۆدێرنەکەی یان زانکۆ هێشتا نەهاتۆتە ناو کوردەوە کە هۆکاری سەرەکی ئەمەش نەبوونی دەوڵەتی نەتەوەیە، لەبەر ئەوە هەموو سیستەمی رۆحی و فیکری ئێمەی کورد هەتا هەنووکەش سیستەمێکە هی پێش مۆدێرنەیە؛ هەر بۆیە ئەو کاتەی (سەعید نوورسی) دەڕواتە شاری ئەستەنبوڵ و دەیەوێت سەرنجی خەڵکی ئەستەنبوڵ و پایتەختی ئەوکاتەی خەلافەتی ئیسلامی بۆ لای خۆی رابکێشێت، دەچێتە ئوتێلێکەوە و لەسەر دەرگای ژوورەکەی دەنووسێت لێرە وەڵامی هەموو پرسیارێك دەدرێتەوە بەڵام پرسیار لە کەس ناکرێت، بۆ ئەوەی خەڵك بوێرێت بچێت و پرسیار بکات، بەمە دەنگوباس پەیدا دەکات و هەواڵ دەگاتە کۆشکی خەلافەت و لای (سوڵتان غەبدولحەمید) تا بپرسێت ئەمە کێیە، دوایی کە تاقیدەکرێتەوە گەورەترین عاقڵەکانی پایتەختی ئیسلامی و فەیلەسوفەکان و ئەدیبەکان و کیمیازانەکان و فیزیازانەکان هەموو دەچن و پرسیاری لێدەکەن، بۆیان دەردەکەوێت کە مومکین نیە مرۆڤێك لە سەردەمی نوێدا ببێت کە ئەم هەموو زانستانەی پێببێت! هەر بۆیە دوایی بەهۆی ئەم بلیمەتبوون و زۆر زانینەوەیە دەیخەنە بەندیخانەوە و تۆمەتباری دەکەن بەوەی کە جنۆکەی هەیە و شێتە! لە کاتێکدا لەگەڵ دکتۆرەکە قسە دەکات دکتۆرەکەی دەڵێت: ئەگەر (سەعید نوورسی) شێتی تێدا بێت ئەوا هەموو عاقڵەکان شێتن و هەموومان شێتین، هەرگیز ئەو (بەدیعوزەمان)ە شێت نیە، لێرەدایە (نوورسی) دەڵێت ئێوە بەهۆی سێ شتەوە منتان هێناوەتە ئەم شێتخانەیەوە:

یەکەم: بەهۆی ئەوەی کە وەڵامی هەموو پرسیارێکم داوەتەوە.

دووەم: لەبەر بوێریم.

سێیەم: لەبەر جلوبەرگەکەم. {٥٣}

جا باسی ئەوە دەکات کە هەموو کوردێك وایە، ئاماژە بەوە دەکات کە هەموو کوردەکان وان، باسی زیرەکیەکە نیە، باسی دوو شتەکەی دیکەیە زۆرتر، هەموو کوردەکان بوێرن، مرۆڤی پێش مۆدێرنە مرۆڤێکە، یاخود سیستەمی ئەخلاقی پێش مۆدێرنە سیستەمێکە بینا لەسەر بوێری و غیرەتە، پاڵەوانە! جلوبەرگەکەشمان بەهەمان شێوە، ئەگەر من شەبقە لەسەر ناکەم وەکو ئێوە، ئەگەر من قات و بۆینباخم نیە وەکو ئێوە، ئەوا هی ئەوەیە کوردێکی عەشایەرم و لە جیهانێکی

دیکەوە هاتووم، کەواتە پیشانی دەدات کە جیهانی ئەو جیاوازە لە جیهانەکەی ئەوان، بۆیە دەکرێت لەم جیهانەدا کە هێشتا مۆدێرنە نەچۆتە ناویەوە هەوێنی ئەوە مابێت مرۆڤەکانی سەردەمی پێش مۆدێرنەی لێوە بناسرێت، ئەگەر زانا ئەنسرۆلۆجیستەکان چوو بن لە خێڵە بەرازیلی و خێڵەکانی باشووری ئەفەریقا و..لەو خێڵانەی دیکە نموونەیان وەرگرتبێت بۆ ئەوەی خەسڵەتی مرۆڤەکانی سەردەمی پێش مێژوو بدۆزنەوە، ئەوا بۆ ئەو کەسانەی دەیانەوێت خوێندنەوە و لێکۆڵینەوەی سەردەمی پێش مۆدێرنە بکەن باشترین شوێنێك کە مابووبێت بریتیە لە کوردستان، لەبەر ئەوەی هێشتا سیستەمی سیاسی نوێ لەم ناوچەیەدا جێگیر نەبووە و بە تەواوی پێی نەخستۆتە ناو جیهانی نوێوە.

بۆیە خەڵکی بلیمەتی کورد خەڵکانێکن لە سەردەمی مۆدێرنەدا داهێنانیان کەمە، بەڵام داهێنانی سەردەمی کۆنیان وەکو مرۆڤەکانی ئەو سەردەمە زۆر و زەبەندەیە، واتە چۆن نەتەوە و شارستانیەتەکانی دیکە داهێنانیان هەبووە لە بواری (فیقە)دا یاخود – ئیسلامی مەعیشەتی–، چۆن داهێنانیان هەبووە لە (فەلسەفە)دا، چۆن داهێنانیان هەبووە لە بواری (عیرفان و ئەزمونی رۆحی)دا، کوردەکانیش بە هەمان شێوەی ئەوانی دیکە داهێنیان بووە، واتە ئێمەی کورد لە سەردەمی کۆندا هیچ دواکەوتنێکی نیە لە نەتەوەکانی دیکە، ئەوە لە سەردەمی نوێدا دواکەوتنمان لە نەتەوەکانی دیکە بۆ دروست دەبێت، چونکە هەموو نەتەوەکانی دیکە دەوڵەتی نەتەوەیان هەیە ئێمە نیمانە.

ئەگەر کاتی خۆی (فەقیە) هەبووە، ئەوا دەشێت بڵێین زۆرێك لە فەقیهە گەورەکانی شارستانیەتی ئیسلامی کورد بوون، گەر فەیلەسوف هەبووە ئەوا زۆرێك لە فەیلەسوفەکانی شارستانیەتی ئیسلامی یاخود ئەوانەی دواترینیان کورد بوون، هەروەها لە عیرفانیشدا بەهەمان شێوە کە زۆرێك لە شاعیرە گەورەکانی کورد ئەزموونی عیرفانیان هەبووە، دوایین ئەزموونیش لەو ئەزموونە عیرفانیە بریتی بووە لە (سەعید نوورسی)، کەواتە (سەعید نوورسی) نوێنەری سەردەمی کۆنە لە مۆدێرنەدا، ئەمەش بوو مانای ئەو قسەیەی کە وتم فەیلەسوفێکی ئێرانی وەکو (شایگان) دەبوو عاریفێکی وەك (نوورسی) بکردایەتە نوێنەری شارستانیەتی رۆژهەڵات و وەستاندنی لەبەردەم رەخنەکردنی مۆدێرنە و کلتوری رۆژئاوادا، تەنانەت ئەو شتەی کە هانیدام جارێکی دیکە بڕ.مەو. خز.تی (نوورسی) و

بیخوێنمەوە، گوێگرتنم بوو لە موحازەرەیەکی (د. عەبدولکەریم سروش) کە باسی (مەولانای رۆمی) دەکرد لە زانکۆیەکی بەریتانیا لە ژێر ناونیشانی (مەولانا و رۆژئاوا)، لەوێدا باسی ئەوەی دەکرد ئەگەر چی (مەولانا) لە تورکیا ژیاوە بەلاّم ئەو لەو چرایە دەکات کە بنی خۆی تاریکە و تیشکەکەی تەنها جێگەی دووری لە خۆی رۆشنکردۆتەوە، مەبەستی ئەوەیە کە ئەگەر چی (مەولانا) لە قۆنیە ژیاوە، بەلاّم لە ولاّتەکەی خۆیدا کەسێك سوودی لە ئەزموونەکەی وەرنەگرتووە! عاریفێکی دیکە نەبووە ئەو ئەزموونە درێژە پێبدات، ئەوە رۆژئاوایە جارێکی دیکە ئەو ئەزموونەی زیندوو دەکەنەوە و ئێستا لەسەر شیعرەکانی دەنووسن و تەنانەت یەکەم کەسێك بەناوی (نیکلسون) کە دیوانی (مەولانا)ی بۆ ئینگلیزی وەرگێڕاوە{٥٤} لە ریی خەوبینینێکەوە بووە بەم کارە هەڵساوە، بەو مانایەی (مەولانا) لەو فانۆسە دەکات کە دووری خۆی رۆشن کردۆتەوە بەلاّم بنەکەی خۆی تاریکە! بێگومان لەگەلّ رێزێکی زۆرم بۆ بیریاری گەورەی ئێرانی (د.عەبدولکەریم سروش) هەستدەکەم ئاگایی ئەو پیاوە دەکرد لەو بابەتەدا، ئەگەر چی (د.سروش) ساڵانە سەفەری تورکیا دەکات و دەچێتە سەر گۆڕەکەی (مەولانا) و لە کۆنگرەی مەعریفی و فیکریەکانی تورکیادا — کە ئێمەی کورد بێ ئاگاین لێیان— بەشداری دەکات، بەلاّم ئەو ئاگای لەوە نیە. کە دوای (مەولانا) ئەزموونێکی عیرفانی گەورەی وەك (سەعید نوورسی) تەنانەت لە سەدەی بیستیشدا ماوە و بوونی هەیە، کە ئەو رێك جی پێیەکانی (مەولانا) هەڵدەگرێتەوە، ئەویش ئەزموونێکی گەورەیە وەکو ئەزموونەکەی (مەولانا)، ئەویش ئەزموونی رۆحی خۆی هەیە، بەلاّم تەنها جیاوازی (نوورسی) لەگەلّ (مەولانا)دا لەوەدایە کە (مەولانا) بەری ئیمانی و ئەزموونە رۆحیەکەی خۆی چنیوەتەوە بۆ قوتابیەکانی کە بەچواردەوریەوەن، بە گوتەی خۆی ئەو کاتانەی کە تەنها (مەحرەم) لەوێ بوونی هەیە{٥٥}، ئەزموونەکەی بۆتە (مەسنەوی مەعنەوی) و قوتابیەکانی بۆیان نووسیوەتەوە، دەی (سەعید نوورسی)ش بە هەمان شێوە ئەزموونی خۆی هەبووە، بەلاّم ئەو کارێك زیاتری لە پیشاندانی ئەزموونەکەی خۆی کردووە کە ئەویش بەرگریکردنە لەو جۆرە ئەزموونانە، بەرگریکردن لە کۆی بەرەکانی درەختی ئیمان و ئەزموونەکان، ئەگەر (مەولانای رۆمی) کتێبی (مەسنەوی مەعنەوی) هەیە، ئەوا (نوورسی)ش (مەسنەوی نووری) دەنووسێت و ئەمەشی لە بەرامبەر سەرسوڕمانی بە (مەولانای رۆمی)یەوە ئەنجامداوە. تەنانەت براکەی کە لە

شاری (قۆنیە) مامۆستای عەرەبیە، کە چاوپێکەوتن لەگەڵ (نوورسی) دەکات، نوورسی باسی مەولانای بۆ دەکات، بێجگە لەوە زۆر جار ڕێککەوتووە کە خەڵکی (نوورسی)یان بینیوە تووشی شۆکە بوون و کەسایەتی مەعنەوی ئەو کاریگەری رۆحی لەسەر دروست کردوون، تەنانەت جارێکیان دەروێشێکی تەریقەی مەولەوییە (تەریقەی مەولانا) کە (سەعید نوورسی) دەبینێت، (نوورسی) پێیدەڵێت من هیچ نیم جگە لەوەی کە شوێن پێی شێخەکەی ئێوەم هەڵگرتووە! واتە منیش ڕێبوارێکی ئەو ڕێگایەم.

تەنانەت هەندێك لە کەراماتی سەردەمی پێش مۆدێرنە لە ئەودا بوونی هەیە، بۆ نموونە هەر ئەو کاتەی کە دەیگرن و کۆت دەکەنە هەردوو دەستی و دەیبەنە زیندان، ئەو کۆتە ئاسنیانە دەپچڕێنێت! ئەو پاسەوانانەی کە لەگەڵیدان و لەوەو پێش ئازاریان داوە پێی دەڵێن ئیتر تۆ مامۆستای ئێمەیت و ئێمە دەبینە خزمەتکاری تۆ! ئەمە ئەزموونێکی گەورەیە، ئەو پیاوەی کە زیاد لە حەڤدە جار دەرمانخوارد دەکرێت، بەڵام ئەو ئەوەندە کەسایەتی خۆی بەلاوە گرنگ نیە بەقەد ئەوەندەی کە ئەزموونەکەی بەلاوە گرنگە.

### جیاوازی نێوان سەعیدی کۆن و سەعیدی نوێ:

جیاوازی نێوان (سەعیدی کۆن) و (سەعیدی نوێ) جیاوازیەکی مەعریفی نیە، بەلکو جیاوازییەکی رۆحیە، ئەزموونێکی رۆحیە، بەو مانایەی من دەتوانم بڵێم کە سەعید نوورسی زیادکردنێکی نەکردووە بە زانستی عەقاید و زانستی کەلامی ئیسلامی تەنانەت بەری ئەو زانستانەی چنیووەتەوە، لە فەلسەفەدا زیادکردنێکی نەکردووە، هەرسێ زاراوەکەی زانستی کەلامی ئیسلامی (مومکین) و (موستەحیل) و (واجیب) لە زۆربەی نووسینەکانی (نوورسی)دا حزووریان هەیە، بەڵگەکانی ئەو بەڵگە کەلامیەکانی پێش خۆیەتی، بەڵام زیادەکەی ئەو بریتیە لە ئەزموونە رۆحیەکەی، کەوا ئەگەر ئەو عەقڵی تەوزیف کردووە، عەقڵ بە مانا کلاسیکیەکەی ئەوەی پێشتر باسم لێکرد واتە (پێوەرە وەستاوەکە)، بۆ ئەوەی شبوهات و لادانەکانی سەردەمی نوێ پیشان بدات، تەنانەت ئەو دەڵێت و لادانەکانی سەردەمی نوێ پیشان دەدات، تەنانەت ئەو دەڵێت دژایەتی من لەگەڵ (فەلسەفە)دا بریتیە لە دژایەتی فەلسەفەی ماددی، ئەوا لەم بوارەدا زیادکردنێکی نیە بە بۆچوونی من،

ئەگەر زیادکردنێکی هەبێت وەکو جوگرافیاکەی خۆی بوویەتی، کە کەس لەو سەردەمەدا بە ئەندازەی ئەوی نەزانیوە، کاتێك نۆ مانگ لە شاری (وان) لە ماڵی والیەکدا دەمێنێتەوە، لەو ماوەیەدا نزیکەی نۆسەد کتێبی لەبەرکردووە، هەموو کتێبی فیکری و مەعریفی و فیزیا و کیمیا و فەلسەفە و..ئەو بابەتانە بووە{٥٨}، دوایی زیادکردنێکی بۆ هەموو ئەو بابەتانە نیە، بەو مانایەی کە (نوورسی) فەیلەسوفێکی گەورە نیە کە داهێنانی لە فەلسەفەدا کردبێت، (سەعید نوورسی) مەعریفییەکی گەورە نیە لە هیچکام لەو بوارانەدا، بەڵکو ئازایەتی ئەو ئەوەبووە هەموو ئەوانەی زانیووە، ئاخر لە کاتێکدا کە ئەو خوێندنی حوجرە و خوێندنی کلاسیکی کۆنی هەبووە، دوایی وایلێهاتووە فیزیا و کیمیاش فێربووە، نە ئەوەی لەو جۆرە زانستانەدا گەیشتبێتە دوند، کەوابوو جیاوازی و گەورەیی (سەعید نوورسی) تەوزیفکردنی ئەو زانستە جیاوازانەیە لە جیهانی رۆحدا! ئەمەیە ئەو نوکتەیەی کە بە بۆچوونی من (عەبدولکەریم سروش) نەیپێکاوە کە لە بنی ئەو چرایەدا (نوور)ێك هەیە، بەڵکو لە پاڵ ئەو چرایەدا چرایەکی دیکە داگیرساوە کە ئەویش چراکەی (نوورسی)یە، بەڵام ئەو دەرکی بەم مەسەلەیە نەکردووە، زۆر بە داخەوە، نە ئەویش و نە (داریوشی شایگان)یش کە هەردووکیان رۆشنبیر و بیریار و فەیلەسوفیکی گەورەن دەرکی ئەم مەسەلەیان نەکردووە، کە ئەم ئەزموونە گەورەیە لە تورکیا بوونی هەبووە، ئەو ئەزموونەی کە لە سەردەمی بە مۆدێرنە کردنی تورکیادا ژیاوە، ئەو رۆژانەی کە بە زۆر و لەژێر فشاردا ویستویانە خەڵکی بخەنە ناو مۆدێرنەوە، بەزۆر تەربووشیان بەسەر خەڵکیەوە لابردووە و شەبقەی بیانیان لەسەرکردوون، (نوورسی) تەنها کەسێك بووە کە ئامادە نەبووە شەبقەی سەردەمی نوێ بکاتە سەری، (نوورسی) کەسایەتیەکی سەردەمی پێش مۆدێرنە و لە سەردەمی نوێدا حزوری هەیە، تەنانەت ئامادە نەبووە تا ساڵی پەنجاکانیش پیتی لاتینی – کە بە زۆر بەسەر هەموو کەسێکدا سەپێنراوە– لە نووسینەکانیدا بەکاربهێنێت و رازی نەبووە (پەیامەکانی نوور)یش بە پیتی لاتینی بنووسرێتەوە{٥٩}، هەتا دوای ساڵی پەنجاکان بڕیاری ئەوە دەدات کە پەیامەکانی لە لایەن قوتابیەکانیەوە بە پیتی نوێش چاپ بکرێن بۆ ئەوەی لاوە تازەکان سوودی لێببینن، پیاوێك کاتێك کە پێی دەڵێن تۆ بۆ ریش دەتاشیت؟ (لە کاتێکدا لە دیاردەکانی سەردەمی پێش مۆدێرنە هێشتنەوەی ریشە) ئەویش لە وەڵامدا بەو بەڕێوەبەرە پۆلیسەی کە ئەو پرسیارەی

لێدەکات دەڵێت: لەبەر غیرەتم دەیتاشم! ئەگەر من ریش بهێڵمەوە لەبەر سوونەتی پێغەمبەرە – د.خ– ئیدی ئەگەر ئێوە بە زۆر بۆم بتاشن لە غیرەتدا دەمرم{٦٠}!..مرۆڤی سەردەمی نوێ وانیە، تەعبیری (لە غیرەتدا دەمرم) هی مرۆڤێکە کە کەسایەتی سەردەمی پێش مۆدێرنەی هەیە، بۆیە دەفەرموێت لەبەر غیرەتم ریش ناهێڵمەوە، ئەوکات ئەگەر مردم ئەی کێ بەرگری لە (ئیمان) بکات کێ (پەیامەکانی نوور) بگەیەنێت{٦١}.

بێجگە لەوە (سەعید نوورسی) موفەسیری قورئان بووە، بەڵام موفەسیرێك نەبووە کە تەدوینی کردبێت، کە بەراوردێکی بەلەزەتە ئەگەر بەراورد بکەین لەنێوان (سەعید نوورسی) وەك مەلایەکی کورد و کەسێکی وەکو مامۆستا (مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس)دا – کە بە نیازم لە داهاتوودا کار لەسەر نووسینەکانی (مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس) بکەم– (مامۆستا عەبدولکەریم) گوازەرەوەی کلتوری کوردیە لە وتنەوە بۆ نووسین، کە بە بۆچوونی من (مەلا عەبدولکەریم) لە نووسینەوەی کلتور و ئەدەبیاتی کوردیدا زۆرترین بەشی بەردەکەوێت، بۆیە مامۆستا (مەلا عەبدولکەریم) موفەسیرێکی نووسەر بووە، بەڵام (نوورسی) تەفسیرێکی شهودیانە)ی بۆ قورئان کردووە، وەك خۆی دەڵێت ئەوەی من دەیڵێم تەنها نوورێکە لە تیشکە نوورینەکانی قورئان و واتە ئەویش هەر تەفسیری کردووە بەڵام تەفسیری ئەو تەفسیرێکی رۆحانیە، تەفسیرێك وەك ئەو چیرۆکەی لای (مەولانای رۆمی)یە، کە کەسێك خوێنەر و موفەسیری قورئانە بەبێ دووبارە کردنەوە و وتنەوەی ئایەتەکان، بەڵکو ئاماژەکانی ئایەتەکانی گرتووە و بەوان تەفسیری کردووە، (نوورسی) بەو مانایە مەعریفەی زۆر نەبووە وەك ئەوەی ناسراو بووە بە مەعریفە (مەبەستم داهێنانی مەعریفیە)، بە بۆچوونی من ئەزموونی رۆحی گەورە بووە، مەعریفەی تەوزیف کردۆتەوە بە زمانی خۆی ئەو بەرزەخێکی لە نێوان (عەقڵ) و (قەلب)دا دۆزیوەتەوە{٦٢}.

### نوورسی و مەحوی:

ئەگەر نموونەیەك بهێنینەوە لەناو کورددا و نزیك بێت لە نموونەی (سەعید نوورسی) و لە سەردەمی نوێدا ژیا بێت رەنگە (مەحوی) بێت، (مەحوی)ش ئەگەر چی لە سەردەمی نوێدا ژیاوە، بەڵام ئەو بە رۆح لە سەردەمی پێش مۆدێرنەدایە،

باسی سەردەمی نوێ لە شیعرەکانی (مەحوی)دا حزوری نیە، لەناو جیهانی ڕۆحدایە، ئەزموون و سلوکی ڕۆحیە، عروج کردنی ڕۆحیەتی بۆ ئاسمان و بۆ بەردەم پێغەمبەری خودا (د.خ)، ئەگەر چی لە سەردەمی نوێدا بووە بەڵام لەناو خانەقادا ژیاوە، (سەعیّد نورسی)ش لە دابڕان و تەنیاییدا ژیاوە و لە سەردەمی نوێ بڕاوە، بەڵام جیاوازی نێوانیان ئەوەیە کە (نوورسی) لە تەمەنی پێش چلوپێنج ساڵیەوە باش زانستەکانی سەردەمی نوێی ناسیوەو وەریگرتوون، دووایی کە ئینعیزال دەکات، دوای ئەوەی کە دەبڕێت لە کۆمەڵگە و یەکلایی دەبێتەوە بۆ ئەزموونی ئیمانی و عیرفانی خۆی، مەعریفەکەی سەردەمی پێشتری تەوزیف دەکاتەوە، بەڵام (مەحوی) ئەوەی نیە، هەمووی هەر هی سەردەمی پێش مۆدێرنەیە{٦٤}، بەڵام (نوورسی) کە دەچێتە ناو ئەزموونی ڕۆحیەوە، ڕۆشنبیریە دەرەوە دینیەکەی خۆی بەکار دەباتەوە، هەر بۆ نموونە ئەگەر بەراوردێك بکەین لە نێوان ڕۆشنبیری دینی وەکو ئێمە لەم سەردەمەدا لەگەڵ کەسێکی وەکو (سەعید نوورسی) و (ناصری سوبحانی) و (کاك ئەحمەدی موفتیزادە)دا، هەست دەکەیت بە نموونە خۆم هەرچەندە هێشتا نەگەیشتوومەتە سەر ئەوەی ئەزموونی تایبەتی خۆم ببێت بەو مانایە — لە مەعریفە و خوێندنی دینیەوە بەرەو مەعریفەی گشتی و دەرەوەی دین (نەدژە دینی) هاتووم، واتە لە سەرەتاوە خوێندنی حوجرە و ئەزموونی دینی و دواتر ڕۆشنبیری دیکە و خوێندنەوەی فیکر و فەلسەفە و..ئەوانە، بەڵام هەست دەکەیت ئەزموونی ئەو کەسایەتیانە پێچەوانەی ئەمەن. بۆ نموونە گەر سەیری (کاك ئەحمەدی موفتیزادە) بکەیت، دەبینیت مەعریفەیەکی زۆر فراوانی هەیە، ئاگای لە زانستی کۆمەڵناسی و زانستە دەروونیەکان و ئەوانی دیکە هەیە، هەروەها (مامۆستا ناصر)یش بە هەمان شێوە، بە تایبەتی لە بابەتی (سیستەمی ئابووری)یەکەی بۆت دەردەکەوێت کە ئاگاداری سیستەمە ئابووری و سیاسیەکانی دیکەش هەیە، کە باسی دیموکراسیەت دەکات، باسی نازیەت و فاشیەت دەکات، واتە دەبینی کە ڕۆشبیریەکەی فراوانی (دەرەوە دینی) هەبووە، (سەعید نوورسی)ش بە هەمان شێوە، بێجگە لە خوێندنی حوجرەی خۆی ڕۆشنبیریەکی فراوانی فیزیا و کیمیا و زانستەکانی سەردەمی خۆی هەبووە، کە خۆی دەیگێڕێتەوە لەو سەردەمەدا دەربارەی فەلسەفەی ماددیەت چەندین سەعات گفتوگۆی لەگەڵ فەیلەسوفە ماددیەکاندا کردووە بە ڕۆشنبیری خۆیان، هەروەکو چۆن (کاك ئەحمەد)یش لە

یەکێك لە نووسینەکانیدا ئاماژە بەوە دەکات کە ئەویش لە سەرەتاوە لەگەڵ چەپەکاندا جار بووە بیست و چوار کاتژمێر لەگەڵیاندا دانیشتووە و گفتوگۆی لەگەڵدا کردوون، بەڵام دوایی پەشیمان بۆتەوە چونکە ئەوە وەك خۆی دەڵێت ئەزموونێکی رۆحی لە پشتەوە نەبووە، بەڵام دوایی هەرسێ ئەزموونەکە لە دەرەوەی دینەوە یەکلایی بوونەتەوە بۆ بابەتە دینیەکان، واتە جیاوازی نێوان (مامۆستا ناصری قورئانی) لەگەڵ (مامۆستا ناصری پێش قورئانی) لەم نوکتەیەدایە، بەو مانایەی پێشتر رۆشنبیری دەرەوە قورئانیشی تەوزیف کردووە بۆ پیشاندانی بابەتە دینیەکان و حاڵی بوون لە دین، بەڵام ئەم رۆشنبیریە دەرەوە دینیەی دوای ئەوەی کە بە تەواوی یەکلایی بۆتەوە ئیتر تەواو لەگەڵ (قورئان) ژیاوە، ئەوا لە نەستی - لاشعور-دا کاریگەری لەسەر مامەڵە قورئانیەکەی هەبووە، نەك ئەوەی راست بڕوات بخوێنێتەوە، هەروەها (کاك ئەحمەدی موفتیزادە)ش دوای ساڵی (٤٣)ی هەتاوی بەدواوە و دوای زیندانیکردنی و یەکلایی بوونەوەی بۆ ئەزموونی رۆحییە تایبەتەکەی، ئەوا رۆشنبیریە دەرەوە دینیەکەی ناڕاستەوخۆ لە نەستیدا کاریگەری لەسەر مامەڵەکردنی هەبووە لەگەڵ (دین)دا، هەروەها (سەعید نوورسی)ش بەهەمان شێوە مەعریفەی پێش سەردەمی (سەعیدی نوێ)ی لە سەردەمی (سەعیدی نوێ)دا ناڕاستەخۆ کاریگەری لەسەری هەیە، واتە هیچ مەعریفەیەکی زیاد نەکردووە لە سەردەمی نوێدا، بەڵام ئەزموونی رۆحی بۆ زیاد کردووە، بەرزەخەکەی نێوان (عەقڵ) و (قەلب) ئەوەی کە خۆی باسی دەکات، لێرەوە ئەمەش لێکچوونێکە لە نێوان (نورسی و سوبحانی و موفتیزادە)دا، بەڵام ئەوەندەی تا ئێستا من دیراسەم کردبێت ئەزموونەکەی (سەعید نوورسی) لە ئەزموونی (مامۆستا ناصر)یش و (کاك ئەحمەد)یش کامڵترە، جارێ ئەوە بڵێم کە ئەزموونێك بووە بە ئیختیاری خۆی هەڵیبژاردووە، بەڵام (کاك ئەحمەد) ناچار بە زیندان کراوە، خۆ بە خۆشی خۆی نەچۆتە زیندانەوە، هەروەها (مامۆستا ناصر)یش، لە تەمەنێکی کەمدا توانیویەتی بگاتە ئەو کەماڵە، بەڵام کەماڵێکی مەعریفی بووە نەك کەماڵێکی رۆحی {٦٥}، بەڵام (نوورسی) دوای بڕینی قۆناغی مەعریفەیە دەگاتە کەماڵی رۆحی، پیرێکی هەشتا ساڵەیە کە جەستەی زۆر لاواز بووە خۆی دەڵێت - کە زۆری بۆ دەهێنن و پاسەوانەکانی لە زینداندا ئازاری دەدەن- پیرێکی نەخۆش{٦٦} بەڵام دونیایەك ئەزمووی رۆحی هەبوود. ئەزموونی

(نوورسی) بە بۆچوونی من -- کە ئەمە خوێندنەوەیەکی مەعریفیە نەڕۆحی- لە ئەزموونی هەردوو مامۆستایانی دیکە (سوبحانی و موفتیزادە)کامڵترە، ئەگەر چی کایەی کار کردنی هەرکامیان جیاوازە، کایەی (مامۆستا ناصر) فیقه و ئوسوڵی فیقهە، کایەی (موفتیزادە) یاریکردنە لە نێوان (زەین) و (قەلب)دا فەلسەفەی کلاسیکە لەگەڵ مامەڵەی رۆحیدا، بەڵام ئەزموونی (نوورسی) ئەزموونێکە کامڵترە بە حوکمی ئەوەی هەم جیهانی پێش مۆدێرنەی بینیوە، لەو جیهانەدا لە لوتکەدا بووە و سەرۆکی هەموو هێزە خۆبەخشە کوردەکان بووە کە لەگەڵ دەوڵەتی روسیادا شەڕیان کردووە، تەنانەت یەکێك لە پیاوە ناودارەکانی دەوڵەتی عوسمانی بووە کە پارە و زێڕی زۆریان بۆ بڕیوەتەوە و دوایی هەمووی بەخشیوەتەوە، دواتریش ئەو هەموو ئەزموونە جۆراوجۆرانەی لە جەنگی یەکەم و دووەمی جیهانیدا بینیویەتی و ئەو هەموو ئاگاییەی کە بەسەر مەعریفەی ئەوکاتەدا بوویەتی، ئەو مەعریفەیەی کە راستەوخۆ و بە ویست هەوڵدراوە بهێنرێتە دەوڵەتی عوسمانیەوە و ئەو ئیستیعابی هەموو ئەوەی کردووە، تەنانەت ئەوەندە ناودار بووە کە (کەمال ئەتاتورك) تکای لێ کردووە کە بێت لە پەرلەمانی ئەوکاتەی تورکیا قسە بۆ ئەوانە بکات کە شۆڕشیان کردووە و لە ئەستەمبوڵ جیابوونەتەوە{٦٧}، بۆیە بە بۆچوونی من ئەزموونی (نوورسی) لە ئەزموونی (سوبحانی وموفتیزادە)ش کامڵترە و لەمەعریفەوە گەیشتۆتە کامڵی رۆح، کە دواتر باسیان لێدەکەین.

## تایبەتمەندیەکانی جیهانی نوورسی:

لێرەوە دەکرێت باس لە تایبەتمەندیەکانی جیهانی (نوورسی) بکەین، تایبەتمەندیەکانی (نوورسی) تایبەتمەندی جیهانی پێش مۆدێرنەن، کە زیاد لە سەرچاوەیەکی هەیە، جیهانێکی فراوانترە، جیهانێکە تەنها مامەڵە لەگەڵ (عەقڵ)دا ناکات -- عەقڵی تەجزیئی- بەڵکو ئەزموون کەمترین مامەڵەیەتی، مامەڵە لەگەڵ (شهود)دا دەکات، مامەڵە لەگەڵ (نەقڵ)دا دەکات، مامەڵە لەگەڵ (ئەزموونی رۆحی)دا دەکات، جیهانێکە کە سوود لە هەموو بوون دەبینێت نەك نموونەیەك لە بوون وەربگرێت، لە هەمان کاتدا لەگەڵ ئاسمان، لەگەڵ زەوی، لەگەڵ فریشتە مامەڵە دەکات، کە یەکێك لە پەیامەکانی (نوور) باسی فریشتەکانە{٦٨}، یان بڵێین تایبەتمەندترین تایبەتمەندی مامۆستا (نوورسی) بریتیە لەوەی کە ئەزموونێکی

عیرفانی هەیە، نەك فیقهی، نە فەلسەفیش، ئەگەرچی چرکە ساتی فیقهی و فەلسەفیش لە پەیامەکانیدا هەیە، بە تایبەتی کاتێك کە وەڵامی فەلسەفەی ماددی دەداتەوە زۆر پشت دەبەستێت بە فەلسەفەی کلاسیکی ئیسلامی کە پێشتریش ئاماژەمان پێکرد، بە تایبەتی سێ زاراوەی (مومکین، موستەحیل، واجب)، ئەو بابەتانەی کە بڕبڕەی پشتی زانستی کەلامی کۆنە، (نوورسی) زۆر بلیمەتانە و ژیرانە ئەوە دووبارە دەکاتەوە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا خۆی ئاماژە بەوە دەکات لە کاتێکدا کە باسی (زمخشەری) دەکات، (کە یەکێك لە گەورەترین ناودارەکانی ئەهلی ئیعتیزالە) ئەو سەرسوڕمانی خۆی پیشان دەدات باشە (زمخشەریەکی موعتەزیلە) بۆ خەڵکی ئەوەندە خۆشیان دەوێت؟ بۆ ئەوەندە لەناو موسڵمانەکاندا مەعروفە؟ بۆچی (تەفسیری کەششاف) لە زۆربەی ماڵەکاندا ئەو ماڵانەی کە رۆشنبیری دینییان هەیە بوونی هەیە؟ ئەو کە پیاوێکی موعتەزیلە بووە دەبوایە لای ئەهلی سوننە وانەبوایە! لێرەدایە باسی ئەوەدەکات کە ئەوە لایەنە عەقڵیەکەی زمەخشەری نیە کە زمەخشەری خۆشەویست کردووە! ئەوە لایەنە قەلبی و رۆحیەکەیەتی، ئەو حوببەی کە هەیبووە بۆ (خودا) و بۆ پێغەمبەر (د.خ) ئەمەش کە جارێکی دیکە دەچێتە ناو عالەمی عیرفانەوە{٦٩}، کەواتە تایبەتمەندترین خەسڵەتی (نوورسی) بریتیە لە عریف بوونی، بە بۆچوونی من ئەمە ئەوە دەهێنێت کە سەدان کاتژمێر قسەی لەسەر بکریت، کە ئەزموونی عیرفانی ئەو پیاوە ئەوەندە گەورەیە، وەکو چۆن عارفە گەورەکان شانامە و کتێبی عیرفانی گەورەیان پیشانی مرۆڤایەتی داوە، یان ملێن ئەدەبیاتی گەورەیان دروست کردووە، ئەدەبیات بە مانا عیرفانیە قووڵەکەی، ئەو (سەعید نوورسی)ش لە (پەیامەکانی نوور)دا دروستی کردووە، بۆیە مرۆڤ و ئەدیبی گەورە کاتێك کە پەیامەکانی نوور دەخوێنێتەوە لێیان بێتاقەت نابێت ئەگەر چی زۆر و زەبەنەن، بەڵام بە مەرجێك دەرکی ئەوە بکات کە ئەمە ریسالەیەکی رۆحیە، هەر بەوەش (سەعید نوورسی) شەڕی خۆی دژی شارستانیەتی نوێ کردووە کە ئەوەش بە نهێنی کەمهێنانی شارستانیەتی نوێی زانیوە، بۆیە دەیەوێت (بەرگری لە ئیمان) بکات و ئەزموونە رۆحیەکەی ناودەنێت (بەرگریکردن لە ئیمان){٧٠}، دەزانێت کە ئەوە ئیمانە کەمی هێناوە نە تەکنەلۆژیا، ئیمان لای (نوورسی) تەنها (ئیعتیقاد) نیە بەو مانایەی کە زانستی کەلام بێت ئەزموونی ئیمانیە، ئەزموونی رۆحیە، بۆیە (نوورسی) هەرخۆی بە تەواوی ئەزمونێکی رۆحی بووە، (نوورسی)

نەیویستووە (فەقیه) بێت، ئەگەرچی وەکو فەقیهەکان توانیویەتی ئیجتیهاد بکات، بۆ نموونە ئەگەر (پەیامی ئیجتیهاد) بخوێنینەوە، ئەو چەندین بەڵگە دەهێنێتەوە لەسەر ئەوەی لەم سەردەمەدا ناکرێت ئیجتیهاد بکرێت{٧١}، لەبەر ئەوەی ئیجتیهاد لەناو شارستانیەتێکدا دەکرێت کە تیایدا (ئیمان) لە لوتکەدا بێت، یاخود بناغەی سەرەکی ئیجتیهاد بریتیە لە ئەزموونی ئیمانی و رۆحی کە ئەگەر لەم سەردەمەدا ئەو ئەزموونە نەمابێت ئیدی ئەگەر ئیجتیهادێکیش بکەیت جێی خۆی ناگرێت، دەکرێتە وەسیلە بۆ خراپەکاری و شتی دیکە، لەبەر ئەوە (نوورسی) بە پێویستی نابینێت لەم سەردەمەدا ئیجتیهاد بکرێت، واتە بە پێویستی نازانێت خۆی خەریکی (فیقه) بکات، ئەگەرچی لە زۆربەی پەیامەکانیدا باسی (اصولی فیقه) و زاراوەی فیقهی کراون، بەڵام (سەعید نوورسی) کەسێك بووە نەیویستووە (فەقیه) بێت و هەروەها نەشیویستووە (فەیلەسوف) بێت، کە ئەمەش یەکێکە لە تایبەتمەندیەکانی.

## نوورسی و نەتەوایەتی:

یەکێکی دیکە لە تایبەتمەندیەکانی (نوورسی) لە مەسەلەی نەتەوایەتیدا دەردەکەوێت، تەنانەت مامەڵەی ئەو لەگەڵ مەسەلەی نەتەوایەتیشدا مامەڵەیەکی عیرفانی بووە، بەو مانایەی کە مامەڵەیەکی سۆسیۆلۆژی و مێژوویی نەبووە، نەتەوە لای ئەو بەو مانایە نیە کە لە سەردەمی نوێدا بوونی هەیە، (نوورسی) ویستوویەتی بە بەڵگە و ئەزموونی عیرفانی خۆی بەرگری لە مەسەلەی نەتەوایەتی و بابەتە کوردیەکان و..ئەو شتانە بکات نە بە ئایدۆلۆژیاکردنی نەتەوە کە ئەو ئەمە بە یەکێك لە نەخۆشیەکانی سەردەمی نوێی دەبینێت{٧٢}.

لە راستیدا نوکتەیەك لای (سەعید نوورسی) هەیە و من زۆر سەرم سوڕماوە پێی بریتیە لەوەی کە ئەو چۆن توانیویەتی لە سەردەمێکدا کە سەردەمی نوێیە و سەردەمی نوێش بەبێ ئەوەی کە بەخۆت بزانیت داگیرت دەکات، لە ئەزموونی رۆحیت دەخات، چونکە بەردەوام دەتهێنێتەوە رووکەش، واتە تەنیات دەکاتەوە (بە زاراوەی (فرۆم) لە یەقینت دەکات بە زاراوەی (سروش))، بەو مانایەی لە (شهود)ت دەخات، لە (عەقڵ)ت دەخات، عەقڵە میتافیزیکیە گەردوونیەکە، لە (نەقڵ)ت دەخات، تەنها بچووکت دەکاتەوە بۆ (ئەزموون) – کارمەندێکی تاقیگە– باشە

کەسێکی وەکو (نوورسی) لە سەردەمێکی ئاواهیدا چۆن توانیویەتی نوێنەرایەتی (عیرفان) بکات؟ چۆن توانیویەتی ببێتە کۆتا (عاریف) کە بە بۆچوونی من گەورەترین تایبەتمەندی (نوورسی) لەو نوکتەدایە، کەسێکی دیکە نەبووە بتوانێت ئەوە بکات، بەڵکو هەتا ئێستاش ئێمە بیریاری ئیسلامیمان هەیە، سەرۆك و رابەری ئیسلامیمان هەبووە، بزوتنەوەی ئیسلامیەکان دروست بوون، بەڵام کەسێك نەبووە وەکو (نوورسی) عاریف بێت، کە بە خۆگرتنەوە، ئاخر سەردەمی نوێ لێت نابوورێت، وازت لێناهێنێت بۆ خۆت بژیت، چی هەیە دەیهێنێتە ناو دونیای تۆوە لە رێگەیەك لە رێگەکانەوە یان دەیبینیت یان دەیبیستیت یان بیری لێدەکەیتەوە لە سەردەمی نوێدا، ئەو کەسێك بوو ئەوەندە رۆحێکی گەورەی هەبوو ئەگەر چی سەردەمی نوێی دەبینی ئەگەر چی سەردەمی نوێی دەبیست و بیریشی لە سەردەمی نوێ دەکردەوە، ئەو بزوتنەوە دژە دینیە ماددییەی کە هاتبووە دەوڵەتی تورکیاوە و ئەو خۆی بە گەورەترین بەرگریکاری ئەو بابەتە دەزانی، تەنها کەسێك بوو، نەدەوڵەتێك. نەبزوتنەوەیەك، کە خۆی بە بەرگریکاری ئەوە دەبینی، چۆن توانی ئەوە بکات؟! بە راستی ئەو ئەزموونەشی بە سەرکەوتوویی تەواوکرد، ئەو ئەزموونە بە بۆچوونی من گەیشتە کەماڵی خۆی، تەنانەت وەکو کەسێکی عاریف پێشبینی مردنی خۆی کرد لە کۆتاییدا{٧٣}، وەك ئەوەی ئەم پیاوە لە سەردەمی خۆیدا ئەوەندە رۆحێکی گەورە بووە — بەبێ تەشبیه— لەگەڵ ئەزموونی نبووەتی پێغەمبەری خودادا، چونکە دواجار ئەم هەرچیەك بێت ویلایەتە، بەڵام ئەو (نبووەت)ە، ئەگەر (نبووەت) ملیۆنێك بەشی ببێت، (ویلایەت) ناگاتە یەکێك لەو ملیۆنە، چونکە ئەزموونی نبووەت دوای هاتنی پێغەمبەری خودا کۆتایی هات، بچوکترین ئاماژەیەك لە نبووەتدا مابێتەوە بریتی بووە لە خەوبینین وەکو ئەوەی کە لە فەرموودەی پێغەمبەری خودادا هاتووە (د.خ) ئیتر دوای ئەوە وەلیەکان هاتوون، عاریفەکان هاتوون نەپێغەمبەرەکان، جا ئەم عاریفە گەورەیە بە تەنها و لە سەردەمێکی ئاواهیدا رۆحێکی ئەوەندە گەورە بووە کە (کان امه)، توانیویەتی لە سەردەمی بوغرا بوونی مۆدێرنەشدا ئەم ئەزموونەی ببێت، ئاخر بوغرا بوونی مۆدێرنە زۆرتر لە تورکیادا دەرکەوتووە، کە خەڵکی وایان بینیوە بە (عەقڵ) و (زانست)ی مۆدێرنە هەموو گرفتەکانی خۆیان چارەسەر دەکەن.

(کەمال تەتاتورك) تەنانەت رووکەشی ژیانی ئەو سەردەمەی گۆڕیوە، سەدان کەسی لەسەر شەبقە لەسەرکردن لە سێدارە داوە! باشە لە سەردەمێکی ئاواهیدا رۆحێك بتوانێت ئەوەندە گەورە بێت کە ئەوەتا ئێمە دوای سەدساڵ لەبەردەم ئەو سەردەمەدا حەپەساوین و دەمانەوێت لەگەڵی بێینەوە (نەئەوەی قوتی بدەین لە خۆماندا)، بەڵام رۆحێکی گەورەی وەکو (نوورسی) هەموو ئەو سەردەمەی لەناو خۆیدا قووتداوە،! کە توانای ئیستیعابکردنی هەموو ئەوەی هەبووە، کە (کەمال ئەتاتورك) (حەداسەویەکانی) سەردەمی ئەو هێناویانە، کەچی ئەزموونی رۆحی خۆیشی پاراستووە، بزانە چەند ئەزموونێکی گەورە بووە!.

سەیر لەوەدایە شێخێکیش نەبووە کە رێگەی پیشان بدات بۆ ئەمە، واتە گەیشتۆتە ئەوەی ئەگەر شوێن زنجیرەی شێخەکانیش بکەوێت (وەکو چۆن لە مەلایەتیدا ئیجازەی مەلایەتیمان هەیە، لە ویلایەتیشدا ئەو بابەتەمان هەیە) دواجار مەبەستەکە چوونە خزمەتی قورئانە، بەو مانایەی (نوورسی) لەوە گەیشتووە کە هەموویان لە کۆتاییدا دەچنەوە سەر (قورئان) بۆیە راستەوخۆ چوتە حرمەت (قورئان)، تەنانەت ئەگەرچی کەسایەتیەکی وەك (شێخ عەبدولقادری گەیلانی) زور خۆشەویستووە، کەسایەتیەکی وەکو (ئیمامی رەببانی و ئیمامی عەرەبی) زور خۆشویستووە، کەچی ئەوان وەکو مامۆستای خۆی مامەڵەیان لەگەڵ ناکات بەڵکو وەکو ئەزموونێك سوودیان لێدەبینێت، تەنانەت ئەوکاتەش کە ئەوەندە موعجەب بووە بە کەسایەتی (مەولانا) و کتێبێکی ناوناوە (مەسنەوی) بە خوشەویستی ئەوەوە، لەگەڵ ئەوەشدا بە مامۆستای خۆی نەزانیوە، بێگومان ئەمەش دوور لەخۆبەگەورە بینینەوە، چونکە (سەعید نوورسی) بەردەوام باس لە لاوازی و هەژاری خۆی دەکات، باس لە بێ دەسەڵاتی خۆی دەکات هەر ئەوەش وەسیلەی عیرفانی بووە، واتە دەشێت بڵێین، ئەگەر ئێمە دووجۆر لە عیرفانی ئیسلامیمان ببێت کە ئەمە (ئیمامی غەزالی) و ئەزموونەکەی، کە بریتیە لە ئەزموونی زوهدی لەگەڵ عیرفان و ئەزموونی عیشقی{٧٤}، ئەوا دەتوانین ئەو عیرفانەی (نورسی) بە بەرزەخێك دابنێین لە نێوان ئەو دووانەدا، نەعیرفانێکی عیشقیە بەو مانایەی کە هەمووی باسی عیشق و بەرچنینەوە بێت، کە عیشق چی دەکات بە مرۆڤ، عیشق تاڵیت لێدەکاتە شیرینی...هتد، وەك ئەوەی لە شیعرەکانی (مەولانا)دا هاتووە، ئەم بە شوێن بەرەکانی عیشقەوە نەبووە، بەڵام ساتەکانی عیشقی و ئیکسیری بوون

(وجود) کە لە یەکێك لە پەیامەکانیدا باسی دەکات و ناوی دەنێت (محبة المحبة) بوونی هەیە کە ئەمەشی لە عیرفانی عیشقیەوە وەرگرتووە، بەڵام لەولاوە کە باسی فەقر و زوهدی خۆی دەکات و لەوێوە تەقە لە دەرگای رەحمەتی خودا دەدات، ئەوەش عیرفانێکی زوهدیە، بەڵام لە زوهدیش قووڵترە، چونکە زوهد بریتیە لەوەی کە مرۆڤە کە زاهیدە و واز لە دونیا دەهێنێت، بەڵام ئاتاج بوون لای (سەعید نوورسی) لەودیو زوهدیشەوەیە، واتە کەنهو جەوهەری مرۆڤە ئاتاجە نەئەوەی مرۆڤ واز لە پێویستیە ماددی و دونیاییەکانی خۆی بهێنێت، وادەزانم ئەم جیاوازیە بە موویەکی باریکترە و مانایەکی قووڵتری هەیە لە زوهدی زاهیدان، بەو مانایەی کە هەر بوونی مرۆڤ و ماهیەتەکەی بۆ خۆی ئاتاجە نە ئەوەی خۆی وەکو ئاتاج پیشان بدات، نەئەوەی زاهید بێت و واز لە دونیا بهێنێت، ئاخر بۆ نموونە (ئیمامی غەزالی) پشتی لە دونیا کردووە، ئەوە پشتی لە دونیا کردووە، بەڵام (سەعید نوورسی) هەر خودی خۆی ئاتاجە، هەر خۆی لاوازە، ئەوە هیچ کە دەبێت واز لە دونیا بهێنێت، تەنانەت ئەوەندە وازی لە دونیا هێناوە کە ئەو برە پارەیەی لە پێش جەنگی جیهانی یەکەمدا وەك موچەیەك لە (دارالحكمة) وەریگرتووە هەتا کۆتایی تەمەنی بەو برە پارەیە ژیاوە، لە دوای ئەوە ئیتر یەك دیناری لە دەوڵەتەکەی (کەمال ئەتاتورك) وەرنەگرتووە{٧٧} ! ئەوەندە زاهید بووە! ئەگەر مرۆڤ پەیامی ئابووریەکەی بخوێنێتەوە ئینجا تێدەگات ئەم پیاوە چ عاریفێکی گەورە بووە، کە چۆن توانیویەتی لە سەردەمێکدا کە بە سەردەمی بەکاربردن – ئیستیهلاك– ناسراوە، سەردەمێك کە تێیدا زوو زوو مۆدیلەکان و شتەکان دەگۆڕێن، بەو برە پارەیە کە کاتی خۆی لە دەوڵەتی عوسمانی وەرگرتووە، هەتا کۆتایی تەمەنی بەشی بکات لەگەڵ ئەوەشدا کە بەردەوام خێری لێکردووە و بەشی خەڵکی لێداوە و تەنانەت بەشی مێروولەشی لێداوە{٧٨}، عاریفێك بەو گەورەییە، ئێمە کە بکوژی بوونەوەرین، مرۆڤی مۆدێرنە مرۆڤێکە کە بوون دەگۆڕێت، ئەو لە سەردەمێکی ئاواهیدا هاوڕێی سروشت و گیاندارەکان بووە، تەنانەت لەو سەفەرەدا کە گەڕاوەتەوە لە روسیا لەگەڵ شێرەکان لەگەڵ دڕندەکاندا بۆتە هاوڕێ و نەترساوە لێیان{٧٩}، تەنانەت لە کاتێکدا کە لە ژوورێکدا یان لە شوێنێکدا دانیشتووە و هێلانە مێروولەیەك کە لەگەڵیدا بووە لەو خواردنەی کە پێی بووە بەشی ئەوانیشی لێداوە، ئەمە ئەزموونێکی عیرفانی گەورەیە کە من ئەوسا قەدری ئەو شتانەم

نەدەزانی، ئەمەم وەکو چیرۆك بیستووە، یان ئەو چرکەساتە رۆحیانەی کە لای (نوورسی) هەبووە، یەکێك لە قوتابیەکانی خۆی ناوی (حەبیب) بووە و لە لادێیەکی دیکەوە کە قەدەغە بووە (نوورسی) کەسی لابێت، شەوانە خواردنی بۆ بردووە لەگەڵ نوێژی بەیانیدا، جارێك کە دەڕوات مانگەشەو دەبێت لێی تێکدەچێت پێش نوێژ دەڕوات بۆ لای مامۆستا (نوورسی) کە لەوکاتەدا خەریکی (نەجوا)کردنە، حەبیب قسەی لەگەڵدا دەکات، بەلام ئەو وەڵامی ناداتەوە، واتە راز و نیازەکەی خۆی وازلێناهێنێت، دوای ئەوەی کە تەواو دەبێت دەڵێت ئەی حەبیب تۆ نازانی من لەگەڵ حەبیبێکدا قسە دەکەم کە تەنانەت رازی نیم حەبیبێکی وەك تۆش بێتە نێوانمان، بێگومان ئەو قوتابیەی زۆر خۆش ویستوە، ئەو پەیوەندیە رۆحیانەی کە (نوورسی) لەگەڵ قوتابیەکانیدا بوویەتی کە بچووکترین ئەرکی بۆ دروست نەکردوون. ئەم هەڵوێستەی (نوورسی) بەراورد بکە لەگەڵ ئەو هەڵوێستەی (مەولانا)دا کاتێك کە بانگ دراوە یەکسەر هەڵساوەتەوە، واتە ئەو پەیوەندیە رۆحیەی کە لەگەڵ پێغەمبەری خوادا (د.خ) بوویەتی کاتێك ناوی حەزرەتیان بردووە ئیتر ئەو خۆی نەگرتووە و پێیەکانی بەرزیان کردۆتەوە، تەنانەت (نوورسی) دوای قوتار بوونی لەو فیتنەیەی کە لە سەری بووە هاتنە دەرەوەی لە زیندان و گەڕانەوەی بۆ ئەو شوێنەی کە بۆ یەکەمجار تیایدا زیندانی کراوە و دوورخراوەتەوە، لەوێ رازی نابێت هیچکام لە قوتابیەکانی و ئەو خۆشەویستانەی کە لەگەڵیان بچنە ژوورەوە لەگەڵیدا، بەڵکو خۆی تەنها دەڕواتە ژوورەوە دەنگی گریانی ئەوان لە دەرەوە دەگریەنێت، ئەمە ئەزموونێکی رۆحی گەورەیە کە بە بۆچوونی من ناکرێت کەسێکی دیکە بەراورد بکەین بە ئەو لەو بابەتەدا کە لە سەردەمی نوێدا بتوانێت وا بژی، بە راستی ئەمەیە کە جێی شانازی ئێمەی کوردە، با باسی بابەتە (نەتەوایەتی)یەکە بکەینەوە، تەنانەت مامەڵەی ئەو لەگەڵ بابەتە نەتەوەیەکاندا مامەڵەیەکی عیرفانی بووە.

کاتێك (حسین پاشا) کە یەکێك لە سەرەك عەشیرەتەکانە و زۆربەی سوارەکانی شۆڕشی (شێخ سەعیدی پیران) لەگەڵ ئەودا بوون، دەچێت سەر لە مامۆستا (نوورسی) دەدات بۆ ئەوەی فەتوای شۆڕشی لێ وەربگرێت، کە (شێخ سەعید) مەبەستی ئەوە بوو دەوڵەتێکی نەتەوەیی ئیسلامی دروست بکات کە ئەوەش یەکێك لە ئەزموونەکان و ئەمڕۆ قسەی لەسەر دەکرێت و بە تایبەت لای بزوتنەوە ئیسلامیەکان و بە دیاریکراوی لە کوردستاندا کە دەوڵەتێکی کوردی نەتەوەیی بوونی

نیە و دەویسترێت دەوڵەتی نەتەوەیی بەلام بە رۆحی ئیسلامیەوە دروست بکرێت، زۆرێك لە رۆشنبیرەکان لەسەریان نووسیوە، مامۆستا (نوورسی) تەنانەت بەوەش رازی نابێت، ئەو (حسێن پاشا)یەی کە بە منداڵی بەیەکەوە بوون و لە حوجرەدا خوێندوویانە، داوا لە (نوورسی) دەکات فەتوای بۆ بدات، بەلام ئەو فەتوای بۆ نادات و لەو کاتەدا دیوانی (مەلای جزیری) لە باخەڵیدا دەبێت – یەکێك لەو شتانەی کە کەمترین ئاماژەی پێکراوە ئەوەیە کە (نوورسی) بەردەوام دیوانی مەلای جزیری لە باخەڵیدا بووە – دەڵێت با بەو دیوانە فاڵ بگرینەوە، با بزانین مەلا چیمان پێدەڵێت، ( ئەمە شتێکە سەردەمی نوێ لێی تێناگات) لەوکاتەدا ئەو بەیتەی مەلا دێتە پێشەوە کە نوورسی وا مانای دەکات کە نە لەگەڵ کەمالیەکان و نە لەگەڵ شێخ سەعیدیشدا دەبێت. بەلام ئەم پیاوە ئەگەر چی لە شۆرشی (شێخ سەعید)دا بەشداری نەکردووە و کەسێکی عاریفیش بووە، کەچی دواتر هەر لەبەر ئەوەی کوردە، هەرئەوکاتەی دەست بەسەر شێخ سەعید و کۆمەڵەکەیدا دەگرن ئەویش دوور دەخەنەوە بە تۆمەتی ئەوەی (نوورسی)ش دەستی هەبووە لەو شۆرشەدا {٨٢}لە کاتێکدا وانەبووە، ئەو دەشێت بڵێین بەرگریکارێکی گەورە بووە لە کورد، وەکو چۆن بەرگریکارێکی گەورە بووە لە (ئیمان)، بەلام بە رێگای تایبەتی خۆی، وەك چۆن بەرگری لە ئیمان کرد بە رێگەی تایبەتی خۆی نە لە رێگەی (فەلسەفە) و نە لە رێگەی (فیقه)یشەوە، بەڵکو بەو بەرزەخەی دروستی کرد لە نێوان ئەواندا، هەر بەو رێگە تایبەتیەی خۆی بەرگری لە (کورد)یش کرد، تەنانەت نزیکەی ساڵ و نیوێك لە پەنای گۆری (ئەحمەدی خانی)دا دەرسی وتۆتەوە، وای بۆ چووە کە چارەسەری کێشەی کورد لەو رێگەیەوە ناکرێت کە لە (شێخ سەعید)ەوە دەستی پێکردووە و هەتا ئەمرۆی ئێمەش هەر خوێنی لێدەتکێت – کە ئەمە بابەتێکە قسەی زۆر هەڵدەگرێت ئەگەر دەرفەت بوو لە کاتێکی دیکەدا لەسەری دەدوێم– بە بۆچوونی من چارەسەری مامۆستا (نوورسی) بۆ کێشەی کورد چارەسەرێکی تایبەتیە و عەمەلی ترە لەو چارەیەی کە خەڵکانی دیکە و شۆرشەکانی دیکە کردوویانە، کە ئەگەر واقیعە نێو نەتەوەییەکە نەبووایە رەنگە ئێمە ئەم تۆزە بەرهەمەی کە ئێستا دەیبینین هیچیمان نەبینیایە، بەردەوام خوێنی لە ئێمە رشتووە بەبێ ئەوەی شتێکی ئەوتۆشمان بۆ بکات! بەلام لێرەدا بەوەندە واز لە قسەکردن لەسەر ئەم بابەتە دەهێنم.

## کورتەی مامەڵەی نوورسی، مامەڵەی عیرفانیانە:

(سەعید نوورسی) بەردەوام ئەو تۆمەتەیان داوەتە پاڵ کە ئەو خۆی بە (شێخ) دەزانێت، خۆی بە (بەرگریکار لە دین) دەزانێت، ئەویش بەردەوام وەڵامی داوەتەوە کە ئەو (سۆفی نیە بەو مانایەی تەریقەیەکی تەسەوفیانەی ببێت، بە راستی ئەو شێخ و موریدی قبووڵ نەبووە، زۆر خۆی بە کەسێکی سادە زانیوە کە بەریگارێکە لە (قورئان)، موفەسیرێکی مەعنەویانەی قورئانە، بەلاّم دەشێت بڵێم ئەو لەناو بیریارە ئیسلامیە نوێکان یان ئەو کەسایەتیە گەورانەی سەدەی بیستدا گەورەترینیانە کە زۆرترین سوودی لە رێگەکانی تەسەوف بینیوە بەبێ ئەوەی بچێتە ناو سلبیاتی تەسەوفەوە، بەبێ ئەوەی ئەو شێخ و موریدیەی کە لەلای سۆفی و دەروێشەکانی پێش خۆیەوە هەیە ئەو بۆ شوێنکەوتووەکانی خۆی دروست بکات، زیاد لە پەنجا هەزار قوتابی هەبووە بەلاّم شێخیشیان نەبووە، تەنانەت ئەو کاتەی کە وەفات دەکات دوو قوتابی لە قوتابیەکانی ئەوانەی کە لەگەڵیدا دەبن دەبورێنەوە یەکێك لە قوتابیەکانی دیکە پێیان دەڵێت: ئێوە منالْن! ئەوە منال بوونەتەوە چۆن دەبێت وەهابن{٨٥} ! واتە وەك ئەوەی کە (سەعید نوورسی) پەیامەکانە نە زاتی خۆی، نە شێخ خۆی! کە ئەمە جوانترین نوکتەیە کە ئەو توانیویەتی خۆی لە سلبیاتی تەسەوف بە دوور بگرێت، بەلاّم لەگەڵ ئەوەشدا فەیلەسوفێکی گەورەی فەلسەفەی ئەخلاق بووە بە بۆچوونی من کە هەر خودی رێگاکەی خۆی گەورەترین مەدرەسەی ئەخلاقیە کە مرۆڤ فێری قەناعەت دەکات و فێری ئەوەی دەکات کە لە سلبیاتی سەردەمی نوێ خۆی بە دوور بگرێت و بشتوانێت لە ناویدا بژی، تەنانەت مرۆڤ فێردەکات پارێزگاری تەندروستی خۆی بکات، چۆن بخەوێت، چۆن بخوات، مرۆڤێك بووە نەباتی نەك پرۆتینی، تەنانەت هاوکاریکردنی دکتۆرەکانی کە ئەمان پزیشکیان خوێندووە پێیان سەیر بووە ئەو ئەوەندە شارەزایی لەو بوارەدا هەبووە{٨٦}.

لەگەڵ ئەوەشدا مامەڵەی (نوورسی) لەگەڵ هەموو ئەمانەدا مامەڵەیەکی عیرفانی بووە، دیدی ئەو دیدێکی عیرفانیانە بووە بۆیە توانیویەتی ئەو هەموو شاکارانە دروست بکات کە بەرهەمی هێناون.

## نوورسی و ئیجتیهاد:

وتمان کە (نوورسی) ئیجتیهادی نەکردووە و بە پێویستیشی نەزانیوە، چونکە ئەو (فەقیه) نەبووە کە ئەمە یەکێکە لە جیاوازیەکانی (مامۆستا نوورسی) لەگەڵ (مامۆستا ناصری سوبحانی)دا، سوبحانی تا سەر ئێسقان هەوڵی ئیجتیهاد کردنی داوە تەنانەت لە (ثوابت)یشدا! یەکێك لە هاوڕێکانی کە زیاد لە نۆ ساڵ لە خزمەتیدا بووە بۆی گێڕامەوە کە تەنانەت لەوەشدا کە خەڵکی بە نەگۆڕ و جێگیری زانیوە (سوبحانی) ویستوویەتی ئیجتیهادی تێدا بکات{٨٧}.

## نوورسی و فەلسەفە:

هەروەها (نوورسی) فەیلەسوف نەبووە، بەڵام ئەوەندەی کە فەلسەفە بەرگریکردن بێت لە (دین) یان بەرپەرچدانەوەی فەلسەفەی ماددی بووبێت ئەو پەیوەندی لەگەڵیدا هەبووە، لێرەشدا دەتوانین بڵێین نزیکیەك هەیە لە نێوان (کاك ئەحمەدی موفتیزادە) و (مامۆستا نوورسی)دا{٨٨}.

کاك ئەحمەد لە بابەتێکیدا بەناوی (دڵی ساز و ناساز)ەوە باسی ئەوە دەکات کە (تزکیه) پێش (تەعلیمە)، تەزکیە واتە مرۆڤ دڵی وا ساز بکات کە لەگەڵ (خودا) یەکلایی بێتەوە بە جۆرێك ئیتر کە عیلمێشی زیاد بوو عیلمەکەی نابێتە فیتنە بۆی سوودی لێدەبینێت، بەڵام ئەگەر (عیلم) بەبێ (تەزکیە) بوو ئەوا بە پێچەوانەوە دەبێتە بار بەسەر خاوەنەکەیەوە. ﴿یتلوا علیکم آیاتنا و یزکیکم و یعلمکم الکتاب والحکمة﴾{٨٩}.

بەڵام ئەو دۆعایەی کە حەزرەتی (ئیبراهیم) دەیکات بۆ نەوەکانی خۆی لەناو مەککەدا، یەکێك لە دۆعاکانی ئەوەیە کە کەسێك ببێتە پێغەمبەریان و ئایەتەکانی خودایان بەسەردا بخوێنێتەوە و فێری زانست و حیکمەتیشیان بکات.. ﴿ربنا واجعل فیهم رسولا منهم یتلو علیهم آیاتك و یعلمهم الکتاب والحکمة و یزکیهم﴾.

(کاك ئەحمەد) دەفەرموێت چۆنیەتی پەروەردەی دینی و بانگەواز لە سەردەمی (پێغەمبەری خودا)دا بەو جۆرەیە کە دەبێت لە پێشدا (تەزکیە) کرا بێت ئینجا (تەعلیم) بکرێت – ئەم کۆمەڵە ئایەتەش لای (مامۆستا ناصر) تەفسیری تایبەتی خۆی هەیە و دواتر لای ئەو ئاماژەی پێدەکەین– (کاك ئەحمەد) لە ﴿یتلوا علیکم آیتنا﴾ وای لێتێدەگات کە ئایاتی قورئان – وەحی– بێت، واتە دوای ئەوەی

(وه‌حی) ده‌خوێنێته‌وه ته‌زکیه‌ی شوێنکه‌وتووه‌کانی ده‌کات ئینجا (ته‌علیم)یان ده‌کات، وتمان لێره‌دا نزیکیه‌ك هه‌یه له نێوان (نورسی و موفتی‌زاده)دا. (دڵی ساز) ئه‌و دڵه‌ی که ته‌زکیه کراو ساز بوو، ته‌وحیدی وه‌رگرت، ئیتر ئه‌وه وای لێده‌کات ئه‌گه‌ر دوای (مه‌عریفه‌ش) زۆر بوو نابێت به‌بار به سه‌ریه‌وه به‌ڵکو سوودی لێده‌بینێت، جا بۆچوونی (کاك ئه‌حمه‌د) ئه‌وه‌یه که ئه‌م سه‌رده‌مه (ته‌علیم)ی زۆره به‌ڵام (ته‌زکیه)ی نیه، بۆیه بۆمبی ئه‌تۆمی دروست بووه و مرۆڤه‌کانی پێ له‌ناو ده‌برێت، سروشت وێران ده‌کرێت و.. ده‌بێت له پێشدا (ته‌زکیه) بکرێت، به‌ڵام ئه‌م (ته‌زکیه)ش دواجار پێویستی به هه‌ندێك مه‌عریفه هه‌یه، ئاخر خۆ باس باسی ته‌وحید و قه‌لبه ده‌بێت بزانیت مه‌به‌ست له‌مانه چیه و بیانناسێت، ئا له‌وێدایه که (کاك ئه‌حمه‌د) ده‌گه‌ڕێته‌وه بۆ مه‌عریفه به بۆچوونی من – ئه‌مه‌ش له باسی کاك ئه‌حمه‌دی موفتی‌زاده‌دا جارێکی دیکه ده‌چینه‌وه سه‌ری– به‌ڵام ئه‌م که‌مه مه‌عریفه‌یه‌ی که بۆ ته‌زکیه هه‌یه وه‌کو ئه‌و مه‌عریفه‌یه زۆره نیه که بۆ (ته‌علیم)ه، له سه‌رده‌می (ته‌علیم)دا مه‌عریفه‌ی زۆرت ده‌وێت، لێره به که‌مێك مه‌عریفه ته‌غزیه‌ی ئه‌و ده‌زگا ئیمانی و ته‌زکیه‌یه ده‌که‌یت بۆ ئه‌وه‌ی بکه‌وێته‌کار، مه‌عریفه و ته‌علیم لای مامۆستا (نوورسی)ش ئاواهی بووه، که‌مێك مه‌عریفه ده‌زگایه‌کی رۆحی گه‌وره‌ی (مامۆستا نوورسی) جوڵاندووه! هه‌ر بۆیه ده‌بینیت له شتێکی بچووکدا، له په‌ڕه‌یه‌کی گوڵدا که بینیویه‌تی له سروشتدا بۆته هه‌وێنی کتێبێکی گه‌وره و نووسیویه‌تی{٩١}!

## تایبه‌تمه‌ندی په‌یامه‌کانی نوور لای نوورسی:

ئه‌گه‌ر باسی تایبه‌تمه‌ندیه‌کانی (په‌یامه‌کانی نوور) بکه‌م لای (مامۆستا نوورسی) چه‌ند خاڵێك هه‌یه که من زۆر به‌لامه‌وه سه‌یره، یه‌کێکیان ئه‌وه‌یه لای نوورسی ئه‌و شته‌ی که له ده‌ره‌وه‌دا واده‌رده‌که‌وێت یه‌ك شته، مامۆستا (نوورسی) به ئه‌زموونی رۆحی خۆی ده‌گاته ئه‌وه‌ی که ئه‌وه یه‌ك شت نیه، به‌ڵکو چه‌ندین شته، بۆ نموونه ده‌خوێننه‌وه له په‌ندی پێشینانی خۆماندا که وتراوه (ژن یه‌ك ژن نیه به‌ڵکو چه‌ندین ژنه، ژن هه‌یه ژانه، ژن هه‌یه ژینه،..) که ژن بۆ خۆی له ده‌ره‌وه‌دا یه‌ك مه‌وجودی بینراوه، به‌ڵام ئه‌وه ئه‌زموونی ژیانی ژنه له‌گه‌ڵ پیاودا که پیشانی ده‌دات ژن چه‌ند ژنێکه، ئه‌گه‌ر ئه‌م ئه‌زموونی پێکه‌وه ژیانه نه‌بێت هه‌ست به‌وه ناکرێت وه‌ك له

نۆقلێتی (چاوی ماسی)دا ئاماژەم پێکردووە کەبۆ ئەوەی تەمەن ببینیت دەبێت بژی، هەندێك مەعریفە هەیە بە ژیان لەگەڵیدا دروست دەبێت، زانراوێك (مەعلومە) یەك نیە وەریبگریت.

بۆ نموونە مامۆستا (نوورسی) باسی نەفس دەکات، دەبینیت کە (نەفس) یەك نەفس نیە بەڵکو لە پشتی ئەم نەفسەوە چەندین نەفسی دیکە بوونیان هەیە، واتە ئەوەی کە لای کەسێکی دیکە، لەلای (فەقیهێك) یان (فەیلەسوفێك) لە دەرەوە وا دەردەکەوێت یەك شتە، بەهۆی ئەوەی کە مامەڵەی مامۆستا (نوورسی) لەگەڵ ئەو شتەدا مامەڵەیەکی رۆحی بووە دەردەکەوێت کە ئەو شتە یەك شت نەبووە! بۆیە ئەو شتەی کە لای (فەیلەسوفەکە) یەك شتە، بۆ نموونە (نەفس) کە پێناسە دەکرێت لە فەلسەفەی کۆندا، یەك دەرەنجام کە دەگیرێت، ئەویش ئەوەیە ئایا (نەفس) چیە؟ هەیە یان نیە؟ یان ماهیەتی (نەفس) چیە؟ واتە یەك شتە، بەڵام نەفس لای مامۆستا (نوورسی) جیهانێکی فراوانە، چونکە بە رۆح مامەڵەی لەگەڵدا کردووە، هەر بۆیە خودی فەلسەفەش لای مامۆستا (نوورسی) ئاواهی بووە، ئەو فەلسەفەیەی کە لای فەیلەسوفەکان دەرەنجامگیریەکە یان شتێکە هەر فەلسەفەیە، لای (نوورسی) چەندین فەلسەفەیە، ئەو نموونەیەی کە لە یادەوەریەکانیدا دەیگێڕێتەوە، دوو ساڵ لە ئەستەمبوڵ بووە و هەموو رۆژێك لە حوجرە چووەتە دەرەوە تا ئەوەی گومانی لەسەر دروست دەکەن کە بۆ سەیری ئافرەت بڕوات، بەڵام هەموو رۆژێك لەماڵ دەردەچێت و دەڕوات بۆ شوێنێکی چۆڵ و زیکر دەکات و بیر لە بوونەوەر دەکاتەوە، دەفەرموێت دوای ئەوەی هاوڕێکانم بۆیان دەرکەوت کە بەو جۆرە نیە و سوپاس بۆ خودا نزیکەی دووساڵ لەوێ بووم یەك (نظر)یشم نەکردووە، جا لەوێدایە کە دەڵێت ئەم بێگوناهیە خەریك بوو دەبوو بە گوناه بۆم!، وەك ئەوەی ئەها من چەند موهیمم ئەوەم نەکردووە، بۆیە دەفەرموێت بۆم دەرکەوت ئەمە (نەفسی یەکەم)ە، نەفسێکی دیکە هەیە لە پشتی ئەمەوە کە ئەوە ئەمە تەوزیف دەکات و..

کەواتە ئەو نەفسەی کە لای فەیلەسوفەکان هەر یەك نەفسە لای ئەم دەبێتە چەندین نەفس، بۆیە فیکری مامۆستا (نوورسی) فیکرێکی بینراو نیە، تەنها لە یەك رووەوە بیبینیت، فیکرێکە لە پشتی ئەوەوە چەندین بوون هەیە، وەکو چۆن لە پشتی ئەو نەفسەوە چەندین نەفس هەیە، لەبەر ئەوە ئەو کەسەی کە ئەو پەیامە و هەموو پەیامەکانی لە رووکەشدا دەبینێت لێیان تێناگات، ئەمە یەکێك لە تایبەتمەندیەکان،

یەکێکی دیکە لەو تایبەتمەندیانەی لە(پەیامەکانی نوور)دا هەیە بریتیە لە (زیکری فیکر) ئەو پەرستش و خەسڵەتەی کە لە رابردوودا لای زۆربەی عاریفەکان بوونی هەبووە و ئەمڕۆ نەماوە، (نوورسی) زیندووکەرەوەی ئەوەشە، کە یەکێکە لە مەقامەکان بۆ نموونە لای (ابن القیم الجوزی) یەکێکە لە مەقامەکان، مەقامی فیکر کردنەوە، ئەمە لای (نوورسی) گەورەترین حزوری هەیە، فیکری رۆحی، مرۆڤ بیر بکاتەوە، تەنانەت قوتابیەکانی فێری ئەوە دەکات کە چۆن بیر بکەنەوە{٩٢}، بۆ نموونە یەکێك لە قوتابیەکانی لە شەونوێژدا بێتاقەت دەبێت لەگەڵیدا، (نوورسی) پێی دەڵێت: (منیش لە سەرەتاوە وابووم ئەمە خۆڕاهێنانی دەوێت، کە راهێنانی رۆحی مەبەستە) یەکێك لەو شتانەی کە لای (نوورسی) هەیە و من زۆر سەرم سوڕماوە بەرامبەری بریتیە لە خێرا نووسینی لەو کاتەی کە فیکرەکانی بۆ هاتووە، ئەوەی کە ئەمڕۆ لە رێگەی زانستی دەروونناسی و گەشەپێدانی تواناکانی مرۆڤەوە (التنمیة البشریة) هەوڵی بۆ دەدرێت کە چۆن فیکری خۆمان پێش بخەین، بەڵام ئەو ئەم بەهرەیەی خۆی چۆن پەرەپێداوە! کە جار بووە بە چەند سەعات بیری کردۆتەوە ئەو کاتانەی کە لە ژوورێکی بچووك یان لە پاڵ درەختێکدا دانیشتووە{٩٣}.

مەقامی زیکری فیکر ئەوەی کە (مەولانا) دەفەرموێت (زیکر) (فیکر)·دەهێنێ ە لەرزین، بەراستی (نوورسی) جارێکی دیکە مەقامی فیکری گێڕاوەتەوە بۆ ناو عیرفان، کە دەتوانم بڵێم گەورەترین تایبەتمەندی (پەیامەکانی نوور) و گەورەترین خەسڵەتی (نوورسی)ش لە ناو عاریفەکاندا ئەمەیە، بەمەش توانیویەتی بەری ئەو هەڵمەتە دژە دینیە بگرێت کە لە (تورکیا)دا هەبووە.

یەکێکی دیکە لە خەسڵەت و تایبەتمەندی (پەیامەکانی نوور) ئەوەیە کە بێگومان (سەعید نوورسی) زۆر لە خزمەت قورئاندا دانیشتووە و تەنها سەرچاوەشی هەر (قورئان) بووە، وەکو چۆن (نوورسی) زۆرباش لە قورئان حاڵی بووە، کە من بۆ خۆم زۆر شت هەبووە لە قورئاندا دەرکم نەکردووە (نوورسی) فێری کردم فێرشی کردم بزانم خەڵکی ئەو کاتە چۆن لە قورئان تێگەیشتوون، واتە پێش مۆدێرنە، بۆیە یەکێك لەو تایبەتمەندیانەی لە (پەیامەکانی نوور)دا هەیە و (نوورسی) لە قورئانەوە وەریگرتووە بریتیە لەوەی کە هیچ شتێکی مردوو لە پەیامەکانی نووردا بوونی نیە وەکو چۆن هیچ شتێکی مردوو لە (قورئان)دا بوونی نیە، بۆ نموونە لە شوێنێکدا

باسی پەیامەکانی خۆی دەکات کە زۆر سەرسورهێنەرە، دەڵێت ئەم پەیامانە هی من نین! ئاماژەیەکن لە قورئان، وەکو چۆن ترێیەکی تەڕ کە بۆڵەکانی ئاوی لێدەتکێت و حەز دەکەیت بیخۆیت لە دارمێویکی رەق و تەقەوە دێتەدەر! ئەها ئەو دارمێوەی کە مردووە، بەڵام زیندووە چونکە بەری هەیە! بۆیە (مێو) لای ئەو مردوو نیە! کە باسی شاخ دەکات کە بە هەیکەل بوونی هەیە، بەڵام شاخێکی مردوو نیە وەکو ئەو شاخانەی کە ئێمە دەیبینین، مۆدێرنە دەیبینێت، (رۆلان بارت) کە یەکێکە لە رەخنەگرە فەرەنسیەکان زۆر جوان باسی فۆتۆگراف دەکات لە سەردەمی نوێدا کە ناوی دەنێت (ئەو راستگۆ درۆزنە) بەو مانایەی کە وێنەت دەگرێت ئەوە وێنەی منە بەڵام منیش نیم، وەرە بەراورد بکە بزانە منم! سەردەمی نوێ سەردەمی وێنەگرتنە، هیچکام لە شتەکان خۆیان نین بەڵکو وێنەی ئەوانە، بەڵام مامەڵەی (سەعید نوورسی) لەگەڵ شتەکاندا مامەڵەیەکی فۆتۆگرافیانە نیە، مامەڵەیەك نیە شتە زیندووەکانیش بمرێنێت بەڵکو شتە مردووەکانیش لای ئەو زیندوون، هیچ شتێکی مردوو لە پەیامەکانی (نوور)دا بوونی نیە{٩٥}، وەکو چۆن هیچ شتێکی مردوو، دەریاکان، شاخەکان، ئاسمان،.. لە (قورئان)دا بوونی نیە، بێجگە لەوە ئەو جیهانە فراوانە نەبینراوە کە زۆر کەلێن لە فیکری بینراودا دروست دەبێت، بۆشایی لە زماندا دروست دەبێت، بۆشایی لە جیهان بینی مرۆڤەکاندا دروست دەبێت، مرۆڤە نوێیەکان، بۆیان نادرێتە دەم یەك، ئەو بۆشایی و کەلێنە گەورە گەورانەی کە لە جیهانی بینراودا هەن، (نوورسی) بە (جیهانی نەبینراو) پڕی دەکاتەوە یەك بۆشایی تێدا ناهێڵێت کە ئەمە یەکێکە لە تایبەتمەندیەکانی (پەیامەکانی نوور) کە لە شوێنی دیکەدا نیە{٩٦}.

بۆ نموونە عەقڵی زانستی ئێمە لە نێوان ئەستێرەیەك و ئەستێرەیەکی دیکەدا شتێکی کەشف نەکردووە تەنها هێزی کێش کردن – جاذبة– نەبێت، ئەو بۆشاییەی کە لە نێوان من و نزیکترین شت لە منەوە هەیە، ئەو بۆشاییەی کە زانستی سەردەمی نوێ نەیتوانیوە پڕی بکاتەوە و پڕیشی ناکاتەوە! کەواتە ئەم بوونە کە ئێمە سەیری دەکەین و زۆرتری بۆشاییە – لە فیکری زانستی نوێدا– و کەمترینی شتە، بەڵام لە فیکری (نوورسی)دا ئەو بۆشاییانە هەموو فریشتە پڕی کردۆتەوە! پێشانگایەکی گەورەیە ئەم بوونە، خوا – جلەجلالە– ئەم هەموو جوانیەی لەم گەردوونەدا پیشانداوە گونجاو نیە کەسێك نەبێت سەیری بکات! تەنانەت لە

بچووکترین شتەوە، لە گەردیلەوە، لە بلوری پووشکە بەفریکەوە کاتێك کە دێتە خوارەوە چەند جوانە، ئاخر زۆر جوانی هەیە کە هێشتا چاوی ئێمە نایبینێت، گونجاو نیە ئەم پێشانگا گەورەیە بەم هەموو جوانیەی ناویەوە بینەرێکی نەبێت! بێجگە لە ئێمە بینەری دیکەش زۆرە پەری و فریشتە هتد..{٩٧}، ئەها بۆشاییەکان پڕ دەکاتەوە بە شتی نەبینراو، کە بە بۆچوونی من هیچ دەقێکی ئەدەبی سەردەمی نوێ نەیتوانیوە هێندەی (نوورسی) ئەوە بکات، هەیە تەوزیفی جنۆکەی کردووە، هەیە تەوزیفی شتی نەبینراوی کردووە، تەوزیفی فەنتازیای کردووە، تەوزیفی میسۆلۆجیای کردووە، بۆ نموونە ئەدەبیاتی ئەمریکای لاتین، پاولۆ و مارکیز... بەڵام بۆشایی زۆر لە دەقەکانیاندا هەیە کە بێ جێگەیە، شتێك نیە جێگەی بگرێتەوە، بەڵام لە (پەیامەکانی نوور)دا بێجگە لەوەی هەموو شتەکان زیندوون، هیچ بۆشاییەکیش لەوێدا بوونی نیە، کە ئەمەش پێویستی بە تێگەیشتنێکی قەلبی هەیە نە وشەکان! ئەمەش یەکێکە لە تایبەتمەندی (پەیامەکانی نوور) کە رەنگە لە نووسرا و و دەقی ئەدەبی دیکەدا بوونی نەبێت.

بێجگە لەوە لە (پەیامەکانی نوور)دا بە حوکمی ئەوەی عەقڵی رووت نیە، ئەگەر مرۆڤ بتوانێت بچێتە ناویەوە ئیدی تێر نابێت لێی، بەردەوام زیندوویێتی بە تۆ دەبەخشێت، وات لێدەکات هەست بە (عیشق) بە (زیندوویێتی) بە (لەدایك بوونەوەی نوێ) بکەیت کە ئەمە لە کتێبە فەلسەفی و شتەکانی دیکەدا بوونی نیە، جارێکیان یەکێك لە قوتابییەکانی (نوور)م بینی، دەمویست کتێبی (قصة الحضارة)ی (ویل دورانت) بکڕم وتی مامۆستا ئەو کتێبەت بۆچیە؟ (قورئان) خۆی هەموو شتێکی تێدایە، زانیم کە مەبەستی ئەو ئەوەیە (نوورسی) بە تەنها لە (قورئان)ەوە ئەو هەموو مەعریفەیەی دەرهێناوە، بەڵام من لەو کاتەدا پێم نەووت کە ئەو بابەتە چۆنە، یان دەمزانی کە لەیەکتر تێناگەین، من پێویستم بە جگە لە قورئان هەیە لەبەر دوو هۆ: یەکەم لەبەر ئەوەی کە (نوورسی)ش لە سەرەتاوە مەعریفەی دەرەوە دینیشی هەبووە، بە بەڵگەی ئەوەی هەر ئەوە وای لێکردووە لە قورئاندا بۆ شتەکانی دیکە بگەڕێت، واتە ئەگەر نەیزانیایە مولحیدەکان چی دەڵێن دژی (دین) لە قورئاندا نەدەگەڕا بۆ ئەوەی وەڵامیان بداتەوە، ئەگەر ئەو نەیزانیایە مولحیدەکان دەڵێن سروشت دروستکەرە، لە قورئاندا بۆ پێچەوانەی ئەوە نەدەگەڕا کە بەڵگە بدۆزێتەوە سروشت هونەرە و هونەرمەندێکی هەیە، ئەگەر نا پەیامی (سروشت

هونەرە یان هونەرمەند){٩٨} لەدایك نەدەبوو! کەواتە دەرەوەی دین تەنانەت بۆ (نوورسی)ش مەعریفەی خولقاندووە بە تایبەتی لە سەردەمی (سەعیدی کۆن)دا کە دواتر وەکو (سەعیدی نوێ) تەوزیفی کردۆتەوە و بەردەوام حزووری هەبووە لەگەڵیان، بە بۆچوونی من ئەزموونی (سەعیدی کۆن) نەفەوتاوە، (نوورسی)ش هەر خۆیشی باشی زانیوە بۆیە هەندێك لە کتێبەکانی (سەعیدی کۆنی) لەناو پەیامەکانی (سەعیدی نوێ)دا بە پەیام داناون.

دووەم، من (نوورسی) نیم تا بتوانم ئەوە بکەم، ئەو هەموو ئەزموون و عیرفانە لە پشتمەوە بێت کە بتوانم لە قورئان بەو شێوەیە شت دەربهێنم کە (نوورسی) دەریهێناوە!

یەکێکی دیکە لەو خاڵە سەرسورهێنەرانەی کە لای (نوورسی) و لە (پەیامەکانی نوورد)دا بوونی هەیە، بریتیە لەوەی کە توانیویەتی بیسەلمێنێت کە ئەو حاڵەتە بوونی لە شارستانیەتی ئیسلامیدا هەبووە دۆخێکی سروشتیە و دەبوایە بەو جۆرە بووایە، بۆ نموونە من لای بیریارێکی ئیسلامی دەخوێنمەوە کە فلاّن مەزهەبی فیقهی پێ قبولّ نیە و رەفزی دەکاتەوە، واتە تەرجیحی لایەك دەدات بەسەر لایەکی دیکەدا، بەلاّم (سەعید نوورسی) لە جیاتی ئەوەی بێت تەرجیحی راوبۆچوونی یەکێك لە فەقیهەکان یان مەزهەبەکان یانَ عاریفەکانَ بدات بەسەر (قەولی) ئەوی دیکەیاندا، هاتووە بە جۆرێك مامەڵەی لەگەڵدا کردووە، وەك ئەوەی کە ئەوە باشترین حاڵەتە بۆ ئەو فیرقەیە یان بۆ ئەو مەزهەبە یان بۆ ئەو عاریفە کە بەو جۆرە بوایە بۆ نموونە نایەت تەرجیح بدات لە نێوان مەزهەبی شافیعی و ئیمام ئەبوحەنیفەدا، بەڵکو دەڵێت مەزهەبی شافیعی بۆ ئەو شوێنانەی کە شافیعی مەزهەبن باشترین شت بووە، لەبەر ئەوەی ئەوان نیشتەجێی لادێن و ئەو مەزهەبەش وەلاّمگۆی کێشەی ئەو لادێیانەیە، مەزهەبی حەنەفیش بە حوکمی ئەوەی مەزهەبی شارەگەورەکان و پایتەخت بووە و وەلاّمگۆی ئەوێیە{٩٩}، تەنانەت بۆ حاڵەتی عاریفەکانیش حاڵەتی یەکێکیان تەرجیح نادات بەسەر ئەوی دیکەیاندا، ناڵێت حاڵەتی (حەلاج) لە هی (ئیبن عەرەبی) باشترە، لە هی مەولانا باشترە، لەهی (ئیمامی رەببانی) باشترە، بەڵکو حالّی ئیمامی رەببانی لە حاڵەتی حەلاج باشترە بۆ ئیمامی رەببانی خۆی، بەمەش توانیوێتی جیهانی خۆی زۆر فراوان بکات، واتە دەتوانم بڵێم (سەعید نوورسی) راگیرکەری بارودۆخە پێشینەکەیە کەشفی ئەو حاڵەتەی کردووە، بەمەش زۆر

مەدهۆش بووە وەکو کەسێکی سەردەمی پێش مۆدێرنە، بەرامبەر بەو جیهانە سەری سورماوە و مەدهۆش بووە بەڵکو فراوانی ئەو جیهانی دەرککردووە!

تەنانەت پرسیاری شەتەحاتی لێدەکرێت، کە زۆر جوان وەڵامی ئەو شەتەحاتانە دەداتەوە کە لای عاریفە گەورەکان بووە، هەم بەرپەرچی ئەو کەسانە دەداتەوە کە شوێنی دەکەون و هەم ئەوانەش کە دژی دەوەستنەوە، واتە رۆشنبیری فراوانی کلاسیکی (سەعید نوورسی) بەراستی جێی سەرنجە!

ئەو هەموو شارازاییە لە (عیرفان)دا هەیبووە، ئەو هەموو شارەزاییەی لە (فیقهی ئیسلامی) و لە (کەلام)دا هەیبووە، لەگەڵ ئەوەشدا خوێندنەوەی هەموو ئەوانە لە جیهانی رۆحانیەتدا کە یەکێکە لە جوانیەکانی (پەیامەکانی نوور){١٠٠}.

خەسڵەتێکی دیکە کە لە (پەیامەکانی نوور)دا هەیە، کەشفکردنی چرکەساتی (فیکری) و (فەلسەفی) و (فیقهی)یە و بە رۆح و بە شهود! کە فەیلەسوفەکانی دیکە دەرکیان بەم مەسەلەیە نەکردووە، ئەگەر چی زۆر کەم خۆی مژۆڵی ئەم بابەتانە کردووە بەڵام لە جیهانی (شهود)دا هەندێك چرکەساتی رۆحی بۆ هاتوون کە جێی سەرنجن، کە کەم لە فەیلەسوف و کەلامیەکانی پێش ئەو دەرکی ئەم بابەتانەیان کردووە، بۆ نموونە ئەوەی کە دەڵێت جەهەننەم بۆ جەهەننەمیەکان باشە، کە کەسێکی سادە لەوە تێناگات! چۆن باشە، خەڵکی سزای دەدرێت دەخرێتە جەهەننەم! ئەمە بە جیهانی عەقڵی عادی کەشف ناکرێت، بۆیە ئەو باس دەکات کە لە (جەهەننەم بوون) باشترە تا ئەوەی بچێتە (عەدەم)! عەدەم دۆخێکی خراپترە تا جەهننەمی بوون، کەواتە ئەو حاڵەتە بۆ جەهەننەمیەکان باشترە{١٠١}.

یەکێکی دیکە لەو خاڵانەی کە لە (پەیامەکانی نوور)دا هەیە سڕانەوەی زەمەنە! کە ئەمە شتێکی زۆر نایابە بە بۆچوونی من، (نوورسی) زۆر جوان کەشفی ئەو بابەتەی کردووە، بۆ نموونە لەو شوێنەی کە باسی (پێغەمبەری خودا دەکات (د.خ). پێغەمبەری خودا دادەنێت بە ئیمامی هەموو مرۆڤایەتی کە هەموو مرۆڤە ئیماندارەکان هەر لە حەزرەتی ئادەمەوە لە پشتیەوە نوێژ دەکەن و ریزیان بەستووە! ئەمە مێژوو نیە!! ئەوان پێش پێغەمبەر ژیاون، یاخود هەموو ئیمانداران، هەموو عاشیقەکان و عاریفەکان لە یەك سەردەمدا دەبینێت{١٠٢}!

هەموو قورئان بۆ یەك زەمەن دادەنێت، راستە بۆ تا قیامەت هاتووە، بەڵام هەموو ئەو شتانەی لە قورئان دەردەهێنرێت وەك ئەوە وایە لە یەك کاتدا بژین،

لەبەر ئەوە زەمەن لای ئەو بوونی نیە، تەنانەت لە بابەتی قیامەتیشدا بە هەمان شێوەیە وەك ئەوەی قیامەت زەمەنێك نیە دوایی بێت، راستە كە لە رووی بەڵگە و فیقهی دینیەوە ئەوە بەوجۆرەیە، بەڵام بۆ كەسێك كە عاریفە ئەمە جۆرێكی دیكەیە، مرۆڤ كە (پەیامی حەشر)ی دەخوێنێتەوە شتی سەیری تێدایە لەو بوارەدا{١٠٣} لەگەڵ ئەمەشدا (نوورسی) مرۆڤ بووە.

تایبەتمەندیەكانی دیكەی پەیامەكانی (نوورسی) ئەوەیە كە بۆ ناوی ناوە (نوور)؟ یان بڵێین كە (نوورسی) زۆر سوود لە (نوور) و خەسڵەتەكانی نوور بینیوە، كە ئەمەش پیشاندەری ئەو راستیەیە كە (نوورسی) زۆر بەباشی ئاگای لە ئەدەبیاتی عیرفان و ئادابی عاریف بوون بووە، كە (نوور) زۆرباش لای عاریفەكان تەوزیف كراوە، ئەوەتا (مەولانا) زۆر (نوور) تەوزیف دەكات، ئەمیش پەیامەكانی ناوناوە (نوور) كە ئەمانە تەفسیرێكی شهودین و لە نووری قورئانەوە سەریهەڵداوە لە سەردەمێكدا كە تاریكستانە و تاریكیەكان چین چین چوونەتە سەریەك كەچی ئەو نوورە هەموو ئەو تاریكیەیانەی بڕیوە و جارێكی دیكە لای (نوورسی) سەریهەڵداوەتەوە، رەنگە كەم پەیام ببێت لە پەیامەكانی نوور كە باسی نووری تێدا نەبێت{١٠٤}، بۆیە جیهانی ئەو پەیامانە جیهانێكی نوورین بووە، جیهانێك بووە كەمتر نانی تەنوری خواردووە وەك (مەولانا) دەفەرموێت:

ئەگەر یەكجار بخۆیت نانی نوور
بۆ ئەبەد وازدێنیت لە نانی تەنور {١٠٥}

**مرۆڤ بوونی سەعید نوورسی:**

(سەعید نوورسی) بەردەوام ئاماژە بە كەموكورتی و ناتەواویەكانی خۆی دەكات، زۆر هەستیارە بەرامبەر بەوەی كە دوایی بە شێخێك نەزانرێت و گەورەتر لەوەی هەیە سەیری بكرێت، ئەگەر چی لە سەردەمی خۆیدا بەراستی وەلیەك بووە و پێشبینی زۆر شتی كردووە كە تەنها ژمارەیەكی زۆر كەمی قوتابیەكانی نەبێت كەسی دیكە بەوەی نەزانیوە و دوایش راست دەرچووە{١٠٦}، ئەمە وا دەكات كە دوایین ئەزموونی عیرفانی بووە، بەڵام دواجار مرۆڤ بووە و نەقسی تێدا بووە، هەرچەند خزمەتێكی زۆر بە پەیامەكانی نوور و پرۆژەی عیرفانی و رۆحی (سەعید نوورسی) كراوە، بەڵام بە بۆچوونی من لە چەند روویەكەوە بە هەڵە مامەڵەی لە

ته‌کدا کراوه، بۆ نموونه زه‌ق کردنه‌وه‌ی مه‌عریفه‌ی (سه‌عید نوورسی) یاخود بلێین زه‌قکردنه‌وه‌ی لایه‌نی زانستی (په‌یامه‌کانی نوور) وه‌ك ئه‌و شتانه‌ی که له بواری ده‌روونناسیدا وتراوه، که ئه‌مه به بۆچوونی من نه‌قسێکه به‌وه‌ی که‌متر له‌سه‌ر لایه‌نه عیرفانیه‌که‌ی (نوورسی) وتراوه یان که‌متر هه‌وڵی که‌شفکردنی ئه‌و لایه‌نه دراوه، زۆرتر له‌سه‌ر به‌رهه‌مه‌کانی ئه‌و ئه‌زموونه که بریتیه له په‌یامه‌کانی نوور قسه کراوه نه له‌سه‌ر ئه‌زموونی (سه‌عید نوورسی) وه‌کو ئه‌زموونێکی زیندوو{١٠٨}.

یه‌کێکی دیکه له‌و مامه‌ڵه هه‌ڵانه‌ی که له‌گه‌ڵ (نوورسی)دا کراوه، سه‌یرکردنی نوورسیه به گه‌وره‌تر له (سه‌عید نوورسی)، ته‌نانه‌ت ئه‌گه‌ر (نوورسی) نوێکه‌ره‌وه‌یه‌کی سه‌د ساڵه‌ش بێت نا بێت وا دابنرێت که بۆ ئه‌به‌د نوێکه‌ره‌وه — مجدد—یه، له کاتێکدا (نوورسی)ش خۆی نه‌یویستووه به‌و جۆره مامه‌ڵه‌ی له‌گه‌ڵدا بکرێت.

خاڵێکی دیکه ئه‌وه‌یه که (سه‌عید نوورسی)ش شتی نه‌پێکراوی هه‌یه، به تایبه‌تی له بواری مه‌عریفه‌دا که هه‌ندێك شت هه‌بووه مه‌عریفه‌ی زه‌مانی خۆی بووه ئێستا ده‌رده‌که‌وێت وانیه، ده‌توانین چه‌ندین نموونه له په‌یامه‌کانی نووردا بدۆزینه‌وه که له رووی مه‌عریفیه‌وه نه‌یپێکاوه، بۆ نموونه هه‌ندێك شتی کیمیا باس ده‌کات که ئێستا زانستی نوێی کیمیا جۆرێکی دیکه باسی ئه‌و بابه‌تانه ده‌کات،.

هه‌روه‌ك (نوورسی) له رووی زه‌مه‌نه‌وه بۆ بان زه‌مه‌نی خۆی سه‌یر کراوه، له رووی مه‌عریفه‌ی دینی و مه‌عریفه‌ی ده‌ره‌وه دینیشه‌وه له لایه‌ن خه‌ڵکانێکه‌وه به حوکمی گه‌وره‌یی ئه‌و مه‌شروعه له زه‌مه‌نی خۆی گه‌وره‌تر سه‌یر کراوه، بۆ نموونه خوێندوومه‌ته‌وه له نووسینی ئه‌و نووسه‌رانه‌ی له‌سه‌ر (په‌یامه‌کانی نوور)یان نووسیوه، ده‌بینیت که له (فیقه)دا هه‌ندێك شت ده‌کرێته به‌ڵگه له‌سه‌ری که پێچه‌وانه‌ی هه‌موو مامه‌ڵه فیقهی و ئوسوڵ فیقهیه‌کانه، بۆ نموونه هه‌ر ئه‌و بابه‌ته‌ی که له سه‌ره‌تاوه باسم کرد، ئه‌گه‌ر تۆ به (فیقه) مامه‌ڵه بکه‌یت، مامۆستا (نوورسی) کاری به خه‌و کردووه ته‌نانه‌ت تا کوشتنیش! ده‌ی خۆ (مامۆستا نوورسی) ئه‌وه‌ی زانیوه و له سه‌رچاوه‌کانی ئوسوڵ فیقهیشدا ئه‌وه هه‌یه که (خه‌و) سه‌رچاوه‌یه‌ك نیه بۆ حوکم{١٠٩} کاتێك که پێچه‌وانه هاته‌وه له‌گه‌ڵ کیتاب و سوننه‌تدا، بۆیه ناکرێت ئه‌وه بکه‌یته به‌ڵگه بۆ ئه‌مه، ئه‌وه مامه‌ڵه‌یه‌کی هه‌ڵه‌یه که به‌وجۆره مامه‌ڵه له‌ته‌ك (نوورسی)دا بکرێت، له رووی مه‌عریفه‌شه‌وه ده‌بێت (سه‌عید نوورسی) بۆ زه‌مه‌نی

خۆی و لە زەمەنی خۆیدا لێی تێبگەین، بە بۆچوونی من کاتێك کە (نوورسی) ڕۆژئاوا تەنها بۆ فەلسەفەی ماددی کورت دەکاتەوە، خۆ ڕۆژئاوا دونیایەك فەیلەسوفی دیکەی هەبووە، دونیایەك مەعاریفی دیکەی هەبووە، بێگومان (سەعید نوورسی) وەلامی فەلسەفەی ماددی ناداتەوە وەکو ڕۆژئاوا، چاکەکانی ناویشی دەبینێت، یەکێك لە جوانیەکانی (سەعید نوورسی) ئەوەیە، بەلام ئاگاداری ئەو بەرگریەش نیە لە ڕۆژئاوادا لە (دین) دەکرێت{١١٠}، ئەمە کەلێنێکی مەعریفیە لای ئەو ئەگەر وانەبووایە زۆرتر سوودی لەو بوارە دەبینی. دواجار (نوورسی) کوڕی زەمەنی خۆی بووە، ناکرێت لەوە زیاتر چاوەڕوانیمان لێی هەبێت، بە بۆچوونی من پرۆژەیەکی گەورەیە، بەرزەخێکە لە نێوان (قەلب و ڕۆح)دا هەرگیز مرۆڤ پیر نابێت ئەگەر بەردەوام مرۆڤ لەگەڵیدا بێت و بیخوێنێتەوە، عیشقێکی گەورەیە، بەلام لەگەڵ ئەوەشدا لەبەر ئەوەی ویستوویەتی بەو ئەزموونە بەرگری لە (دین) بکات چرکەساتی واش بووە و تیایەتی کە یەك مانا دەکرێت بە چەند شێوە لای (نوورسی) بەکار بێتەوە، بەلام من دەمەوێت ئەو ئیعتیرافەش بکەم کە لە سەرەتاوە (نوورسی) بوو پیشانی دام کە بە چاوی ئاسایی سەیری شتەکان نەکەم و چاوێکی دیکەم ببێت و بە چاوی دڵ شت بدۆزمەوە، هەندێك چرکەساتی کورت کورتم هەیە کە لە سەرەتای فەقیەتیمەوە نووسیومە و تەنها چرکەیەکە ئەوە (نوورسی) وایلێکردم بە تایبەتی خوێندنەوەی (مەسنەوی)یەکەی – کە بە تەما هەم بەراوردێك بکەم لە نێوان (مەسنەوِی مەعنەوی) کە هی(مەولانا)یە لەگەڵ(مەسنەوی نووری)یەکەی مامۆستا (نوورسی)دا– دەشێت بڵێم (نوورسی) عاریفێکی گەورە و ئەدیبێکی گەورە و مەعریفەتناسێکی سەردەمی خۆی بووە، تەنانەت خاڵێك کە لای (نوورسی) زۆر جێگەی سەرنجە تواناى لەبەر کردنیەتی، ئەو هەموو شیعرە فارسیەی کە هێناویەتی، تەنانەت لە وەرگێڕانەکەیدا هەڵەیان کردووە، بەلام ئەو بۆ خۆی جوان تەوزیفی کردوون، ئینجا ئەو ئەزموونە ڕۆحییەی کە هەیبووە لەگەڵ خودادا، ئێمە کە هەست دەکەین خودا قسەمان لەگەڵ ناکات، بەلام ئەو ئەم هەموو قسە جوانانەی پێکراوە لەبەردەم (خودا)! ئاخر ئەگەر من شەرم بکەم لەگەڵ کەسێکدا قسەم زۆر جوان بۆ نایەت، یان ئەگەر نەیناسم تا ئەوکاتەی کە دەبینە ناسراوی یەکتر و وامان لێدێت ڕاز و نیازی خۆمی لا بڵێم و ببینە هاوڕێ. ئەو موناجاتانەی کە (نوورسی) کردوویەتی دیارە لەگەڵ خودا –جل جلالە– زۆر دۆستە، زۆر وەلیە بە مانا

قورئانیەکەی ئەوەی کە لای مامۆستا ناصر هەیە، دوایی لە باسی (سوبحانی)دا باسی دەکەین، وەلە بەو مانایەی کە زۆر دۆستە لەگەڵ خودادا، نەگەیشتۆتە پلەی (خیللەت – خلیل) وەك ئەوەی حەزرەتی ئیبراهیم و پێغەمبەری خودا (د.خ) بەڵام زۆر دۆست بووە! بێتاقەت نەبووە شەو تا بەیانی نوێژی کردووە، موناجاتەکانی نموونەی ئەدەبیاتی گەورەن کە لەگەڵ خالیقی بووندا بکرێن، کە بە مەعشوقێکدا بووترێن کە لەبەرچاو نیە لەبەر (دڵ)ە، بە راستی گەورەن، بە راستی نموونەی ئەدەبیاتی ئەم سەردەمەن، ئەگەر (گۆتە) بە (مەولانا) و (حافیزی شیرازی) موعجەب بووبێت ئەوا دەبێت شاعیرەکانی سەردەمی نوێش بە (نوورسی) موعجەب بن! واتە من کە شیعری کوردی دەخوێنمەوە بە بەراورد لەگەڵ موناجاتەکانی (نوورسی)دا منالانە دێتە بەرچاوم، (کورد بوونی عاریفانە) بێجگە لەمانەش رۆحی خاکیانەی (سەعید نوورسی)، تەنانەت باسی ئەوە دەکات کە ئەو کەسێك بووە لە ناو عەشایەرە کوردەکاندا پێگەیوە، (نوورسی) شتەکانی تورکیە بەڵام بە رۆحێکی کوردانە وتراوون، ئەمەش دواجار هەموو عاریفێك لە دونیادا وایکردووە، مەعریفەی نەتەوەی خۆی و سەردەمی خۆی تەوزیف کردۆتەوە لە ئەزموونە رۆحیەکەی خۆیدا، وەکو چۆن (مەولانا) و (حافیز) و (شێخی سەعدی) و...بەوجۆرەیان کردووە، (نۆورسی)ش ئەمەی کردووە، بەڵام ئەو کەسێکی نەتەوەپەرست نەبووە چونکە زانیویەتی کە نەتەوایەتی بوون بە مانا مۆدێرنەکەی فاشیەت دروست دەکات، کە ئەمە دەرەنجامێکی زۆر گرنگە ئەو گوتوویەتی، واتە من ئەو دەرەنجامەم لای (مەکئەنتاییر) بینی یەکەمجار کە ئەو دەڵێت ژیانی بە کۆمەڵ لە سەردەمی نوێدا فاشیەت دروست دەکات بۆیە ئەو ئەمەی ناوێت، دوایی سەیرم کرد (سەعید نوورسی) نزیکەی پەنجا ساڵ پێش (مەکئەنتاییر) ئەم دەرەنجامەی گرتووە،! کە فیکری نەتەوەیی ئایدۆلۆجیا فاشیەت دروست دەکات، ئەوە نیە کە دەوترێت عەرەبە فاشیستەکان و کوردە فاسیستەکان و..بە راستی من دەبینم کە نەتەوە پەرستە کوردەکان ئەگەر بۆیان بکرێت عەرەبەکان چیان کردووە بە ئێمە ئەوانیش ئەوە دەکەنەوە بە ئەوان!

مامەڵەی عاشیقانە لەگەڵ نەتەوەدا جیاوازە لەگەڵ مامەڵەی رەگەز پەرستانە لەگەڵ نەتەوەدا، تەنانەت کە باسی تیرۆریزم دەکەم لە سەردەمی نوێدا، بە بۆچوونی من تیرۆریزم لە (دین)ەوە نەهاتووە، (دین) عیشق دروست دەکات، (دین)

لەتافەت و ناسکی دروست دەکات، (دین) (نوورسی) دروست دەکات (دین) مەولانا دروست دەکات، (دین) حافیزی شیرازی دروست دەکات ئەوانە ترۆپکی دینن! بەڵام سەردەمی نوێ ڕێگە نادات ئا ئەمانە بوونی ببێت! ئەم ڕۆحە ناسکانە بوونیان ببێت! (سەعید نوورسی) گرنگی لەوێدا بووە کە بەو ڕۆحە ناسکەی پێش مۆدێرنەوە مامەڵەی لەگەڵ نەتەوەی کورددا کردووە! کاتێك کە ڕەچەتەی کورد لە (ئەمیر داغ)دا دەخوێنیتەوە دەزانیت کە ئەو چەند کوردی خۆشویستووە بەڵام خۆشویستنێکی عاریفانە نەك ڕەگەز پەرستانە، چەندێك عاشیق مامەڵە لەگەڵ شتەکاندا دەکات، چەند ناسك شتەکان دەبینێت، بەوجۆرەش (نوورسی) نەتەوە و عەشیرەتەکەی خۆی بینیوە، بەڵام زۆر خۆی لەوە بە دوور گرتووە کە نەتەوە بکاتە ئایدۆلۆجیا نەوەکو تووشی فاشیەت ببێت، من وامدەزانی کە هەر بە موعجەب بوونی بە خەلافەتی سەردەمی پێش مۆدێرنە ئەوەی کردووە، دوایی بۆم دەرکەوت تا ئەو بە ئەنقەست ئەمەی کردووە، زانیویەتی کە ئەوە فاشیەت دروست دەکات، زانیویەتی ئەمە خوێن دەڕێژێت، بۆیە دەبێت ئەو بەرگری لە نەتەوەی خۆی بکات بەڵام لە ڕێی ناسکیەوە، وەکو مرۆڤ نەوەکو کەسێکی نەتەوە پەرست.

## خوێندنەوەی ئەکادیمیای سەردەمی نوێ و خوێندنی پێش مۆدێرنە:

یەکێك لەو شتانەی جێی بیرکردنەوەیە و دەبێت ڕۆشنبیری ئێمە لە بەرامبەریەوە بوەستێت لە ژیاننامەی (سەعید نوورسی) و تەنانەت (کاك ئەحمەد) و (مامۆستا ناصر)یش بریتیە لە قابیلیەتی مەعریفەی نارەسمی حوجرە بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی لەگەڵ سەردەمدا، فەقێیەکی کوردی وەکو (مامۆستا ناصری سوبحانی) فەقێیەکی جوانکیلەی وەك (ئەحمەدی موفتی زادە)، فەقێیەکی کوردی وەك (سەعید نوورسی) یان بڵێین مەلا سەعیدێك کە زۆر تاوانباریان کردووە بەوەی کە ئەو کوردە، واتە ئەم فەقێ کلاسیکیە شەهادەی ئەکادیمیای نیە، لێهانوویی ئەم ڕۆشنبیریە وابکات لە کەسێك کە بتوانێت نەقسەکانی سەردەمی نوێ کەشف بکات، بەڵکو بتوانێت بەرگریکار بێت لە ڕۆشنبیری پێش سەردەمی مۆدێرنە لە سەردەمی نوێدا، ئاخر ئەگەر ئێمە سێ جۆر ڕەخنەگرمان ببێت لە سەردەمی نوێدا، هەیە لە سەردەمی

نوێوە رەخنەی سەردەمی نوێ دەكات، هەیە لە نەریتەوە لە رۆشنبیری پێش سەردەمی نوێوە رەخنەی سەردەمی نوێ دەكات: هەشە لە دوای سەردەمی نوێوە بە مامەڵەیەكی پۆست مۆدێرنیانە نەقدی سەردەمی نوێ دەكات، ئەوا هەریەكە لە (سوبحانی و موفتیزادە و نوورسی)ش رەخنەگری پێش سەردەمی مۆدێرنەن لە سەردەمی نوێ، بەڵام باش رۆحی سەردەمی نوێیان ناسیوە، بۆ نموونە ئیجتیهادەكانی (مامۆستا ناصر) لە نیزامی سیاسیدا، لە نیزامی ئابووریدا دەبینیت بۆشاییەكانی سەردەمی نوێی دۆزیوەتەوە، (كە هاتینە خزمەتی (مامۆستا ناصر) خۆی ئەمە روونتر دەبێتەوە).

رۆشنبیری (مامۆستا نوورسی)ش باش بۆشاییەكانی فیكر و فەلسەفەی نوێی دۆزیوەتەوە و نەقسەكانی سەردەمی نوێی پیشانداوە، هەروەك چۆن (مامۆستا ئەحمەدی موفتیزادە) لە فەلسەفەدا نەقدی (هیگڵ) دەكات لە بابەتی (دیالێكتیكی ئیسلامی)دا، باش نەقسی هیگڵی دۆزیوەتەوە.

(سەعید نوورسی) كە لە ساڵی (١٨٧٦)دا لە دایك بووە و سەد ساڵ لەوەو پێشتریش (مەولانا خالید) لە هەمان كاتدا و لەو رۆژەدا لە دایك بووە! ئەم پیاوە كە لە سەدەی نۆزدەدا ژیاوە و تا پەنجاكانی سەدەی بیست چالاكی خۆی هەبووە، ئیتر لەوەو دووا بەرەبەرە نەخۆش كەوتووە و پیر بووە، خەریكی كۆكردنەوەی (پەیامەكانی نوور) بووە زیاتر تا ئەوەی كە شتی نوێ بڵێت. ئەم پیاوە كە بڕوانامەی سەردەمی مۆدێرنەی نیە كە یەكێك لە تایبەتمەندیەكانی سەردەمی نوێ بریتیە لە بڕوانامە، ئەسڵەن دەزگایەكی مەعریفیشی نەبووە كە یارمەتی بدات، تەنها كەسایەتی زاتی خۆی و رۆحی خۆی، خۆی و دڵی، خۆی و عەقڵی، خۆی و فەقیری خۆی، خۆی و ئینعیزالی، خۆی و پۆلیس بە چواردەوریدا، خۆی بەستنەوەی ئازادی توانیویەتی بەرامبەر ئەو هەموو مەعریفە نوێیە ببێتەوە، سوود لە چاكەكانی وەربگرێت و خراپەكانیشی دەربخات، كە زۆر ورد دەست نیشانی نەخۆشیەكانی سەردەمی نوێی كردووە رەنگە زۆر كەم فەیلەسوفێك بوو بێت توانیبێتی ئەوە بكات! سەیری ئەم لێهاتووییە بكە بەو رۆشنبیریە كلاسیكیەوە! ئێمە بە تەما نەبین ریفۆرم لە وڵاتی ئێمەدا لە ئەكادیمیاوە بكرێت، ریفۆرم لە دەرەوەی ئەكادیمیاوەیە، واتە پیاوێك خۆی تەنها بەرامبەر بە دەوڵەتێك دەوەستێت، دەوڵەتێك كە دەیەوێت ئەزموونێكی سەقەت لە رۆژئاواوە بهێنێت بە ئامادەیی نەك ئەوەی بە رۆحی

بەنەوەکەی بخوات، بیسەپێنێت بەسەر ئەو نەتەوەیەدا، هەتا ئێستاش هەڵەکانی ئەو ئەزموونەی (کەمال ئەتاتورك) کەشف دەکرێت، پیاوێکی وەکو (نوورسی) خۆی بە تەنها و بە فەقیری، ئەسڵەن زمانی تورکیشی نەزانیوە بەو مانایەی (لەتمە) لە زمانیدا هەبووە چونکە کورد بووە، خۆی دەڵێت من تورکێکی شاخی بووم بە زمانی ئەوان، بە تەواوەتی خەتیشی نەبووە، خەتێکی روونی نەبووە قوتابیەکانی بۆیان نووسیوەتەوە، کەواتە مەعریفەی رەسمی نیە، تەنانەت ئەمە لای (کاك ئەحمەد)یش دووبارە دەبێتەوە کە خوێندنی ئەکادیمی نەبووە کەچی وانەی لە زانکۆ وتۆتەوە دووای ئەوەی ئەو هەموو مەعریفە قووڵەی هەبووە و فەیلەسوفەکان هاتوون پرسیاریان لێکردووە، ئەمەش دووبارە لە باسی (کاك ئەحمەد) خۆیدا زۆرتر لە سەری دەچین، تەنانەت (مامۆستا ناصر)یش بە هەمان شێوە بووە، ئەو نەقدەی کە (سوبحانی) و (موفتیزادە) لە دەستوری ئێرانی دەکەن کەم خەبیر لە بواری دەستور و نووسیندا هەن بتوانن ئەو نەقدە بکەن، کەواتە رۆشنبیری مەرج نیە لە ئەکادیمیاوە بێت کە ئەمە لە تایبەتمەندیەکانی ئەو شەخسیەتیە مەزنەی کوردە، شتی هاوبەش زۆرە لە نێوانیاندا، یەکێکی دیکە لەو شتە هاوبەشنە قسەکردنیان لەگەڵ غەیب، ئەو نامەیەی کە (مامۆستا ناصر) بۆ پێغەمبەرانی دەنێرێت (من أرض البلایا) لە کوردستانەوە، قسە کردنە لەگەڵ پێغەمبەرانێك کە بە جەستە ئامادە نین، ژیانیان وا لە جیهانی رۆحدا! (نوورسی)ش شتی لەو بابەتەی هەیە کە قسە لەگەڵ غەیب دەکات، قسە لەگەڵ جیهانی فریشتە دەکات، قسە لەگەڵ جیهانی پێغەمبەران دەکات، ئەو خەو بینینانەی کە بە پێغەمبەرەوە دەیبینێت، یەکێکی دیکە لەو هاوبەشیانە (خەو بینین)یانە، یان پشت بەستنیان بە (خەو)، بۆ نموونە (سوبحانی) لە تەفسیری سورەتی (یوسف)دا باسی تەئویلی خەو دەکات، کە ئەمەش یەکێکە لەو زانستانەی ئەمرۆ بوونیان نیە، یەکێکی دیکە لە هاوبەشی نێوانیان بریتیە لە زەکاوەتی بێ سنوری هەرسێکیان، کە هەرسێکیان تاقیکراونەتەوە لە چەندین شوێندا، مەواقیفی تاقیکردنەوەی (سەعید نوورسی) کە هەموو زاناکان کۆکراونەتەوە و چی پرسیاریان لێکردووە وەڵامی داونەتەوە لە چەندین جاردا! (کاك ئەحمەد) یەکەم تاقیکردنەوەی لەلایەن باوکیەوە بووە، دوای ئەوەی کە لە فەقێیەتی دەگەڕێتەوە لە کوردستانی عێراق و دەڕواتەوە بۆ کوردستانی ئێران، لە داخی وەك دەڵێت ماڵی باوکی کە یەکێك بووە لە ماڵە دەوڵەمەندەکانی سنە و وتاربێژی سنە

بووه و دەعوەتێکی سەرۆك پۆلیسی سنەیان کردووه که چەندین خۆراکیان داناوه، ئەویش بیری لەوە کردۆتەوە کە هەژارەکان لەوە بێبەشن ماڵی باوکی بەجێهێڵاوە و هاتووە بە فەقێیەتی لە کوردستانی عێراق ژیاوە، تەنانەت لە ناوچەی تەوێڵە و عەبابەیلیێ و..ئەوانە فەقێ بووە، بۆیە کە دەگەڕێتەوە بۆ سنە باوکی تاقیدەکاتەوە کە دەرسێك بڵێتەوە دەربارەی (جمع الجوامع)، دوایی باوکی سەری سوڕدەمێنێت کە ئەم هەموو زانستە لە کوێوە فێر بووە، (کاك ناصر)یش چەندجار مەوقیفی وەهای بەسەرهاتووە، تەنانەت ئەوەندە (فەقیه) بووە نامەیەکی نووسیوە بۆ (شێخ عوسمان)، شێخ لە وەڵامدا وتوویەتی من ناتوانم وەڵامی ئەوە بدەمەوە! چەندجار نامەی ناردووە بۆ فەقیهە گەورەکانی شیعە هەموویان دەستەوسان بوون لە وەڵامدانەوەیدا، تەنانەت خومەینیش.

یەکێکی دیکە لە شتە هاوبەشەکانیان ئەوەیە کە توانیویانە هەرچی ئیمکانیات لە کلتوری تەقلیدیدا هەیە چ لە (عیرفان)دا، چ لە (فەلسەفە)دا، چ لە (فیقه)دا بیگەیەننە ئەوجی خۆی! بۆ نموونە وازانراوە لە عیرفاندا شتێکی تازە ناهێنرێت بەڵام (سەعید نوورسی) هێناویەتی.

وازانراوە لە (فیقه)دا شتێکی تازە ناکرێت بکرێت، ئەوەتا (محمد عابد جابری) وادەڵێت کە فیقه ئیتر ·هیچی تازەی پێناکرێت، بەڵام (ناصری سوبحانی)· کردوویەتی، تەنانەت وازانراوە لە (فەلسەفە)دا شتێکی نوێ ناووترێت، بەڵام (موفتیزادە) هێناویەتی لە جیهانی (زەین)دا ئەو جیهانەی کە خۆی زۆر ئاماژەی پێدەکات، بێجگە لە هێنانی هەموو ئیمکانیاتەکانی کلتوری کۆن، بۆشاییەکانی سەردەمی نوێشیان بینیوە کە ئەمەش تایبەتمەندیەکە لە هەرسێکیاندا هەیە، جگە لەمانەش زاهید بوونی هەرسێکیانە، (سوبحانی) و کوڵەباڵەکەی و ژیانە هەژارانەکی، (مامۆستا سەعید نوورسی) و مێزەرە کوردانەکەی کە لەسەریدا بووە هەتا ئەو ڕۆژەش کە مردووە، دوای خۆی هیچی بەجێنەهێڵاوە، (ئەحمەدی موفتیزادە) و چاکەت و شەرواڵە کوردیە هەژارانەکەی، کە هەژارەکانی سنە بەو جۆرە دەژیان، بۆیە ئەویش ئەو جۆرە بەرگەی هەڵبژاردبوو! سەیری ئەو ڕۆحە زاهیدانەیان کە ئەمڕۆ بوونی نیە.

## دووبارە سەعیدی کۆن و سەعیدی نوێ

## ئەزموونی ڕۆحی لە سەردەمی نوێدا:

ئەگەر بەراوردێك بکەین لە نێوان (سەعیدی کۆن) و (سەعیدی نوێ)دا، کە سەعیدی کۆن لە سەردەمێکدا ژیاوە کە سەردەمی خەلافەتی ئیسلامی و سەردەمی کۆنە، سەعیدی کۆن کاتێکە کە سەعیدی مەعریفەیە، مەعریفەیەکیش کە مەعریفەی سەردەمی کۆنە، کاتێك کە شەریعەت وەڵامی پرسیارەکانی خەلافەتی ئیسلامی دەداتەوە، عیرفان لایەنی ڕۆحیان پڕدەکاتەوە و ڕێگەکانی تەسەوف بوونیان هەبووە کە (سوڵتان عەبدولحەمید) برەوی پێدەدان، فەلسەفە و عیلمی کەلامی کۆنیش هێشتا دەخوێنران، لە نیزامی حوجرەی کوردستاندا دەخوێنران، ئەو سەعیدە کۆنە کە لەو زانستانەدا بلیمەت بوو لە سەرەوە بوو خەڵکی هەموو دەیانناسی ئاماژەیان پێدەکرد، خەلیفە ڕێزی لێدەنا، تەنانەت ئالەوکاتەدا کە دەڕوات بۆ شام وتارێك دەدات کە بە وتاری شامیە ناسراوە، هەتا ئێستاش ئەو وتارەی ماوە، واتە سەعیدی کۆن سەعیدێکە لە سەرەوەیە، چونکە مەعریفەی ئەو سەردەمەی خۆی پێیە، زانستەکانی سەردەمی خۆی و سەردەمی کۆنی هەمووی پێیە، بەڵام ئەم سەعیدە لە سەردەمی نوێدا دەوڵەتی نوێ قبوڵی ناکات! هەمیشە دەبێت لە شاخەکان بژی، لە زینداندا بژی، کە دەچێتە ناو دەزگاکانی حکومەتەوە کێشەیان بۆ دەنێتەوە، بۆ نموونە (کەمال ئەتاتورك) بانگی دەکات دەڵێت ئامۆژگاریمان بکە، کەچی ئەو دەڕوات باسی (نوێژ)یان بۆ دەکات! کەمال ئەتاتورك بۆیە بانگی دەکات وەك ئەوەی هانیان بدات بۆ ئەوەی یەکبگرن، ئەنجومەنێکیان هەبووە لە ئەنقەرە وەکو بڵێیت ئەنجومەنی شۆڕش کە هێشتا نەبۆتە دەوڵەت وەکو پەرلەمانێك بووە کە کەمال ئەتاتورك هێشتا خەریکی شۆڕشکردنە، ئەم ئەنجومەنە کە (مامۆستا نوورسی) پشتیوانی ئەو شۆڕشانەی کردووە کە دژی ئینگلیز و وڵاتانی داگیرکەر بووە، بۆیە بانگی دەکەن بۆ ئەوەی ئامۆژگاریان بکات، بەڵام (نوورسی) باسی (نوێژ)یان بۆ دەکات، کەمال ئەتاتورك دەڵێت ئێمە تۆمان بانگ کرد یەکێتی لە نێوانماندا دروست بکەیت کەچی بوویتە مایەی ناکۆکی لە نێوانماندا کە هەندێکمان نوێژ دەکەین و هەندێکمان نویژ ناکەین، ئەویش دەڵێت پاشا پاشا.. ئەوەی نوێژ نەکات هەڵگەڕاوەیە و حوکمی هەڵگەڕاوەش لە ئیسلامدا کوشتنە! واتە دەتکوژین،

ئا ئەم سەعیدە کۆنە، ئەم سەعیدە کە عاریفێکە لە سەردەمی نوێدا جێی نابێتەوە، هەر بۆیە بە شێت ناوی دەبەن، تۆمەتی ئەوەی دەدەنە پاڵ کە دژی شتە نوێیەکانە، کۆنەپەرستە و دەیەوێت خەڵك بگەڕێنێتەوە بۆ سەردەمەکانی پێشووتر، ئەو تۆمەتانەی کە لە دادگاکاندا کراوە بەرامبەری لەمەوە خەسڵەتی سەردەمی نوێت بۆ دەردەکەوێت کە جێگەی ئەزموونی رۆحی تێدا نابێتەوە، ئەگەر بشبێتەوە دەبێت وەکو (سەعید نوورسی) پاڵەوان بێت! ئاخر پاڵەوان بووە کێ هەیە بتوانێت نەژن بهێنێت، نەماڵی ببێت، ئەوەندە خواردنێکی کەمی ببێت کە هەرئەوەندە بخوات کە پێی بژی زۆر نەخوات! لە شەو و رۆژێکدا پێنج سەعات بنوێت! مەگەر کەسە پاڵەوانەکانی وەکو نوورسی بتوانن لەم سەردەمەدا بژین، بۆیە ئەو پاڵەوانەن دەبێت لە پەراوێزی کۆمەڵگەوە بژین رێگەیان نادرێت، بەڵام ئەوە پاڵەوانەکانن کە وەڵامی خۆیان پێیە، بۆ نموونە (سەعید نوورسی) کە حەساری دەخەنەسەر و دەیخەنە ژێر چاودێرییەوە بەڵام لە دادگادا وەڵامێکی وەها دەداتەوە کە دادوەرەکان قەناعەت پێدەکات و لە هەموو دادگاکاندا بەبێ تاوان دەردەچێت، سەرەڕای ئەو پاڵەوان بوونەش دەبێت لە پەراوێزی کۆمەڵگەدا بژی.

لە سەردەمی نوێدا (نوورسی) یەکێك نەبووە لە پیاوانی دەوڵەت، راستە کەسایەتی ناسراو بووە و ناوبانگی بووە بەڵام خەڵکی بۆ بەزەکەت ویستوویانە بیبینن بەوەی کە هەیمەنەی رۆحی و مەعنەوی هەبووە، خەڵکی سوودیان لە ئەزموونە رۆحی و ئیمانیەکەی بردووە.

## پەراوێزەکان:

١- داریوش شایگان، ئاسیا لە بەرامبەر خۆرئاوادا، وەگێڕانی شۆڕش جوانڕۆیی، مامەند رۆژە، خانەی وەرگێڕان سلێمانی، چاپی یەکەم، ٢٠٠٤،ل ٧٤.

٢- سنت و سکولاریسم، عبدالکریم سروش، شبستری، مصطفی ملکیان، محسن کدیور، مؤسسەی فرهنگی صراط، چاپ دوم ١٣٦٣، ص٥.

٣- عبدالکریم سروش، حکمت و معیشت، دفتر نخست، مؤسسەی فرهنگی صراط، چاپ اول.

٤- مەلا عەبدولکەریم مودەڕیس، فاتح عەبدولکەریم، دیوانی نالی، چاپی یەکەم لەلایەن دەزگای بڵاوکەرەوە، انتشارات صلاح الدین ایوبی، ارومیە، ایران، ١٣٦٣ی هەتاوی.

٥- سەرچاوەی پەراوێزی ژمارە (٢) ل٥٠ بەدواوە.

٦- سەرچاوەی پەراوێزی ژمارە (٣) بەرگی دووەم ل ٥٠.

٧- بدیع الزمان سعید النورسی، سیرة الذاتیة، اعداد وترجمة: احسان قاسم الصالحی، دار سوزلر للنشر، استانبول الطبعة الاولی، ١٩٩٨، ص٥٣٣.

٨- هەمان سەرچاوە، ل٥٢٢.

٩- لە نامەیەکی هاوڕێی موفتیزادە مامۆستا بورهانی ئەمینی کە بۆی نووسیوم و باسی ژیاننامەی ئەحمەدی موفتیزادەی تێدا کردووە.

١٠- بدیع الزمان سعید النورسی، المثنوی العربی النوری، نشر: دار سوزلر للنشر، استانبول، الطبعة الثانیة، ١٩٩٤، ناونیشانی هەر (١٣) (ریسالە)کەی ئەو کتێبە.

١١- عومەر عەبدولعەزیز، دوو کاسێتی ژیاننامەی مامۆستا ناصری سوبحانی، کاسێتی دووەم.

١٢- احسان قاسم الصالحی، بدیع الزمان سعید النورسی نظرة عامة عن حیاتە واثارە، دارسوزلر للنشر استانبول ١٩٨٧ ص٢٦.

١٣- قورئانی پیرۆز، سورەتی (التکویر) ئایەتی (١٨).

١٤- عومەر عەبدولعەزیز، ژیاننامەی شەهید ناصری سوبحانی، دەستنووس.

١٥- سەرچاوەی پەراوێزی ژمارە( ٧) ل٦٣.

١٦- هەمان سەرچاوە ل٥٤٢.

١٧- سەرچاوەی پەراوێزی ژمارە (١٠).

١٨- سەرچاوەی پەراوێزی ژمارە (٧) ل٦٨.
١٩- سەرچاوەی پەراوێزی ژمارە (١٣) ل٢٠٢.
٢٠- سەرچاوەی پەراوێزی ژمارە (٧) ل٥٢٤.
٢١- سەرچاوەی پەراوێزی ژمارە (٧) ل٥٢٤.
٢٢- بديع الزمان سعيد النورسی، السنة النبوية سنة كونية و حقيقة روحية، ت: ترجمة احسان قاسم الصالحی، بتعليق اديب الدباغ، مطبعة الشعب ببغداد ١٩٨٥.
٢٣- سەرچاوەی پەراوێزی ژمارە (١٠).
٢٤- عبدالكريم سروش، حكمت و معيشت، دفتر نخست، مؤسسەی فرهنگی صراط، چاپ اول.
٢٥- سەرچاوەی پەراوێزی ژمارە (١٠).
٢٦- سەرچاوەی پەراوێزی ژمارە (١٣)ل (١٤٣-١٤٧).
٢٧- قورئانی پیرۆز، سورەتی (الاعراف)، ئایەتی (٥٤).
٢٨- سەرچاوەی پەراوێزی ژمارە (١٠).
٢٩- سەرچاوەی پەراوێزی ژمارە (١٣) ل١٤٥.
٣٠- مصطفی ملكيان، راهی به رهايی، نشر نگاه معاصر، چاپ اول، تهران، ١٣٨١
٣١- سەرچاوەی پەراوێزی ژمارە (١) (٥٥-٨٠).
٣٢- الطبيعة، بديع الزمان سعيد النورسي، ترجمة احسان قاسم الصالحی، مطبعة الزهراء الحديثة بالموصل ١٩٨٥.
٣٣- سەرچاوەی پەراوێزی ژمارە (١٠) ل١٠٤.
٣٤- بەدیعوزەمان سەعیدنوورسی، وتەکان، فاروق رەسول یەحیا کردوویەتی بە کوردی، نشر احسان، تهران، ١٣٨٣، ل٧١٩-٧٣٧.
٣٥- سەرچاوەی پەراوێزی ژمارە (٧) ل٥٥.
٣٦- ناصری سوبحانی، تەفسیری سورەتی یوسف، سەرچاوەی پەراوێزی ژمارە (٣).
٣٧- سەرچاوەی پەراوێزی ژمارە (٧) ل٥٥.
٣٨- سەرچاوەی پەراوێزی ژمارە (٧) ل٤٨٧.
٣٩- سەرچاوەی پەراوێزی ژمارە(٧) ل١٥٥.
٤٠- سەرچاوەی پەراوێزی ژمارە (١٠).
٤١- سەرچاوەی پەراوێزی ژمارە (١٠).

٤٢- سەرچاوەی پەراوێزی ژمارە (٧).
٤٣- سەرچاوەی پەراوێزی ژمارە (١٣) ل٦٩.
٤٤- سەرچاوەی پەراوێزی ژمارە (٧).
٤٥- سەرچاوەی پەراوێزی ژمارە (٧) ل١٥٢.
٤٦- سەرچاوەی پەراوێزی ژمارە (١٣) ل٥٦.
٤٧- سەرچاوەی پەراوێزی ژمارە (٧) ل٢٠٧.
٤٨- سەرچاوەی پەراوێزی ژمارە (٧) ل١٧٣.
٤٩- سەرچاوەی پەراوێزی ژمارە (٧) ل١٦١.
٥٠- عبدالكريم سروش، قصەی ارباب معرفت، مؤسسەی فرهنگی صراط، چاپ پنجم، ١٣٧٣، ص٢٠٠.
٥١- سەرچاوەی پەراوێزی ژمارە (٧).
٥٢- عبدالكريم سروش، آينەی دوم، تفسير مثنوی، دفتر دوم، نيستان جم تهران، زندگی مولانا، (C.D).
٥٣- سەرچاوەی پەراوێزی ژمارە (٧) ل٦٩.
٥٤- سەرچاوەی پەراوێزی ژمارە (٥٢).
٥٥- سەرچاوەی پەراوێزی ژمارە (٥٢).
٥٦- سەرچاوەی پەراوێزی ژمارە (٧) ل٥٣٨.
٥٧- هەمان سەرچاوە ل٣٦٢.
٥٨- سەرچاوەی پەراوێزی ژمارە (٧) ل ٥٣٦-٣٦٢.
٥٩- هەمان سەرچاوە ل٦٠.
٦٠- هەمان سەرچاوە ل٤٦١.
٦١- هەمان سەرچاوە ل ٤٦١.
٦٢- سەرچاوەی پەراوێزی ژمارە (٧) ل٢٣٧.
٦٣- سەرچاوەی پەراوێزی ژمارە (٧) ل١٦٦.
٦٤- تەحسین حەمە غەریب، رۆحی حیکمەت و بینینی نووری عیرفانی مەحوی، سلێمانی، ٢٠٠٢.
٦٥- عومەر عەبدولعەزیز، دووکاسێتی ژیاننامەی ناصری سوبحانی، کاسێتی دووەم.
٦٦- سەرچاوەی پەراوێزی ژمارە (٧) ل ٤٥٠.
٦٧- سەرچاوەی پەراوێزی ژمارە (٧) ل١٨٦.
٦٨- سەرچاوەی پەراوێزی ژمارە (٣٤) ل ٧٤٦-٧٤٨.

٦٩- سەرچاوەی پەراوێزی ژمارە (١٠).
٧٠- سەرچاوەی پەراوێزی ژمارە (٧).
٧١- سەرچاوەی پەراوێزی ژمارە (٣٤) ل ٧٠٦-٧١٤.
٧٢- سەرچاوەی پەراوێزی ژمارە (٧) ل٢٠٨.
٧٣- هەمان سەرچاوە ل٤٨٧.
٧٤- عبدالكريم سروش، قمار عاشقانه، مؤسسەی فرهنگی صراط، چاپ دوم ص٤٢.
٧٥- سەرچاوەی پەراوێزی ژمارە (٥٢).
٧٦- سەرچاوەی پەراوێزی ژمارە (٢٢).
٧٧- سەرچاوەی پەراوێزی ژمارە (٧) ل ١٧٥-٢١١.
٧٨- هەمان سەرچاوە.
٧٩- هەمان سەرچاوە ل ١٣٣- ٢٣٣.
٨٠- د. محمد سعيد رمضان البوطي، مطبعة دار الجزائر، دمشق.
٨١- سەرچاوەی پەراوێزی ژمارە (٧) ل٥٢٢.
٨٢- سەرچاوەی پەراوێزی ژمارە (٧) ل (٢١٠. ٢١٣، ٢٥١، ٣٠٣، ٣٢٧، ٣٥٧.
٨٣- سەرچاوەی پەراوێزی ژمارە (٧) ل٤١.
٨٤- سەرچاوەی پەراوێزی ژمارە (٧) ل٦٦.
٨٥- سەرچاوەی پەراوێزی ژمارە (٧) ل٤٨٥.
٨٦- سەرچاوەی پەراوێزی ژمارە (٧) ل٦٩.
٨٧- سەرچاوەی پەراوێزی ژمارە (١٣).
٨٨- قورئانی پیرۆز، سورەتی (البقرة)، ئایەتی (١٢٩).
٨٩- قورئانی پیرۆز، سورەتی (ال عمران) ئایەتی (١٦٤).
٩٠- سەرچاوەی پەراوێزی ژمارە (١٠) ل (٤٩، ٥١، ٤٤).
٩١- سەرچاوەی پەراوێزی ژمارە (٧) ل١٧٥.
٩٢- سەرچاوەی پەراوێزی ژمارە (٧) ل ٥٢٣.
٩٣- هەمان سەرچاوە ل ١٧٥.
٩٤- هەمان سەرچاوە ل٣٦٦.
٩٥- هەمان سەرچاوە ل٢٣٠، ٢٣١.
٩٦- سەرچاوەی پەراوێزی ژمارە (٣٤) ل (٧٣٥-٧٤٤).
٩٧- هەمان سەرچاوە.
٩٨- سەرچاوەی پەراوێزی ژمارە (٣٢).

٩٩- سەرچاوەی پەراوێزی ژمارە (٣٤) ل (٧٠٦-٧١٤).

١٠٠- سەرچاوەی پەراوێزی ژمارە (١٣) ل (١٩٩-٢٠٢).

١٠١- سەرچاوەی پەراوێزی ژمارە (٣٤) ل ٥٤٥.

١٠٢- سەرچاوەی پەراوێزی ژمارە (١٠).

١٠٣- سەرچاوەی پەراوێزی ژمارە (٣٤) ل (٥٩-١٣٨).

١٠٤- سەرچاوەی پەراوێزی ژمارە (١٣) ل (١٣٩-٢٢٢).

١٠٥- سەرچاوەی پەراوێزی ژمارە (٧٤).

١٠٦- سەرچاوەی پەراوێزی ژمارە (٧) ل ٥٢٦.

١٠٧- بۆ نمونە بڕوانە بابەتەکانی کتێبی المؤتمر العالمی، بدیع الزمان سعید النورسی، ١٩٩٦ الطبعة الاولی.

١٠٨- هەمان سەرچاوە.

١٠٩- سەرچاوەی پەراوێزی ژمارە (٧) ل ٥٢٨.

١١٠- سەرچاوەی پەراوێزی ژمارە (١٣) ل ٢١٢.

## بەشی دووەم
## سوبحانی دوایین فەقیە،
## داستانی ئیجتیهاد و شیمانەکانی فیقهی
## ئیسلامی لەسەردەمی نوێدا.

جوانترین و باشترین پێناسەیەك كە بۆ كەسایەتی مەزنی سوبحانی بكەین بریتیە لەوەی كە دەتوانین بڵێین ئەو فەقیهێكی گەورە بوو. بێگومان كە دەڵێین فەقیە مەبەستمان لە مانا زاراوەیەكەی فیقە نیە وەك ئەوەی بریتی بێت لە : (زانستی رۆژانەی ژیانی موسوڵمانان)(١) وەكوو لە مێژووی شارستانیەتی ئیسلامی و زانستە ئیسلامیەكاندا بەوجۆرە پێناسە كراوە، بەڵكو فەقیە بەو مانایەی كە بەندە بەكاری دێنم واتە شەرعناس كە لە بەرامبەر عیرفان و فەلسەفەوە دایدەنێم. هەر وەك پێشئوتر لە باسی مامۆستا نوورسیدا وتمان كە نوورسی عارێفێكی گەورە بووە، عاریفێك كە لە كۆتایی سەدەی نۆزدە و نیوەی یەكەمی سەدەی بیستەمدا ژیاوە، عاریفێك كە هەر وەكو عاریفەكانی دیكە ئەزموونی رۆحی هەبوو بەڵام لەبری ئەوەی بیەوێت دەرەنجام لە ئەزموونی عیشقی خۆی وەربگرێت گواستیەوە بۆ ئەوەی كە بەرگری لەو ئەزموونە بكات.

بە بۆچوونی من مامۆستا ناصریش لە بواری شەرع و فیقهدا ئەوەی كە بە (شەریعەت) ناسراوە باشترین شەرعناس و دووایین فەقیهی شارستانیەتی ئیسلامیە كە هەرچی ئیمكانیاتێك لە فیقهی تەقلیدیدا مابوو هەمووی دۆزیەوە، ئەو خورافەیەی بەدرۆ خستەوە كە ئیدی لەو فیقهە هیچ شتێكی دیكە هەڵناكرێنرێت و ئیدی بوارێك بۆ هەڵگۆزینێكی نوێ نەماوە ! . سوبحانی توانی لە سۆنگەی فیقهی تەقلیدیەوە بۆشاییەكانی سەردەمی نوێ پیشان بدات. لەمەوە مامۆستا ناصر توانی هەم سەردەمی نوێ بناسێت، ئەمەش ئەو خاڵەیە كەلای سوبحانی ناسەكان زۆر نارۆشنە و بیری لێناكەنەوە كە سوبحانی باش سەردەمی نوێی ناسیوە، كاسێتە

سەرەتایەکانی بەڵگەی ئەم راستیەن و دەریدەخەن کە باش ئاگادار بووە لە سیستەمە سیاسی و فیکری و کۆمەڵایەتیەکانی سەردەمی نوێ، بۆ نموونە دەبینیت کە باسی سیستەمی سیاسی دەکات لە هەمان کاتدا باسی دیموکراسی دەکات، باسی دیموکراسی تەدریجی -سۆسیال دیموکرات- دەکات، باسی دیکتاتۆریەت باسی سیستەمە فیکریەکان و زانستە مرۆڤایەتیەکانی وەکوو کۆمەڵناسی و فەلسەفەی ئەخلاق و دەروونناسی و ...هتد، دەکات(٢)، بەجۆرێك دەتوانین بڵێین بۆشاییەکانی ئەوجۆرە زانستانەی کەشف کردبوو، بەو مانایەی کە دەشێت بڵێم رەخنەگرێکی سوننەتی بووە لەسەردەمی نوێدا، ئەمە لەلایەك و لە لایەکی ترەوە ئەوەندە ئاگادار بووە بەسەر نەریتی شارستانیەتی ئیسلامیدا کە بۆشاییەکانی کلتووری ئیسلامیشی دۆزی بوویەوە. بێگومان ناصری سوبحانی لە تەمەنێکی زۆرکەمدا باش توانیبووی کە ببێتە سەرچاوەیەکی گەورەی مەعریفی، هەم لە کلتوورناسی و هەم لە ناسینی سەردەمی نوێدا، ئەمە لەسەرەتای دەستپێکردنی کاری شێلگیریانەی (جیددی) مامۆستا ناصری سوبحانیەوە. دەشێت بووترێت (مەهدی) بووە بە زاراوەی خۆی، کە مەهدی بوونیش بەواتای هیدایەت دراو و دۆزینەوەی ڕێگای راستەقینەیە. ئا لەو پنتەدا کە دەشێت سەردەمێکە دەست پێدەکات بەکۆتایی هاتنی موتاڵای تەقلیدی ئەو کە سەردەمێك خوێندنەوە و بەدواچوونێکی زۆری هەبووە هەم دەربارەی دونیای نوێ و هەم لە فیکری ئیسلامی و زانستە ئیسلامیەکان لەگەڵ یەکلابوونەوەی بۆ دیراساتی ئیسلامی و قورئانناسی کە دوواتر دەچینە سەری. لێرەدایە کە مامۆستا ناصر کۆکەرەوەی زانستی کۆن و زانستی نوێیە، باش لە سیاسەت دەزانێت و بەهەمان شێوەش لە ئابووری و کۆمەڵناسی و...هتد، بێگومان دەبێت ئێمە حەفتاکان لەبەرچاو بگرین کە هێشتا ئەو کوڕێکی گەنجە لەو زەمەنەدا، گەنجێکە کە بە شەوق و تاسەوە دەیەوێت بەرەو دونیای نوێ و رۆشنبیری بڕوات، لەکاتێکدا کە لە سەربازیدا لە پێشوازی شای ئێراندایە خەریکی خوێندنەوەیە(٣)، لە کاتێکدا کە بە کۆڵان و بازاڕەکانی شاری سنەدا دەڕوات یان ئەو کاتەی لە مزگەوتدایە هەر خەریکی خوێندنەوەی خۆیەتی و دەیەوێت سەردەمی نوێ بناسێت(٤)، ئەو کە لە حوجرەوە هاتبوویە دەرێ دەیویست دونیای نوێ کەشف بکات. بێگومان سەرکەوتوویی ئەو لە ژیانی حوجرەیدا و لەنێو مامۆستا و دەڤەرەکەی خۆیدا دیار و زانراوە، لێرەدا ئەو

نیوەیەی مامۆستا ناصر کە کەمتر قسەی لەسەر کراوە، ئەویش سەردەمناسی ناصری سوبحانیە، بە حوکمی ئەوەی کە زۆرتر بابەت و لێکۆلێنەوە ئایینیەکانی تۆمارکراون ئەوا دیوە فیکری و مەعریفیەکانی دەرەوە ئایینیەکانی بوونەتە دیوی نەبینراوی ئەو و کەمتر لای خەڵکی و سوبحانی ناسەکان دەرکەوتوون و زۆر روون نەبووە لایان. ئەمە نیوەی یەکەمی مامۆستا ناصرە، نیوەی دووەمی بریتیە لە مەعریفەی ئایینی مامۆستا ناصر، شەرعزانی مامۆستا ناصر کە هەر لەسەرەتای فەقێیەتیەوە لەناو هاورێکانیدا تاك بووە و دوای قۆناغی سەرەتایی چووەتە حوجرەو و لەوێ خوێندوویەتی کە هەر زوو زیرەکی و لێهاتووییەکەی سەرنجی مامۆستاکانی راکێشابوو و زۆر پێی سەرسام بوون(٥) کە دەکرێت بڵێین ئەمە یەکێك لە خاڵە هاوبەشەکانی مامۆستا ناصرە لەگەڵ مامۆستا نوورسی و کاك ئەحمەدی موفتیزادەدا. کە هەرسێ کەسایەتیەکە سەرەرای کەم خۆراکی کەم حەویس خەصڵەتی هەمیشەییان بووە، هەروەها دواتر کە خۆی یەکلایی کردۆتەوە بۆ قورئان کە نزیکەی زیاد لە دەساڵی تەمەنی خۆی لەگەڵ قورئاندا ژیاوە وەکو چۆن ئەوەی مامۆستا نوورسی لە ساڵی (١٩٢٣)ەوە بەدواوە تا پەنجاکان خۆی یەکلایی دەکاتەوە بۆ مەعریفەی ئایینی و بۆ تەفسیری قورئان و پەیامەکانی نوور(٦).

بەهەمان شێوەش مامۆستا ناصر دەساڵی پێش دەستگیرکردنی لەلایەن (ئیتلاعاتی) ئێرانیەوە بەتەواوەتی لەگەڵ قورئاندا ژیاوە(٧)، لێرەوە کەواتە ئەو کۆکەرەوەی مەعریفەی ئایینی و مەعریفەی نوێیە، بەلام مەعریفە نوێیەکەی مرۆڤێك دەتوانێت بیدۆزێتەوە کە لە مەعریفەی سەردەمی نوێ شارەزا بێت، کەسێك کە رۆشنبیریەکی ئایینی نەریتی هەیە لەوە تێناگات هەر بۆ نموونەش ناتوانێت دەرکی ئەو مەعریفە فراوانەی مامۆستا ناصر بکات کە لە سیستەمی سیاسی یاخود سیستەمە ئابووریەکەیدا تەوزیفی کردۆتەوە، وا تێدەگات هەمووی لە قورئاندا دەرهێناوە، لەکاتێکدا دیوێکی نەبینراوی هەیە کە لە رۆشنبیریە مۆدێرنەکەی مامۆستا ناصر دایە، بەلام لەو باسانەدا بەهۆی ئەوەی زۆربەی بەلگەهێنانەوەکانی بە قورئانە ئەم دیوەی راستەوخۆ دەرناکەوێت{٨}.

تەنانەت لە زۆربەی بابەتەکانیدا هەست دەکەیت سێبەری مەعریفەی نوێی هەتا هەشتاکانی سەدەی بیستی تێدا بەردەوامە، بەندە نالێم مامۆستا ناصر بە تەواوەتی ئاگاداری رێبازە فەلسەفی و مەعریفیەکانی رۆژئاوا بووە، بەلام ئەوەی کە

ڕۆژهەلاتیەك پێویستی بێت بۆ ئەوەی کە ڕۆژئاوا بناسێت سوودی لی بینیون و لە قورئانناسیەکەیدا تەوزیفی کردونەتەوە، پاشان ئەو مەعریفە قووڵەی لە ئاییندا هەیبووە و لە فیقهی ئیسلامیدا بوویەتی زیاتر هاوکاری بووە لەو بوارەدا.

بەکورتی دەتوانم بڵێم ماموستا ناصر فەقیهێکی گەورە بووە بەلام فەقیە بەو واتایە نا کە لە کلتووری کۆتاییەکانی شارستانیەتی ئیسلامیدا پێی درا و ئیتر فەقیە تەنها بریتی بوو لەو کەسەی کتێبە مەزهەبیەکان دەزانێت و لە مەزهەبێکی دیاریکراودا شارەزایە و پێی دەڵێن فەقیهی مەزهەب، بەڵکو فەقیە بەو مانایەی دەتوانێت ئەحکامی کردەیی ڕۆژانە لە قورئاندا بدۆزێتەوە ئەمە ئوصولی فیقهیش دەگرێتەوە هەم قورئانناسی و زانستی ئالەش دەگرێتەوە و هەروەها دەبێت لە زانستەکانی سەردەمی خۆشی شارەزا بێت کە خۆی لە مەرجەکانی ئیجتیهادکردندا باسیان دەکات{٩} و دواتر دەچینە سەری، کەواتە ماموستا ناصری سوبحانی فەقیە بوو بەلام فیقە گەورەتر بوو لە فەیقە، فیقە بەو مانا تەقلیدیە نا کە هەیە بەڵکو بە مانا قورئانیەکەی، شارەزا بوون لە ئایین و بەکارهێنانی بۆ چارەسەری گرفتە ڕۆژانەکان.

## چۆنێتی مامەڵەکردنی سوبحانی لە مەعریفەناسیدا:

دەتوانین بڵێین ماموستا ناصر دوو جۆر کشانی هەیە، کشانێك لە زانستە نوێکانەوە و خوێندنەوەی مەکتەبە فیکری و فەلسەفیەکانەوە بەرەو قورئان ئەمە جۆرێك کشانە کە لای سوبحانی زۆرباش دەبینرێت. ئەگەر بەراوردێك بکەین لە نێوان ئەو کاسێتانەی کە بەر لە شۆڕش بە دوو سێ ساڵ تۆماری کردوون هەتا سەرەتای شۆڕش و ستەمکردنی پیاوەکانی شۆڕشی ئێرانی لای سوبحانی، هەست دەکەیت لێرەدا نزیکیەکی زۆر هەیە لە نێوان مەعریفەی مۆدێرن لەگەڵ فیکری ئەودا، ڕاستە ماموستا ناصر لە هەموو تەمەنیدا کەسێکی قورئانی بووە بەبۆچوونی من، کەسێك بووە زۆر شەرعزان بووە، بەلام لەو شوێنانەدا زۆر بەزەقی دیارن.

بۆ نموونە لەو کاسێتانە کە باسی سیستەمی ئابووری دەکات، دەبینیت کە دونیایەك زانستی نوێ و فیکر و فەلسەفەی نوێ ئامادەیی هەیە. بەلام بەئاشکرا هەشت ساڵ دوای ئەمە کە تەفسیری سورەتی (الروم) دەکات هەرباسی هەمان سیستەمی ئابووری دەکاتەوە، بەلام یەك ئامارەی تێدا نیە بۆ مەکتەبە

ئابوورییەکان!، نەباسی لیبرالیزمی تێدایە، نەباسی سۆشیالیزمی تێدایە کە لە باسی سیستەمە ئابوورییەکەی پێشووتریدا هەموو ئەوانەی تێدایە{١٠}.

دەبینیت هەمان ستراکچەر لە دواتردا لای ئەو هەر حزووری هەیە کە دیدی ئەو چۆنە بەرامبەر ئابووری ئیسلامی، بەڵام بەبێ ئەوەی بچێتە نێو فراوانی ئەو باسەوە کە ئەمە لای لیبراڵەکان یاخود لای سۆسیالیستەکان چۆنە{١١}. کەواتە کشانێکی مامۆستا ناصر هەیە لە زانستە نوێکانەوە بۆ قورئان، بەجۆرێك بەردەوام نزیك بووەتەوە لە رۆحی قورئان.

کشانێکی دیکەیان کشانی سوبحانیە لە کلتووری ئیسلامیەوە، بە دیاریکراوی لە مەزهەبی شافیعیەوە ئەو کاتەی کە فەقێ بووە و خوێندویەتی، بۆ مەزهەبەکانی دیکە و شارەزابوون لە هەر چوار مەزهەبەکەی ئەهلی سوننە و جەماعە، پاشان شارەزابوون لە مەزهەبەکانی دەرەوەی ئەهلی سوننە و جەماعەش وەکوو تێگەیشتنی لە مەزهەبی جەعفەری و بەحوکمی ژیانی لە ئێراندا و تێکەڵبوونی لەگەڵ شیعەکاندا، لێرەدایە کە کشانێکی دووەمیشی هەیە.

کەواتە کشانەکانی مامۆستا ناصر دوو کشانە، یەکەمیان کشانێکە لەسەردەمی نوێوە بۆ قورئان، دووەمیشیان کشانێکە لە کلتووری ئیسلامیەوە بۆ قورئان. دواتر ئەگەر لە سەرەتاوە لە رێگەی مەزهەبەوە فیقهی ئیسلامی و ئەحکامی قورئانی کەشف کردبێت. لە کۆتاییدا ئەوەندە دەبێتە کەسێکی قورئانی کە ئەو پاشخانە فیکریەی چ لە بواری زانستە نوێیەکان و مەعریفەی سەردەمدا و چ لە بواری زانستە ئیسلامیەکاندا و کلتووری ئیسلامیدا هەیبووە دەچنە نێو نەستێکی قووڵەوە بەجۆرێك هەموو هەستی لەگەڵ قورئاندایە، واتە ئەگەر کەسێك پاشخانی فیکری و مەعریفەی پێشینی ئەو نەناسێت نازانێت کە سوبحانی لە کوێوە دێتەوە و کاتی خۆی چۆن خوێندوویەتیەوە، لانی کەم چۆن ئەو پرسیارەی بۆ ورووژاوە هەتا لە قورئاندا بۆی بگەڕێت. تەنانەت جارێك چاوم کەوت بە هاورێیەکی مامۆستا ناصری سوبحانی کە نزیکەی نۆ ساڵ لەگەڵیدا ژیا بوو، پرسیاری سەرچاوەکانی مەعریفەی سوبحانیم لێکرد، کە من زۆر شتی ورووژێنراوی مامۆستا ناصرم لای شەریعەتی و تاڵەقانی و سروش و....هتد، بینی بوو، تەنانەت زۆربەی شتەکانی سوبحانی پێشتر لای کاك ئەحمەدی موفتیزادە حزووریان هەیە، بەڵام لای موفتی زادە وەکو بیرۆکە یان فیکرەیەکی کورت بوونیان هەیە کە سوبحانی هێناونی و لە قورئاندا بەفراوانتر

بۆیان گەڕاوە. ئەو هاوڕێیەی مامۆستا ناصر لە وەڵامدا پێی وتم تو هەڵەیت کە ئەو بیرکردنەوەیەت هەیە چونکە تەنها سەرچاوەی سوبحانی بریتیە لە قورئان!.

ئەو دەمەی کە مامۆستا ناصر دێتە نێو قورئانەوە میتۆدی مامەڵەکردنی خۆی — دواتریش باسی دەکەین— کە بە بۆچۆنی من میتۆدێکی ستراکچرالیزمە لەگەڵ قورئاندا، واتە دەیەوێت بونیادی شتەکان بدۆزێتەوە کە دەتوانین بڵێین کە برەودانە بە رێگی ئیمامی (شاطبی) بەو واتایەی رێگەیەکی مەقاسیدیانە و ئوصولیانەیە کە دەرەنجام ئوصولی فیقهیش بناغەیەکە بۆ فیقە، واتە میتۆدی مامەڵەکردنی سوبحانی لەگەڵ دەقی ئاییندا میتۆدێکی ستراکچرالیزمانەیە کە دەیەوێت بونیادی قورئان بدۆزێتەوە و... هتد.

ئەگەر ئەمانەشی کردبێت ناسێنەری قورئان بێت وەکو قورئان ئەوا بەبۆچوونی من باش توانیویەتی بە پشت بەستن بە زانستە نەریتیەکان لە کلتووری ئیسلامیدا زۆر شتی نوێ لە قورئاندا بدۆزێتەوە بەڵام دواجار لانیکەم ورووژێنەری ئەم شتانە خودی قورئان نەبووە لای ئەو، واتە بۆ نموونە ئەگەر سوبحانی زۆر بلیمەتیش بوو بیت کە هەرواش بووە و لە تەمەنێکی زۆرکەمدا زۆرشتی کردووە، بەڵام زۆر سەردەربوونیشی لە قورئان هەر بە ئەندازەی ئیمامی شافیعی و ئیمام ئەبوحەنیفە و بیرمەندەکانی نە قورئاندا شارەزا بووە بەڵام ئەم جۆرە پرسیارانە بۆچی تەنها لای مامۆستا ناصر دەوروژێنرێت کە سیستەمی ئابووری ئیسلام چیە؟ سیستەمی سیاسی ئیسلام چیە؟ حکومەتداری لە ئیسلامدا چۆنە؟ نموونەی ئەم پرسیارانە بۆ لای سوبحانی دەردەکەوێت؟! بابەتەکە تەنها ئەوە نیە کە سوبحانی لەوانی دیکە شارەزاترە، نا... ئێمە بمانەوێت و نەمانەوێت مەعریفەی ئاینی مەعریفەیەکی مرۆڤیە، ئەوەی کە لە فەلسەفەی ئاییندا زۆرتر باسی لێدەکرێت، کە لانیکەم ورووژاندنی پرسیارەکان لە لایەن مرۆڤەوەیە، بۆیە من دەتوانم بانگەشەی ئەوە بکەم کە سوبحانی ورووژاندنی پرسیارەکانی لەدەرەوەی قورئاندا بووە ئەگەرچی بۆ کەشفی ئەنجامەکان لە قورئاندا بە راستی کەسێکی بێ وێنە بووە!.

## فەقیە بوونی سوبحانی و داهێنانەکانی:

داهێنانەکانی سوبحانی زۆرتر دەتوانین کوورت بکەینەوە لە داهێنانە ئوصولی و فیقهیەکانیدا، کە بونیادێکی هەیە بۆ مامەڵەکردن لەگەڵ ئوصول و فیقە و لەگەڵ

گەڕان لە قورئاندا، تەنانەت ئەوەندە خوێندوەیەکی قووڵی هەبووە جاری وابووە شتێکی دۆزیوەتەوە، بۆ نموونە ئەوەی کە هەیە لە فیقهی تەقلیدیدا کە ناکرێت لە (ثوابت)دا ئیجتیهاد بکرێت یان لە زانستی عەقائیدا ئیجتیهاد بکرێت، سوبحانی توانی بیسەلمێنێت کە ئەگەری ئیجتیهادکردنیش لە (ثوابت)یشدا هەیە کە دەتوانین بڵێین ئەمە یەکێکە لە خاڵە زۆرجیاوازەکانی نێوان سوبحانی و نوورسی یان بڵێین لە جوانترین خاڵە جیاوازەکانی نێوان ئەو دوو کەسایەتیەیە، نوورسی هەتا سەر ئێسقان پێچەوانەی ئیجتیهاد دەجووڵێتەوە. لە پەیامی ئیجتیهاددا زۆر پێداگری دەکات لەسەر ئەوەی کە پێویست نیە لەم سەردەمەدا ئیجتیهاد بکرێت، چونکە ئیجتیهاد ئەرکی خۆی بەجێ ناهێنێت. ئەمەش بەپێچەوانەی مامۆستا ناصرەوە کە پێی وایە تەنانەت لە جێگیرەکانیشدا دەکرێت ئیجتیهاد بکرێت{١٢}.

یەکێك لەو جێگیرانەی کە ئیجتیهادی تێدا کردووە بریتیە لەوەی کە باوەڕی وایە مرۆڤی ئیماندار – ئیمان بە واتای مەلەکە– ناچێتە نێو جەهەنەمەوە. هاوڕێیەکی بۆی گێڕامەوە کە پێی وتووە مامۆستا خۆ ئەمە هەمان رای خەواریجەکانە! دەڵێت فەرمووی بە راست ئەوان وا دەڵێن! وەك ئەوەی ئەوەندە کۆن ئەوەی خوێندۆتەوە و لە نەستی ئەودا چەسپیوە، دوایی کە لە قورئاندا بۆی گەڕاوە و ئەو دەرەنجامەی گرتووە بیری چۆتەوە کە خەواریجەکانیش وا دەڵێن. لەگەڵ ئەوەشدا ئەو قسەیەی خەواریجەکان زۆر زەقە کە یەکێك ئەگەر بچووکترین کتێبی (الفرق الاسلامية) بخوێنێتەوە دەزانێت کە خەواریجەکان وا دەڵێن{١٣}. لێرەدا مەبەستم ئەوەیە بڵێم ئەو زانستانە باش چوونەتە نەستیەوە، بێگومان هەر وەك زانستی نوێش دەڵێت هەر کەسێك زانیاری یان مەعریفەیەکی وەرگرت نافەوتێت بەڵکو دەچێتە دواوە و لە نەستدا هەڵدەگیرێت، جارێکی دیکە دەڵێم کە زۆربەی پرسیارەکان لای سوبحانی مەعریفەی نوێ بۆی وروژاندووە و هەروەها مەعریفەی کلتووری پێشتریش، بەڵام ئەو لە قورئاندا بۆ وەڵامەکانی گەڕاوە، چۆنێتی ئەم گەڕانەش بە چ شێوەیەك بووە دەکرێت فراوانتر لەسەری قسە بکەین.

بێگومان مامۆستا ناصر لەو مرۆڤانەیە کە دەکرێت ناوی بنێین مرۆڤە رەسەنەکان ئەو مرۆڤانەی کە بە جیددی ویستوویانە بۆ هەموو شتێکی خۆیان بەڵگە و دەلیل بهێننەوە، ئەگەر دەلیل هێنانەوە مرۆڤ بکاتە رۆشنبیر ئەوا ناصری سوبحانی لە گەورەترینی رۆشنبیرانی جیهانە، چونکە لە بە،امبەر هەموو شتێکدا ویستۆیەتی بە

دەلیلەوە مامەڵە بکات، تەنانەت لەسەرەتایی ترین شتدا. بۆ نموونە ئەگەر گوێ لە کاسێتەکانی شەرحی (الاربعین النووی) بگریت، دەبینیت کە ئەو دێت لە چەمکی باسی خوداوە دەست پێدەکات بە دەلیل هێنانەوە لەسەر خودا، (الـه) و (رب) هەتا (رسالە) و (رسول) و (نوێژ) و (ڕۆژوو) و...هتد، هەموو ئەوانە بە دەلیل هێنانەوە لەتەکیاندا مامەڵە دەکات، ناڵێم دەلیلەکانی دەلیلی فەلسەفین یان هەر دەلیلێکی تر، چونکە دواجار کە ئێمە پێناسەی هەر کام لە سوبحانی و نوورسی یان موفتی زادە دەکەین وتوومانە ئەوان مرۆڤانێکن کە دوایین مرۆڤی سەردەمی کۆنن لەم سەردەمە نوێیەدا دەژین، دیارە کە سوبحانی مرۆڤی سەردەمی نوێ نیە ! ڕاستە کە سەردەمی نوێی بینیوە، ئەوەی کە پێشتر ئاماژەم پێکرد کە نوورسیش وا بووە، بە هەمان شێوەش کاك ئەحمەدیش وا بووە، بەڵام دواجار مەرجەعیەتی فیکری ئەوان و ژیانیان لە کلتووردایە، ئەوان ڕەخنەگرێکی نەریتین لە سەردەمی نوێدا، جا یەکێك لە گەورەییەکانی سوبحانی لەوەدایە کە بۆ هەموو شتێك دەیەوێت بەڵگە بهێنێتەوە، بەڵام دەلیل هێنانەوەکەی تەنها دەلیلی ئەزموونی نیە وەکو لەسەردەمی نوێدا باوە، دەکرێت دەلیلی شهودی بێت، دەشکرێت عەقڵی بێت، هەر چوار سەرچاوەکەی مەعریفە {١٤}.

کەواتە سوبحانی دەلیلکارە، لێرەوە لەبەرامبەر هەموو شتێکدا بەڵگەی دەوێت، باش زانستەکانی سەردەمی کۆنی وەرگرتووە، کە یەکێك لەو زانستانە زانستی ئادابی گفتوگۆ و لێکۆڵینەوەیە، کە لەو زانستەدا دوو کەس بوونیان هەیە یەکێکیان (معترض) و ئەوی دیکەیان (مستدل)ە، واتە ئەو کەسەی قسە دەکات دەبێت دەلیلی پێ بێت، یەکێك لە جوانیەکانی ئەو زانستە کە ئەمڕۆ زۆر بەداخەوە نەماوە بریتیە لە وەی کەسەکەی بەرامبەر ماف خۆیەتی هەموو پرسیارێکی لێبکات کە پێی دەڵێن (معترض)، (مستدل) لەسەری پێویستە کە هەرچیەکی وت بە بەڵگەوە بیڵێت بەڵام ئەگەر (معترض) بچووکترین گومانی لە قسەکانی (مستدل) دۆزیەوە بۆی هەیە قسە بکات بێ دەلیلیش {١٥}.

بەڵام سوبحانی بەردەوام (مستدل)ە، ئەو مافەشی بە (معترض)ەکانی داوە بۆشاییەکانی فیکری ئەو بدۆزنەوە و ئامادەش بووە ئەگەر پێچەوانەی دەلیکەکەی ئەو سەلمێنرا کە ڕاستە ئەوا وازی لێبهێنێت.

ئەو پرسیارەی کە لە هەندێك بابەت و کاسێتەکانی مامۆستا ناصردا لە پەنا و پەسێوێکدا هەستی پێدەکرێت، کە هەمیشە پرسیارێکی گەورە بووە، ئەویش بریتیە لەوەی کە قورئانێك بەو قەبارەیەوە چۆن دەکرێت بۆ هەموو سەردەمەکان بشێت؟! دواجار هەموو دەقێك یان هەموو حوکمێك پابەندە بە زەمکانێکەوە، بە مێژوو و جوگرافیایەکەوە، باشە چۆن دەکرێت لە زەمەنێکی دیکەدا بگونجێت لە کاتێکدا زەمەن لە گۆڕانی بەردەوامدایە یان ئەم قورئانە کە لە نیمچە دوورگەی عەرەبیدا نیشتۆتە زەوی چۆن دەتوانرێت لەتەك زەمەنێکی دیکەدا بێتەوە؟ کەواتە ئەم قورئانە دەبێت بە ئاسمانەوە بێت و نەنیشێتە زەوی تا لە هەموو سەردەمێکی دیکەدا دووبارە نیشتنەوەیەکی دیکەی ببێت و بەشی خۆی پێبدات.

تەنانەت لە پێشەکی کتێبی (جمع الجوامع)دا وتراوە کە ئەحکامەکانی ئەم قورئانە ئەحکامی ئەزەلین، بەردەوام تیشکێکن لە خۆرەوەوە و لە ئاسمانەوە بە ئەشکەوتێکدا دێنە خوارێ کە ئەو ئەشکەوتە کاروانی مرۆڤایەتی پێدا تێپەڕ دەبێت، هەر کەسێك ئەو تیشکەی بەرکەوت ئیتر وا دەزانێت ئەو رۆژە دابەزیوە لە کاتێکدا ئەو تیشکانە لە ئەزەلەوە هەتا رۆژی قیامەت دێنە خوارەوە{١٦}، کەواتە ئایەتەکانی قورئان لای مامۆستا ناصر بەهەواوەن —ئەمە وەك میتافۆرێك— جارێکی دیکە دادەبەزنەوە، ئەمەش هەمیشە پرۆسەی زیندوێتی بە (نیگا) دەبەخشێت. ئەگەرنا... گەر بە تەواوی دابەزیبێتە سەرزەوی و رەنگ و بۆی عەرەبی گرتبێت، عەرەبێك کە هەزار و چوارصەد ساڵ لەوە پێشتر ژیاوە، ناکرێت لەسەردەمێکی دیکەدا دووبارە بێتەوە، نا.... دەبێت هێشتا بە حەواوە بێت، بۆیە ئەو ئەم پرۆسەیە ناودەنێت (نزول) — دابەزین— تەنانەت خودی هۆکاری دابەزینی ئایەتەکان واتە — سبب النزول— بەلای سوبحانیەوە رووداوێك نیە روو بدات و ببڕێنەوە، بەو مانایەی لە رابردوودا روویان دابێت و بڕابێنەوە، کە ئەو لە (علوم القرآن)دا دەیسەلمێنێت ئەو هۆکاری دابەزینانەی لە کتێبەکاندا باسکراون زۆربەیان راست نین، کاتێکیش هۆکاری دابەزینیان لێ دەپرسی، دەڵێت هۆکاری دابەزینەکە هەر لەخودی ئایەتەکەدا دیارە! واتە لە رووداوێکی واقیعیەوە هۆکاری دابەزین بەرز دەکاتەوە بۆ رووداوێکی نەوعی{١٧} رووداوێك کە نموونەی ببێت واتە جارێکی دیکە دووبارە ببێتەوە، لێرەوە دوبارە — سبب النزول — یش ستراکچەری هەیە. بەمەش دووبارە قورئان زیندوو دەبێتەوە.

لە پەیوەندی نێوان قورئان و سوننەتیشدا مامۆستا ناصری سوبحانی لەو کەسایەتیانەیە کە بۆ تەفسیری قورئان سوونەت بەپێویست دەزانێت، سوننەت بەلام نەك فلان کتێبی فەرموودە، شتێکە ناوی (سوننە)یە کە مومکینە لەهەر کتێبێك لە کتێبەکانی فەرموودەدا ببێت یان لە خودی قورئان خۆیدا بێت، لە ژیاننامەی پێغەمبەری خودادا بێت، واتە ئەگەر وا تێدەگات کە بۆ تێگەیشتن لە قورئان چوونە دەرەوەیەك پێویستە بۆ دەرەوەی قورئان کە ئەویش چوونە دەرەوەیەکە لە سوننەدا روویداوە. وەکو چۆن لە ئەنتۆلۆژیادا دەووترێت بۆ ناسینی گەردوون یان فەلسەفەی گەردوون دەبێت بچینە دەرەوەی بوون، کە ئەمە لە فەلسەفەی ئەخلاقدا زەقتر دیارە کە دەووترێت ئایا ئەحکامی چاکی و خراپی دەکرێت بدرێت بەسەر هەر کردەیەکدا، وەك ئەو پرسیارەی لە (نیچە)ی دەکەن ئایا تۆ خەریکی چیت؟ دەتەوێت ئامانجێك بۆ مرۆڤ بدۆزیتەوە؟ ئەویش لە وەلامدا دەلێت ئامانج و مەرام لای من بوونی نیە بەلکو خەریکی کاری خۆمم! وەك ئەوەی بلێت ئەوە پەیوەندی بە ئەخلاقەوە نیە، دواجار من دەلێم تەنانەت (نیچە)ش لێرەدا خۆی بۆ خۆی حوکمێکی ئەخلاقی بەکارهێناوە، کێ دەلێت ئەو کارەی دەیکات هی خۆیەتی! من نامەوێت زۆرتر بچمە نێو ئەو بابەتەوە. بەبۆچوونی فەیلەسووفەکانی فەلسەفەی ئەخلاق چاك و خراپ دەبێت لە دەرەوەی خۆی بناسرێت هەروەك بەبۆچوونی فەیلەسووفەکانی ئەنتۆلۆژیاش مەرام لەم بوونە دەبێت لە دەرەوەی گەردوون سەیری بکەیت، کاتێك کە توانیمان بچینە دەرەوەی بوونەوە ئەو کاتە دەزانین ئامانج لەم بوونە چیە، چونکە ئەو کاتە جولەکەی دەبینین. لای مامۆستا ناصریش ئەوەندەی کە من لێی تێگەیشتبم بۆ ئەوەی لە هەموو راقەکردن و تەفسیرکردنی قورئان تێبگەیت پێویستمان بەچوونە دەرەوەیەك لە قورئان هەیە. کە ئەو چوونە دەرەوەیەش چوونە بۆ نێو ژیانی پێغەمبەری خودا{١٨}. دیارە کە لای سوبحانی قورئان سیستەمێکی یەکتر تەواوکەرە و خۆی تەواو دەکات، بەلام دواجار پێویستمان بە سوننەتێکیش هەیە بۆ تێگەیشتن لە قورئان یان لانی کەم بۆ تەبلیغی قورئان، چونکە بەیان لای سوبحانی لەبەرامبەر کەتمانەوەیە، کەتمانیش ئەگەر ماناکەی شاردنەوە بێت، بەرامبەرەکەی بریتیە لە گەیاندن (تبلیغ)، واتە بەیان بەلای ئەوەوە روونکردنەوەی نا روونی نیە، (لتبینه للناس) واتە (لتبلغه) بەلای ئەوەوە کە لە تەفسیری سورەتی (البقرة)دا دەفەرمووێت{١٩}، چونکە

بەواتای کەتمان بەکارهاتووە وەك خۆی دەفەرموویّت، بۆیە لانی کەم بۆ تەبلیغی قورئان پیّویست بە سوننەت هەیە، ئەمەش یەکیّك لە خالّە جەوهەریەکانی جیاوازی نیّوان مامۆستا ناصری سوبحانی و کاك ئەحمەدی موفتیزادەیە.°کە لە گفتوگۆیەکی بەناوبانگی نیّوانیاندا لە (نگلّ){٢٠} کاك ئەحمەد وەکو شاهیدیّکی بەهەق لەویّدا دان بەراستی بۆچوونی سوبحانیدا دەنیّت و دەلّیّت کە پیّویستمان بە سوننەت هەیە. بەلاّم خالّەکە لای سوبحانی لە پۆلبەندی سوننەت دایە کە کام بەشەی سونەتە کە دەکریّت وەربگیریّت و کام بەشەیەتی دەبیّت بکریّتە دەرەوە. لە بنەڕەتدا خودی سوننەت چیە؟ سوننەت لای مامۆستا ناصر بریتی نیە لە ژیانی -محمد-(د.خ)، بریتیە لە ژیانی (رسول الله)، واتە بەشی ریسالەکەی لە سوننەتدا وەك ناوەڕۆکی (سوننەت) دەبینیّت. کە لەمەشدا داهیّنانیّکی گەورەی کردووە بەبۆچوونی من، ئەمەش قسەی زیّتر هەلّدەگریّت، بەلاّم دواجار ئەوە بلّیّین کە ئەگەر لە ئوصولّی فیقهی تەقلیدیشدا سەرچاوەی یەکەم بریتی بیّت لە قورئان و سەرچاوەی دووەم بریتی بیّت لە سوننە، لای مامۆستا ناصریش هەر وایە، واتە قورئان شاهیدە بەسەر سوننەوە، سوننەیەك کە بە لانی کەم زۆرترینی بەلامانەوە گومان ئامیّزە لە ماناکردن و گەیشتنەکەیدا، کەواتە دەبیّت قەتعی بوونەکەی قورئان بکەینە دەلیل بەسەر ئەوەوە. لەبەر ئەوە تەنانەت زۆرجار هەندیّك زاراوە لە فەرموودەیەکدا بەکارهاتووە، بەلاّم بە حوکمی ئەوەی کە پیّغەمبەری خودا (مبلغ)یّکی قورئان بووە و پەیام و داواکانی قورئانی جیّبەجیّ کردووە لە ژیانی خۆی و هاوەلاّنیدا بۆ ئەوەی ببیّتە نموونەیەك بۆ سەردەمەکانی دواتر، بۆیە کە راوی فەرموودەیەك شتیّکی گیّڕاوەتەوە بەدەم پیّغەمبەری خوداوە بەلاّم پیّغەمبەری خودا ویستوویەتی حوکمیّکی قورئان لەویّدا جیّبەجیّ بکات، مامۆستا ناصر سەیری کردووە ئەو ریوایەتەی کە ئەو راویە ریوایەتی کردووە زاراوەیەکی یان وشەیەکی پیّچەوانەی ئەو زاراوەیەیە کە لە قورئاندا بەکارهاتووە، لەویّدا دەفەرموویّت: نا.... ئەوە راویەکە هەلّەی کردووە، چونکە پیّغەمبەری خودا خودی ئەوەی بەکار هیّناوە کە لە قورئاندا هەیە، من لەبیرم دیّت لەزۆر شویّندا فەرموودەکان بەوجۆرە راست دەکاتەوە کە دەلّیّت ئەمە هەلّەی راویەکەیە لە گیّڕانەوەی فەرموودەکەدا ئەگینا پیّغەمبەری خودا (د.خ) بەوجۆرەی فەرمووە واتە ریّك زاراوە قورئانیەکەی بەکارهیّناوە، کەواتە بەلای سوبحانیەوە قورئان شاهیدە بەسەر سوننەوە{٢١}.

## کەسایەتی سوبحانی و داهێنانەکانی:

دەتوانم بڵێم سوبحانی کەسایەتیەك بووە ئەگەرچی چرکەساتی رۆحی هەبووە، لەچاو مەلا و فەقێکانی سەردەمی خۆیدا کەسێکی زۆر رۆحانی بووە، بەدیاریکراوی ویستوویەتی رێك وەکو ئەوەی کە قورئان دەیەوێت وا مامەڵە بکات، بەڵام دواجار دەتوانین بڵێین کە مامەڵەکردنی مامۆستا ناصر لەگەڵ قورئاندا پێش فەرز و گریمانەی خۆی هەیە، وەکو چۆن مامەڵەکردنی عارفێك لەگەڵ قورئاندا چاوەڕوانیەکانی ئەو لە قورئاندا دیاری دەکات. کەسێکی عاشیق بە عیشقی ئیلاهی هەمیشە لە قورئاندا بە شوێن چاوەڕوانیەکانی عیشقی خۆیدا دەگەڕێت، واتە پێشگریمانە کراوەکانی خۆیەتی جۆری مامەڵەی ئەو لەگەڵ قورئان دیاری دەکات.

فەیلەسوفێك بە شوێن چرکەساتی فەلسەفیدا دەگەڕێت لە قورئاندا، مامۆستا ناصریش ئەگەرچی هەر لە سەرەتای تەمەنیەوە لەگەڵ قورئان ژیاوە بەڵام پێش فەرز و گریمانەکانی خۆی یاخود تێگەیشتن و مەعریفەی خۆی جۆری مامەڵەی ئەوی دیاریکردووە، ناڵێم دەرەنجامەکانی خۆی گرتوونی و بەسەر قورئاندا فەرزی کردوون، بەڵکو لە قورئاندا دەریهێناون و بلیمەتی ئەویش لێرەدایە، بەڵام پرسیارەکان شتێکی پێشتر بووە و لای ئەو ئەمجۆرە مامەڵەیەی ورووژاندووە، واتە دەتوانین بڵێین مامەڵەکردنی سوبحانی لەگەڵ قورئاندا مامەڵەکردنێکی عاریفانە نیە ئەگەرچی شەونوێژیشی هەبووە، هەموو دوعا قورئانیەکانی بەجوانی لەکاتی خۆیدا جێبەجێ کردووە تەنانەت تەسبیحاتی بەیانیان و ئێوارانیش، کە ئەمانەشی بە فەرز داناوە لەسەر خۆی وەکو لە فەتواکانی و شوێنی دیکەشدا باسی کردووە. هەروەها مامەڵەکردنێکی فەلسەفیانەش نیە ئەگەرچی چرکەساتی عیرفانی و فەلسەفی لای ئەو بوونیان هەیە.

بەڵکو ئەو فەقیە بووە، جۆری مامەڵەی فیقهیانەی ئەویشە چۆنێتی مامەڵەی لەگەڵ قورئاندا دیاری دەکات، وەك ئەوەی لەبارەی شەهید حەسەن بەنناوە وتوومە لە بابەتی (ژیان بە ئایینەوە جوانە) کە لە ژمارە(١٤-١٥)ی هەژاندا بڵاوکراوەتەوە، کە ئەو لە پێشدا نەهجێکی گرتووەتەبەر و بەو نەهجە چووەتە ناو ئایینەوە، دواجار ئەو نەهجە فەرەزیاتی بەسەر ئەودا سەپاندووە، ئاخر من ئەگەر نەهجی عاریفانە بگرم دوایی هەرچی شتێك کە لە نەهجی عیرفانیانەدا هەیە خۆی دەسەپێنێت.

بێگومان ئەمەش پنت و نوکتەی بەهێزی مامۆستا ناصرە نەك خاڵی لاوازی لەبەر ئەوەی فیقهـ بە لای منەوە –وەکوو لە سەرەتاوە ئاماژەم پێدا– بە واتای ئەحکامی کرداری نیە، کامە حەلاڵە کامە حەرامە، بەڵکوو فیقهـ بە مانا گەورەکەی مەبەستمە کە لەم دەستیەوە عاریف هەیە و لەو دەستەکەی دیکەیەوە فەیلەسووف هەیە، کە زۆربەی زانستە ئیسلامیەکان دەچنە نێو ئەوسێ خانەیەوە.

ئێمە سێ جۆر زانستمان هەیە لە شارستانی ئیسلامیدا، زانستە زەینیەکان کە ئەمە زۆرتر کەلام و فەلسەفە دەگرێتەوە، زانستە رۆحیەکان کە ئەمە زۆربەی عیرفان و ئەخلاق دەگرێتەوە، لەگەڵ زانستە کرداریەکان کە هەموو فیقهـ دەگرێتەوە. بەبۆچوونی من مامۆستا ناصر سێیەمیانی گرتووە و هەر بەمەش مامەڵەی خۆی لەگەڵ قورئاندا رێکخستووە و بەمەش بونیادی قورئان دیاری دەکات، بەمەش مامەڵەی نێوان قورئان و سوننەت دیاری دەکات، هەروەها بەمە چۆنیەتی گونجان و گشتگیر بوون و پراکتیك کردنی قورئان لە هەموو سەردەمەکاندا دیاریدەکات، هەر بەمەشە چارەسەری گرفت و قەیرانەکانی مرۆڤایەتی دیاری دەکات –کە دەکرێت لە داهاتوودا قسەی لەسەر بکەم. هەموو ئەمانە گریمانەی پێشتری هەیە، ئەگەرچی ئەو ماف حوکمە عیبادیەکانی داوە، چونکە فیقهیش تەنها دیوە دەرەکیەکەی جەستە نیە، بەڵکو فیقهی رۆحیش هەیە، کە ئەو ماف هەموو ئەمانەی داوە بەلام وەکو فەقیهێك نەك وەکو عاریفێك.

هەرچەندە چرکەساتی تێکەڵی هەیە لە نێوان فیقهـ و عیرفاندا. بۆ نموونە مامۆستا ناصر هەموو عیبادەتەکانی بەتەواوەتی جێبەجێکردووە، نوێژ و زیکرەکانی بەو شێوەیە قورئان داوای دەکات جێبەجێ کردووە، تەنانەت وەکو هاورێکانی لێی دەگێرنەوە ئاواتی ئەوە بووە بگاتە چل ساڵی و دوعای تایبەت بەو تەمەنە بخوێنێت{٢٢} ﴿....حتى اذا بلغ اشده و بلغ اربعين سنة قال رب اوزعني ان اشكر نعمتك التي انعمت علي و على ولدي و ان اعمل صالحاً ترضاه و اصلح لي في ذريتي اني تبت اليك و اني من المسلمين﴾ (الاحقاف/١٥).

بەلام زۆر بەداخەوە ئەوە بوو لە سی و نۆ ساڵیدا ئەو رووداوەی بەسەردا هات و ئەو دوعایەی نەکرد. واتە ویستویەتی هەموو پەرستنەکان لە شوێنکاتی خۆیاندا جێبەجێ بکات، بەلام ئەمە لە دیدێکی فەقیهانەوە نەك لە دیدێکی عاریفانەوە. بۆیە دەکرێت بڵێین ئەمە بونیاد و ستراکچەری سەرەکی مامەڵەکردن و تێگەیشتنی

مامۆستا ناصری سوبحانیە هەم لە قورئان بەدیاریکراوی و هەم لە ئایین بە شێوە گشتیەکەی، کە دەکرێت قسەی زیاتری لەسەر بکەین هەروەها کشانی دووەمی مامۆستا ناصر دەشێت بڵێم پێچەوانەی رەوتی ئێمەیە وەك رۆشنبیری ئایینی بۆ نموونە من لە زانستە ئایینیەکانەوە رووە و سەردەمی نویٚ کشاوم، لە سەرەتادا کاتێك کە فەقیٚ بووم و لە حوجرەدا دەمخوێند زانستە ئیسلامیەکان و کتێبەکانی فیقە و نەحو...هتدم خوێندوە، دواتر رووم کردوٚتە فەلسەفەی نویٚ.. فیکری نویٚ، راستە نەفەسێکی قورئانی و نەفەسێکی ئایینیم هەیە، بەلاٚم کشانەکەی من کشانێکە لە دەقی ئایینیەوە بۆ فیکر و مەعریفەی سەردەمی نویٚ. بەلاٚم کشانی مامۆستا ناصر کشانێکی پێچەوانەیە، لەسەردەمی نوێوە کشاوەتەوە بۆ دەقە ئایینیەکان و بە دیاریکراویش بۆ قورئان، کە لەو کاتەدا خۆی یەکلایی کردوٚتەوە بۆ قورئان ئیدی تەنها کتێبە زمانەوانیەکان بەکار دەبات و سوودیان لێوەردەگیرێت واتە ئەو فەرهەنگانەی زاراوەکانی قورئان لێکدەدەنەوە. تەنانەت هاورێیەکی پرسیاری لێدەکات تۆ چۆن کەوتوویت بەسەر ئەمەدا؟ دەفەرموویٚت من لە (راغبی ئەصفەهانی)ەوە فێر بووم{٢٣}.

بێگومان زاکیرە و زەینی زۆر زیرەکانەی ناصری سوبحانی یان نبوغی لە رادەبەدەری و ئەو تەرکیزەی هەیبووە زۆر یارمەتیدەری بووە لە زۆربەی بابەتەکاندا، بۆ نموونە لە یەکێك لە گفتوگۆکانیدا کە دەقێکی کتێبی (الام) دەهێنێتەوە -کە کتێبێکی گەورەی ئیملامی شافیعیە- یەکێك لە هاورێکانی دەیگێرێتەوە دەڵێت مامۆستا ناصر وتی ئەگەرچی چەند لەوەو پێش ئەو دەقەم دیتبوو بەلاٚم ئەو کاتە ئامادە بوویەوە لام{٢٤}.

مەبەستم ئەوەیە کە مامەڵەکردنی سوبحانی پێشفەرزێکی هەیە، پێشفەرزەکەشی بریتیە لە مامەڵەکردنی فیقهیانە، زۆرجار قوتابیەکانی یاخود هاوریٚ و دۆست و خۆشەویستەکانی لە تەعەسوب بۆ ئەوە دەڵێن مامەڵەکردنی مامۆستا ناصر مامەڵەکردنی قورئانیانەیە، منیش دەڵێم مامەڵەی ئەو مامەڵەیەکی قورئانیانەیە، بەلاٚم مامەڵەکردنی قورئانیانەش جۆری هەیە، کام جۆرەیانە بێگومانم لەوەی کە جۆری مامەڵەکردنی سوبحانی مامەڵەکردنێکی عاریفانە نیە ئەگەرچی چرکەساتی عیرفانی لای ئەو ئامادەیی هەیە، مامەڵەکردنی سوبحانی مامەڵەکردنێکی فەلسەفیانەش نیە کە لە پێشدا (حەقایق) بدۆزێتەوە، یەقین کەشف بکات — دەتوانم

دەلیل بۆ ئەم قسانەی خۆم بهێنمەوە دەکرێت لە درێژی گفتوگۆکەماندا لەسەری قسە بکەین- ئاخر فەیلەسوفەکان وایان دەکرد، دوایی شەرعیان لەگەڵدا دەگونجاند، ئایا مامەڵەکردنی مامۆستا ناصر وابووە؟ ... کەواتە مامەڵەکردنی ئەو مامەڵەکردنێکی فەیلەسوفیانەش نەبووە، بەلاّم ئەمە واتای ئەوە نیە مامۆستا ناصر خۆشەویستی ئیلاهی لە دڵدا نەبووە وەکو عاریفەکان، یان ئیستیدلالی نەهێناوەتەوە وەکو فەیلەسوف و کەلامیەکان، ئەوەندە ئیستیدلالی کردووە تەنانەت ئەو پێی وایە زانستی لۆژیك (منطق) لە ئاینەوە وەرگیراوە کە بەبۆچوونی من ئەمەشی لە کاك ئەحمەدی موفتیزادەوە وەرگرتووە کە دەکرێت لە پەیوەندی مەعریفی نێوان ئەو دوو کەسایەتیە باس بکەین. واتە سەرەتا لە ئاینەوە هاتووە و بەرەبەرە لە مێژووی مرۆڤایەتیدا گەشەی کردووە، کە رێسا لۆژیەکیەکانم مەبەستە وەکو ئەوەی کە ((کل-گشت) گەورەترە لە (بەش-جزء)) یان (دوو شتی دژ بەیەکەوە کۆ نابنەوە، ئەو باوەڕی وایە تەنانەت بناغەکەیان بریتی نیە لە خودی لۆژیك، بەڵکو بنەڕەتی ئەمانەش نیگایە و لەو رێگەیەوە گەیشتووە -کە دەکرێت لەباسی جیهانبینی مامۆستا ناصردا زۆرتر قسەی لەسەر بکەین{٢٥}.

واتە پێغەمبەرێك لەسەرەتاوە ئەو رێسایەی هێناوە و بەلاّم پێغەمبەرەکە نەماوە و رێساکەی لەنێو کۆمەڵگەدا ماوە و دوایی بووەتە لۆژیك. ئەگەر کەسێك هێندە باوەڕی بە نیگا و (نبوەت) قووڵ بێت ئایا دەتوانیت ناوی بنێیت فەیلەسوف بگرە کەسێکی لۆژیکیش؟! لێرەوە من دەمەوێت بونیادی قووڵی فیکری مامۆستا ناصر پیشان بدەم، کە مامۆستا ناصر چەند کەسێکی فەقیه بووە، مامەڵەیەکی فەقیهیانەی لەگەڵ قورئاندا بووە، بەندەیەکە کە هەموو سات و کاتێکی ئەو پێویستی بە پەرستشێکە، ئەو عاریفێك نیە کە گەشتبێتە یەقین وەکو ئیبن عەرەبی و حەلاج ...هتد، کە چرکەساتی سەیریان هەیە و دەچێتە بابی شەتەحاتەوە — شطحات- نامەوێت بچمە نێو بابەتە خیلافیەکانەوە، بەلاّم هەمیشە مامۆستا ناصر بە شوێن ئەوەوە بووە کە هەموو ساتەکانی تەمەنی وا بووە کە پەروەردگارەکەی چی لێدەخوازێت ئەوە بکات، ئەم مامەڵەیەش مامەڵەیەکی فیقهیانەیە.

## قووڵترین گۆڕانکاری :

ڕەنگە گەورەترین شۆڕشێك كە بەسەر سوبحانیدا هاتبێت بە بۆچوونی من دوای خوێندنەوەی كتێبی (المصطلحات الاربعة)ی ئیمامی مەودودیە، دوای خوێندنەوەی ئەو كتێبە بە تەواوەتی مامۆستا ناصر دەبێتە كەسێك كە مامەڵەی فیقهیانەی لەگەڵ قورئاندا هەیە، كەسێك كە هەموو پێوەرەكانی فیقهین، پێش ئەوەش ئەمجۆرە مامەڵەیەی هەبووە بەڵام دوای خوێندنەوەی ئەو كتێبە ئیتر بە تەواوەتی دەبێتە كەسێكی فیقهی{٢٦}.

لێرەشدا سەرەتای یەكانگیری نێوان هزری ناصری سوبحانی و ئیمام بەننا و سەیید قوتب دەست پێدەكات تا دواجار سوبحانی دەچێتە نێو كۆمەڵەی برایانی موسوڵمانەوە –الاخوان المسلمون– و دەبێتە ئەندامێكی سەركردایەتی ئەو ڕێكخستنە و لە ئێراندا كار دەكات. واتە كۆكەرەوەی ئەو لەگەڵ برایانی موسوڵماندا كۆكەرەوەی فیقیهیانەیە{٢٧}، ئەو ڕەخنەیەی كە گارودی لە ئیخوانەكانی دەگرێت كە دەڵێت ئەوان كەسانێكی سەلەفین، سەلەف بوونیش بە واتای ئەوەیە كە فیقهین!.

لێرەوە مامۆستا ناصر تەفسیری ئیشاری قورئانی نەكردووە بەڵكو تەفسیرێكی فیقهیانەی قورئانی كردووە، بونیادی كەشف دەكات، كە قورئان تەفسیر دەكات لەسەر ئاستی شارستانیەت –دەكرێت لە داهاتوودا باسی بكەین.

یەكێك لەو شتانەی كە فەقیە بوونی سوبحانی زۆرتر دەردەخات، ئەو پرسیارانەیەتی كە لە شیخ عوسمانی تەوێڵەی دەكات كە بەبۆچوونی من دوای شێخ عوسمان تەریقەتەكانی تەسەوف بەو مانا تەقلیدیەی كە هەبووە كۆتایی هاتووە{٢٨}، هەروەك خۆیشی لە وەسیەتنامەكەیدا باسی دەكات كە ئیتر ئێمە لە بابی ویلایەتدا كەسێكمان لە جێگەی خۆمان دانەناوە، ئەو كەسەی بانگەشە بكات كە جێگری ئێمەیە باوەڕی پێمەكەن تەنها بۆ دونیای خۆیەتی و تەواو. دەی ئەم ناصرە لاوە كە هێشتا نەبووەتە مەلایەكی ناسراویش، تەنانەت لە سەردەمی (موستەعید)ی خۆیدایەتی –موستەعید بریتیە لەو فەقێیەی كە كتێبی جامی لە نەحودا خوێندووە– هەتا تەواوكردنی كتێبی جامیش –واتە پێش ئەوە– پێیان وتووە (سوختە) كە كتێبی سەرەتایی خوێندووە، موستەعیدیش بریتیە لەو فەقێیەی ئامادەی ئەوەیە ببێت بە مەلا. جا لەسەردەمی موستەعید بوونیدا نامەیەك

دەنێرێت بۆ شێخ عوسمان، لە وەڵامدا شێخ عوسمان دەڵێت: من نازانم وەڵامی ئەو پرسیارانە بدەمەوە{٢٩} ! بە دڵنیاییەوە ئەو پرسیارانە پرسیاری عاریفەکان یان شێخەکانی تەصەوف نەبوون، ئەگەرنا شێخ عوسمان خۆیشی نەیزانیبایە لای یەکێك لەو شێخانەی لەلایان باوباپیر وکولتوری بەجێماویان وەڵامێکی هەر دەست دەکەوت! ئەگەر پرسیاری پزیشکیش بوونایە بە حوکمی ئەوەی شێخ و بنەماڵەکەی لە پزیشکی نەریتیدا شارەزا بوون وەڵامێکی هەر پێ دەبوو! بە دڵنیاییەوە پرسیاری فەلسەفی نەبوون، بەڵکو پرسیاری فیقهی بوون. لەبەر ئەوەی شێخ عوسمان خۆی فەقیە نەبووە نەیزانیوە وەڵامیان بداتەوە، تەنانەت ئەمە پێش بە مەلا بوونی مامۆستا ناصریش واتە ئەو رەوتە فیقهیانەی ئەو زۆر بە زەقی دیارە.

بەبۆچوونی من هەر ئەمە هانیداوە سیستەمی سیاسی و ئابووری ئیسلامی بدۆزێتەوە چونکە عاریف ناتوانێت ئەوە بکات، تەنانەت فەیلەسوفیش ناتوانێت ئەوە بکات. تەنانەت هەوڵی داوە وەڵامی سۆسیۆلۆژیش لە قورئاندا بدۆزێتەوە، ئاخر فیقە بە مانای چارەسەری گرفتەکانی کۆمەڵگە ئەوەی کە لە نووسنێکدا ناوم ناوە (ئایین بۆ ژیان){٣٠}، فیقە واتە چارەکردنی گرفتەکانی نێو کۆمەڵگە. کە مامۆستا ناصر لە رێی ئایینەوە ئەوەی کردووە و ئەمەش بەبۆچوونی من مامەڵەیەکی فیقهیانەیە، تەنانەت خۆی ناو دەنێت بانگخواز (داعی)، ئەو کەسەی کە (قیام)دەکات دەیەوێت سەر لە نوێ چاکسازی لە کۆمەڵگەدا بکات، بانگەواز بکات و خەڵکی بانگ بکات بۆ لای خودا –الداعي الی الله– لێرەوە ئەم بانگخواز بوونە چیت لێدەخوازێت کاتێك کە (قیام)ت کرد، تەنانەت لە سورەتی تەفسیری (الاحزاب)دا دەفەرموێت دەبێت بە خێزانی یاخود خێزانەکانی بڵێت ئەوا ئیتر بڕیارە من بانگەواز بکەم، تۆ سەربەست بە، ئازادی لە نێوان منی بانگخواز و دونیادا هەرکامیان هەڵدەبژێریت، هیچ گوناهێکیشت ناگات، چونکە تۆ مافی خۆتە بۆ خۆت بژیت، بەڵام ئەگەر دەتەوێت هاورێی من بیت لەم رێگەیەمدا ئەوا دەبێت واز لە دونیا بێنیت، ئەو ئایەتەی کە دەفەرمووێت: ﴿یا ایها النبي قل لازواجك کنتن تردن الحیوة الدنیا و زینتها فتعالین امتعکن و اسرحکن سراحا جمیلا﴾ (الاحزاب/٢٨).

وەرن با تەلاقتان بدەم و برۆن بەدەم دونیای خۆتانەوە ئەگەر دەتانەوێت، بەبێ عاجزبوونیش! بەبێ ئەوەی لەیەکتری زویر بین و واتە ئەمە تایبەت بە پێغەمبەر نیە، بەڵکو بۆ بانگخوازیشە، ئەم مامەڵەیە مامەڵەیەکی فیقهیە. لێرەشدایە هەر سێ

چەمکی (فیقھ) و (دعوه) و (ژیانناسی) لای مامۆستا ناصر دەبنەوە بە یەك. كۆی ئەمانەش قورئناسی دروست دەكات.

بۆ نموونە حەقیقەتی نیگا لای سەعید نوورسی هەم حەقیقەتێكی گەردوونیە، هەم حەقیقەتێكی رۆحیە، واتە ئەزموونێكە لە دیوی نەبینراویشەوە دەكشێت — ئەوەی پێشتر ئاماژەمان پێدا. بەڵام ئەمە لای سوبحانی تەنانەت لەو پێناسەیەدا كە بۆ قورئانی دەكات بوونی نیە، ئەو رەهەندانەی قورئان كە لای مامۆستا ناصر هەن هەمووی رەهەندی بینراون، نەبینراوی تێدا نیە. تەنانەت باسی ویلایەت لای ئەو لە كتێبی (الامامة و الويلاية)دا، ویلایەت تایبەت نیە بەكۆمەڵێك عاریف و رۆحانیەوە وەكو ئەوەی لای عاریفەكان هەیە كە ئەمە شتێكە زۆر وردە بۆ ئەو كەسەی كە ناصرناس بێت{٣١}.

ویلایەت سیستەمێكی گشتی فیقهیە كە دەكرێت هەر ئیماندارێك پێی بگات، هەموو ئیماندارێك (ولی الله)یە بەڵام پلەی ویلایەتەكە بە پێی ئیمانی مرۆڤەكان دەگۆرێت. واتە ویلایەت تایبەتمەندیەك نیە خوای گەورە بیدات بە كۆمەڵێك لە مرۆڤەكان بەڵكو هەموو مرۆڤە ئیماندارەكان (ولی الله)ن، سوبحانی دەلیلی قورئانی بۆ ئەم بابەتە دێنێتەوە. هەروەكو ئیمامەتیش بەهەمان شێوەیە تایبەت نیە بە (آل بیت)ەوە وەكو ئەوەی جەعفەریەكان دەڵێن، بەڵكو مەقامێكی ئیمانیە و ئەگەری ئەوە هەیە هەر مرۆڤێكی ئیماندار بگاتە ئەو مەقامە، لێرەوە دووبارە مامەڵەكردنی ئەو مامەڵەكردنێكی فەقیهیانەیە. بۆ ئەوەی قسەكانم زۆرتر هەر تیۆری نەبن با بەنموونە پیشانی بدەین، بۆ نموونە لە وەڵامی ئەو پرسیارەدا كە چۆن دەكرێت قەرئان بۆ هەموو سەردەمەكان بشێت، لە كاتێكدا قورئان كۆمەڵێك لاپەرەی دیاریكراو و كۆمەڵێك پیتی دیاریكراوە ! كە دەكرێت بژمێرێن، هەم پیتەكان، هەم وشەكان و هەم هەزار و چوارسەد ساڵ پێشتردا هاتوتە خوارێ چۆن بۆ هەموو سەردەمەكان دەشێت؟ كە ئەمە گرفتێكە لە هزری ئیسلامیدا بەبۆچوونی من هەتا ئێستاش وەڵامێكی جەوهەری و قووڵ بۆی نیە جگە لە وەڵامی ئایینی نەبێت كە وەڵامی ئایینیش بۆ نائایینیەكان سوودی نیە، سوبحانی چۆن چارەی ئەم قەیرانە دەكات؟ ئەو دێت پەیوەندی مرۆڤەكان دەكات بە پێنج پەیوەندیەوە. پەیوەندی مرۆڤ لەگەڵ خۆیدا،؟ پەیوەندی مرۆڤ لەگەڵ خودادا، پەیوەندی مرۆڤ لەگەڵ

مرۆڤەکانی دیکەدا، پەیوەندی مرۆڤ لەگەڵ ماڵدا، هەروەها پەیوەندی مرۆڤ لەگەڵ دەوڵەتدا، دەفەرمووێت ئەم پێنج لایەنە لە پەیوەندیەکانی مرۆڤدا هەن.

پەیوەندی مرۆڤ لەگەڵ خودادا، لەبەر ئەوەی ئەمە لە مرۆڤێکەوە بۆ مرۆڤێکی دیکە ناگۆڕێت بەو هۆیەوە ئیسلام وەك قورئان و شەرع هەمووی تێدایە، واتە هەموو عیباداتی باسکردووە. پەیوەندی مرۆڤ لەگەڵ خودادا لەسەردەمێکەوە بۆ سەردەمێکی دیکە ناگۆڕێت ئیتر هەمووی باسکراوە لە قورئاندا.

بۆیە ناکرێت هیچ زیادکردن و کەمکردنێکی تێدا روو بدات، هەر کەمکردنێك گۆڕینە لە ئاییندا و هەر زیادکردنێکیش (بیدعە) داهێنانێکە لە ئاییندا. کەواتە لە بەشی پەرستشەکان -عبادات-دا ناکرێت هیچ کەمکردن و زیادکردنێکی تێدا بکرێت{٣٢}.

پەیوەندی مرۆڤ لەگەڵ خۆیدا لای سوبحانی ئەم پەیوەندیە لەدەرەوەدا نیە بەڵکو لە ناوەوەیدایە کە ململانێیەکی قووڵە لە دەروون و نەفسدایە، ئەوەی کە مەولانا باسی دەکات وا مەزانە ململانێی نێوان موسا و فیرعەون کۆتایی هاتووە بەڵکو فیرعەون وا لە نەفسی تۆدا!... کە زانستی ئەخلاق وەڵامگۆی ئەمەیە، بەحوکمی ئەوەی کە ئەمەش لە سەردەمێکەوە بۆ سەردەمێکی دیکە جیاواز نیە، بناغەی ئەم فیکرەیەش بریتیە لەوەی کە چاك بوون لەناو مرۆڤدا ببێتە (مەلەکە) ئیدی نەتوانێت خراپ بێت، دەکرێت جاروباریش هەڵە بکات بەڵام نەتوانێت بگەڕێتەوە بۆ خراپی، وەکو چۆن ئەگەر کەسێك خوێندەوار بوو ئیتر جارێکی دیکە ناتوانێت نەخوێندەوار بێت، دەکرێت جارێك لە نووسینێکدا هەڵەیەك بکات بەڵام خێرا راستی دەکاتەوە کاتێك بۆی دەرکەوت هەڵەی کردووە. لێرەوە ئەوە رۆشن دەبێتەوە کە مامۆستا ناصر باوەڕی بە تیۆریای دەروونگەرایی هەیە لە فەلسەفەی ئەخلاقدا کە بەپێی ئەم تیۆریە چاکبوون شتێکی دەروونیە، پەیوەندی مرۆڤە لە ناوەوەی خۆیدا نە لەگەڵ کەسانی دیکەدا، واتە ئەخلاق رێسایەکە لەنێو مرۆڤدا، بەڵام بەو واتایە نا کە چاکە بکات، بزانە چەند وردبووە لە توێژینەوەی بابەتەکانی فەلسەفەی ئەخلاقدا، واتە بریتی نیە لەوەی یەکجار چاکە بکات چونکە دەکرێت خراپەکارەکانیش جاروبار لەبەر رووپامایی (ریاء) چاکە بکەن بەڵکو بریتیە لەوەی کە چاك بوون ببێتە مەلەکە تێیدا وەکو چۆن خوێندەواری دەبێتە مەلەکە لەنێو مرۆڤدا، واتە بەو مانایەی کە نەتوانێت جارێکی دیکە خراپ بێتەوە. ئەمەش لەبەر

ئەوەی لە مرۆڤێکەوە بۆ مرۆڤێکی دیکە ناگۆڕێت بۆیە هەموو ڕێسا ئەخلاقیەکان لە ئاییندا باسکراون و ناکرێت زیادکرنێکیان بۆ بکرێت، ئەگەر کرا ئەوە زیادکردنێکە بە ناوی ئەخلاقەوە ئەگەرنا ئەخلاق نیە {٣٣}.

پەیوەندی سێیەمیان بریتیە لە پەیوەندی مرۆڤ لەگەڵ مرۆڤەکانی دیکەدا ئەمە لەبەر ئەوەی لە سەردەمێکەوە بۆ سەردەمێکی دیکە، لە کۆمەڵگەیەکەوە بۆ کۆمەڵگەیەکی دیکە دەگۆڕێت، ئەگەر قورئان بهاتایە هەموو ڕەهەندەکانی ئەم بابەتەی بەفراوانی باس بکردایە ئەوا قورئان هێندە گەورە دەردەچوو کەس نەیدەتوانی یەکجاریش بیخوێنێتەوە و کەسیش فریا نەدەکەوت هەموو حوکمەکانی قورئان لەو بوارەدا بزانێت، چونکە پەیوەندی کۆمەڵایەتی مرۆڤەکان لە کۆمەڵگەیەکەوە بۆ کۆمەڵگەیەکی دیکە و لە سەردەمێکەوە بۆ سەردەمێکی دیکە دەگۆڕێت، بۆیە قورئان نەهاتووە هەموو ڕێسا کۆمەڵایەتیەکان باس بکات چونکە ئەوەندە زۆر دەبوون کەس بۆی نەدەخوێنرایەوە. هەروەها مرۆڤەکانی ئەو سەردەمەش لێی تێنەدەگەشتن، بۆ نموونە ئەگەر باسی پەیوەندی بکردبایە لە ڕێگەی ئەنتەرنێتەوە عەرەبێك چۆن لێی تێدەگەیشت لەو زەمەنەدا!... بۆیە قورئان لەبری ئەوەی باسی یەکەیەکەی ڕێساکان بکات هاتووە باسی ڕێسا گشتیەکان دەکات لەو بوارەدا واتە ئەو ڕێسایانەی کە دەکرێت لە هەموو سەردەمێکدا دووبارە ببنەوە. وەکو ئەوەی کە چووی بۆ هەر ماڵێك لەدەرگاوە بڕۆ واتە ڕوخسەت وەربگرە، کە ئەمە لەسەردەمی نوێشدا بە هەمان شێوەیە، دەتوانین بۆ تەلەفزیۆنیش بەکاری بهێنین، لە ئەوروپادا هیچ کەناڵێك بۆی نیە بچێتە نێو ماڵەکان بەبێ مۆڵەت، ئەوە لە ولاّتی ئێمەدایە کە بەبێ ئەوەی بەخۆمان بزانین دەبینین ماڵەکانمان و منداڵەکانمان داگیرکراون بە کەناڵە ماهوارەییەکان (سەتەلایت) و ئینتەرنێت! بە هەڕەمەکی و بەبێ ئەوەی هیچ مۆڵەتێکی پێبدرێت {٣٤}.

پەیوەندی چوارەمیان پەیوەندی مرۆڤە لەگەڵ ماڵدا، لێرەشدا سوبحانی دەڵێت لەبەر ئەوەی ئابووری دوو بەشە و بواری دابەشکردنی هەیە لەگەڵ بواری بەرهەمهێناندا، چۆن شت بەرهەم بهێنرێت و چۆنیش دابەش بکرێت، ئەمەش لەبەر ئەوەی بابەتە ئابووریەکان و دراوەکانی مامەڵەپێکردن و پێشکەوتنی تەکنۆلۆژی و لەسەردەمێکەوە بۆ سەردەمێکی دیکە دەگۆڕێت، بۆیە سوبحانی دەفەرموێت ئیتر قورئان نەهاتووە تەواوی ڕێسا ئابووریەکانی بەرهەمهێنان و ڕێسا ئابووریەکانی

دابەشکردن باس بکات، بەڵکو هاتووە ڕێسای گشتی بۆ ئەمانە داناوە وەکو ئەوەی کە نابێت سو و ریبا ببێت، نابێت ماڵ لە دەستی کۆمەڵێکی کەمدا قۆرخ بکرێت ﴿لکی لا یکون دولة بین الاغنیاء منکم﴾ یاخود لە کاتی بوونی جیاوازیدا و دوای دیاری کردنی ئاستی گۆڕاوی ژیاندا کەمترین ئەوەی زیاد لە پێویستی هەیە دەبێت بیداتە هەژارەکانی کۆمەڵگە ﴿ویسألونك ماذا ینفقون قل العفو﴾ کە ئەمانەش هەموویان بریتین لە کۆمەڵە ڕێسایەکی گشتی، کەواتە قورئان لێرەشدا هاتووە ڕێسا گشتیەکەی باسکردووە {٣٥}.

پەیوەندی پێنجەمیش بریتیە لە پەیوەندی مرۆڤ لەگەڵ سیستەمی سیاسیدا یاخود دەوڵەت بە زاراوەی ئەمڕۆ ئەمەش بە هەمان شێوە لەبەر ئەوەی لە سەردەمێکەوە بۆ سەردەمێکی دیکە دەگۆڕێت، قورئان نەهاتووە هەموو وردەکاریەکانی ئەو مەسەلەیە باس بکات، کە وەزارەتەکان چۆن دروست دەکرێن و وەزیرەکان دەبێت چۆن بن؟! بۆ نموونە لەسەردەمی پێغەمبەری خودادا هەمووی لە مزگەوتدا بووە، دەکرێت ئەمڕۆش بەو جۆرە بێت؟! هەموو حکومەت لەناو مزگەوتێکی زۆر گەورەدا دروست بکرێت!... بۆیە قورئان لەمەشدا دووبارە هاتووە ڕێسای گشتی داناوە، کە زۆربەی زاناکان دەڵێن بریتیە لە دوو ڕێسا، یەکێکیان شورایە و ئەوی دیکەشیان بریتینە لە عەدالەت{٣٦} -کە بەبۆچوونی من تەنها یەکێکیانە، ئەویش تەنها شوراکەیە، ئەگەر ئەمیان کرا ئەوا عەدالەتیش هاتووەتە دی چونکە عەداڵەت ڕێسایەکی جیاواز نیە لە شورا بەڵکو هەر خودی ئەوەیە. ئەگەر زۆر لە باسەکە نەچینە دەرەوە، بەلاّم من ڕەخنەیەك کە لە دەستووری نوێی عێراقی هەمە ئەوەیە کە هاتوون عەدالەتیان لە خودی دەستوورەکە جیا کردۆتەوە کە دەبێت دەستورەکە خۆی بەو جۆرە بێت کە عەدالەت جێبەجێ بکات!... بەکورتی دەمەوێت بڵێم ئەو بناغەیەی کە مامۆستا ناصر دایدەنێت بۆ مامەڵەکردن لەگەڵ قورئاندا کە قورئان ئەو پێنج تەوەرەیەی تێدایە کە باسمان کردن، دەبینیت ئەمانە هەمووی لە ڕووکەشدایە، واتە ئەم دابەشکردنە دابەشکردنێکی فیقهیە. چ سیستەمە سیاسیە یان ئابووریەکە یان سیستەمە کۆمەلاّیەتیەکەی کە باسی دەکات دەبینیت بە دەرەوەیە، تەنانەت پەیوەندیە ئەخلاقیەکەی مرۆڤ لەگەڵ خودی خۆیدا کوشتنی خود نیە بۆ خودێکی دیکە وەکو ئەوەی کە (عیرفان) دەڵێت، کە عیرفانی ئیسلامی وا دەڵێت، واتە وازهێنان لە خۆت وەك ئەوەی مەولانا لە شیعرێکیدا باس لە سێبەری

خۆی دەکات، دەڵێت من کەی ماوم تا سێبەرم هەبێت، سەهۆڵ کاتێك توایەوە کوا بوونی هەیە؟! عاریف ئەگەر نەما سێبەری چۆن دەمێنێت واتە (خود) لای عیرفان دەتوێتەوە، بەلام مامەڵەی ئەخلاقی لای مامۆستا ناصر تواندنەوەی خود نیە و بوون بە خودێکی دیکە بەڵکو ململانێیەکە لە نێوان مرۆڤ و خودی خۆیدا، لێرەدایە کە چاکە لە ناخیدا دەبێتە مەلەکە بەلام دەشێت جاروبار هەڵەش بکات چونکە چاکەش و خراپەشی لەنێودایە، بەلام هەر زوو (ویتوبون من قریب) پەشیمان دەبێتەوە واتە گواستنەوەی خود نیە بۆ خودێکی دیکە بەڵکو هەر لەنێو خودی خۆیدایە، بۆیە دووبارە ئەمەش مامەڵەیەکی فیقهیە{٣٧}.

تەنانەت چۆنێتی مامەڵەکردنی مرۆڤ لەگەڵ خودادا لای سوبحانی دووبارە رێکخستنێکی فیقهیانەیە، بەلام فیقه بە مانا (غەزالی)ەکەی، ژیانەوەی زانستەکانی ئایین لای سوبحانی -احیاء علوم الدین- کە بەبۆچوونی مامەڵەی عیبادی لای مامۆستا ناصر زۆر نزیکە لە فیکری ئیمامی غەزالیەوە، بۆ نموونە کاتێك گوێ لە کاسێتەکانی باسی نوێژی مامۆستا دەگریت، هەست دەکەیت نوێژ هەموو ئەو واتایانەیە کە لە فیقهدا باسکراوە بەلام بە مانا رووکەشیەکەی نا... بەڵکو بە مانا قووڵەکانیەوە مرۆڤ کاتێك قیام دەکات ئەم قیامە چی بۆ ئەو دەکات یان کاتێك کە رکوع دەبات یان کرنۆش و...هتد، واتە هەموو نوێژ لای ئەو دوعایەکی بەرجەستەی بینراوە و کرۆکی پەرستشەکانە. دەبینیت دووبارە ئەمیش رێکخستنێکی فیقهیانەیە بەلام فیقهێکی رووکەشی نێو کتێبەکان نا... بەڵکو فیقهێك بە واتای (الفهم الدقيق).

هەروەها بونیادی قورئان لای ئەو یاخود تێگەیشتنی ئەو بۆ قورئان فیقهیانەیە، تەنانەت گۆڕانە شارستانی و مێژووییەکان لای سوبحانی لە دیدێکی فیقهیەوەیە نەك فەلسەفی یان عیرفانی، هەر خودی ئەو بانگەشەیەی کە لای زۆرێك لە فەقیهەکان و لای سوبحانیش بوونی هەیە کە قورئان و شەرع ئەوەندە ئاسانە تایبەت نیە بە فەیلەسوفەکانەوە یاخود بە عاریفەکانەوە، بەڵکو هەموو کەس لە ئاستی خۆیەوە بەشی خۆی لێی تێدەگات، هەر خودی ئەو تێگەشتنە تێگەیشتنێکی فیقهیانەیە چونکە فەقیە بۆ هەموو کەسێکە، کارێکی فەلسەفی نیە کە تەنها فەیلەسوفەکان بیزانن، یان ئیشێکی عیرفانیانە نیە تەنها عاریفەکان لە ئاماژە و ئیشارەتەکانی تێبگەن، لێرەوە واتە مامۆستا ناصر فەقیە بوو{٣٨}.

بێگومان بەهۆی بەهێزی مەخیلەوەیە و ئەو زیرەکیەی کە خودای گەورە پێی بەخشیبوو بەو کەسایەتیە بەهێزەی کە هەر لە سەردەمی منداڵی و قۆناغی لاوێتیەوە توانیویەتی رۆڵی پیرەکانی دەڤەری (پاوە)ی کوردستانی ئێران ببینێت، تەنانەت لەسەردەمی شۆڕشدا (انقلاب)، کاتێك کە لە دژی شای ئێران شۆڕشیان کردووە ئەو لاوێکی تازە پێگەیشتوو بووە بەڵام سەرکردایەتی ئەو شۆڕشەی کردووە، تەنانەت کاتێك دژە ئایینیەکانی ئەو دەڤەرە شەڕیان بە خەڵکی ئەو ناوچەیەی کوردستان فرۆشتووە و شۆڕشی ئێرانیش وەڵامی نەداونەتەوە، ئەو هاتووە لەبری یاخیبوون و رێکخستنی چەکداری -کە یاخیبوون سیفەتی هەر لاوێکە- هەوڵی هوشیارکردنەوەی خەڵکەکەی داوە و رێپێوان و خۆپیشاندانی ئاشتیانە و جەماوەری رێکخستووە و بە یاداشتنامە دەسەڵاتی شۆڕشی ئیسلامی لەو بابەتە ئاگادار کردۆتەوە. ئەگەرچی زۆر گوشاری لەسەر بووە لە دوو رووەوە، لە روویەك فشاری دژە ئایینیەکان کە زۆر خەڵکیان ئازار داوە، لە روویەکی دیکەشەوە بە حوکمی سوننی بوونی و هەبوونی مەدرەسەی قورئان لەنێو شاری پاوەدا زۆر فشاری پیاوانی شۆڕشی ئێرانی لەسەر بووە. لەگەڵ ئەوەشدا مامۆستا ناصر بەهێزی چەکداری وەڵامی نەداوەتەوە هەر چەندە هێندە کەسایەتی بەهێزی هەبووە لەلای دانیشتوانی ئەو ناوچەیە کە دەیتوانی ئەو کارەش بکات، تەنانەت وتارێکی بەناوبانگی هەیە کە بۆ خەڵکی ئەو ناوچەیە داویەتی، بەڵام شێوازی توندوتیژی نەگرتووەتەبەر بەڵکو بەیاداشتنامە بەرزکردنەوە بۆ بەرپرسەکانی ئەنجومەنی ئێرانی و بە رێکخستنی خۆپیشاندانی مەدەنی هەوڵی چارەسەرکردنی کێشەکەی داوە، بەو لاوێیەتیەوە و بەو تەمەنە کەمەوە ئەو تێگەیشتنە قووڵەی هەبووە لە دونیا و سیاسەتی سەردەمی نوێ، کە بەبۆچوونی من هێشتا فیکری سیاسیەکانی کورد نەگەیشتووەتە ئەو ئاستەی کە ئەو پیاوە کردوویەتی{٣٩}، نەك تەنها لایەنی تیۆراندن و بیریاری بەڵکو کرداریش لەنێو شاری پاوەدا ئەوەی کردووە کە ئەم مامەڵەیەی سوبحانی دونیایەك خوێن رژاندنی گێڕاوەتەوە، بەداخەوە کە خەڵکی دیکە زۆر بوونەتە مایەی ئەوەی لەو وڵات و شوێنەدا خوێن بڕژێت، بەڵام ئەو بە حیکمەتی دانایانەی خۆی ئەگەرچی پاشتر زۆر خراپ بەسەر خۆیدا بەخراپ شکاتەوە و نهێنی بووە و ...هتد، لەگەڵ ئەوەشدا نەیهێشتووە ببێتە مایەی ئەوەی فیتنەیەك لەوە زیاتر کە بووە لەو شوێنەدا بخولقێت. واتە تێگەیشتنێکی قووڵی زۆر

سیاسی هەبووە، ئەگەر سیاسەت بریتی بێت لە هونەری مومکینات و رۆژناسی بە راستی ئەو زۆر واقیع بین و رۆژناس بووە، زۆرباش لەو بابەتانە گەیشتووە، بۆیە لەو رۆژگارەدا کە چەك زۆر بووە، حیزب و لایەنە نەیارەکان زۆر بوون بەڵام ئەو خەباتی مەدەنیانەی هەڵبژاردووە! لەو رۆژگارەدا شتێکی مەزن بووە. مەبەستم ئەوەیە لەگەڵ هەموو ئەوانەشدا دواجار تێگەیشتنەکانی ئەو تێگەیشتنێکە فیقهیانە بوون لە قورئان نە تێگەیشتنێکی فەلسەفیانە و نە تێگەیشتنێکی عاریفانە.

## سانەکانی وەرگەڕان لە شارستانیەتدا:

تێگەیشتنی مامۆستا ناصر بۆ وەرگەڕانی شارستانیەتەکان بە بۆچوونی من تێگەیشتنێکە زۆر نزیکە لە تێگەیشتنی (مەکئەنتایر)ەوە. مەکئەنتایر قەناعەتی وایە کاتێك سیستەمە ئەخلاقیەکان گۆڕان ئیتر شارستانیەتەکانیش دەگۆڕێن، خاڵی لاوازی شارستانیەتەکان لە کەمهێنانی سیستەمی ئەخلاقیان دایە. مامۆستا ناصریش باوەڕی وایە کە شارستانیەتەکان بە گۆڕینی سیستەمی ئاییینیان لە نوێ بوونەوەدان، ئەو قەناعەتی وایە دوای هاتنی شارستانیەتە کیتابیەکان —یەهود و نەسارا و ئیسلام— چۆن ئەمە لە یەهودیەکان سەندرایەوە و درایە دەست مەسیحیەکان و دوای ئەوەی چۆن لەم دوو ئەهلی کیتابە سەندرایە و درایە دەست موسوڵمانەکان، کە ئەم گۆڕانە دەکاتە بناغەی تەفسیرکردنی قورئان یاخود ریزبەندی قورئان. دەفەرمووێت سورەتی (الفاتحة) دەقی هەموو قورئانە و سورەتەکانی دیکە هەموویان شەرحی ئەو دەقەن. جا لە سوورەتی (البقرة)وە پێیدا دێت کە ئەم سورەتە باسی وەرگەڕانی مێژوو دەکات، ئەویش سەندنەوەی خەلافەتی خودایە لەسەر زەویدا لە یەهود و نەسارا و دانەوەیەتی بە موسوڵمانان، لای مامۆستا ناصر ئەمە تەوەرەی بنەڕەتی ئەو سورەتەیە و هەمووی باسی ئەو بابەتەیە، هەر بۆیەش لێرەدا باسی گۆڕانی قیبلەی تێدایە، کە ئەمە رەمز و هێمایە بەلای مامۆستا ناصرەوە، بەو مانایەی گۆڕینی رووگە لە (بیت المقدس)ەوە بۆ مەککە سەندنەوەی خەلافەتە لە ئەوان و دانەوەیەتی بە کۆمەڵێکی دیکە. لە سورەتی (آل عمران)دا باسی هۆکارە زاتی و خۆییەکانی ئەو وەرگەڕانە دەکرێت کە بریتیە لە لادانی عەقیدیان —انحراف العقیدة— کە شتێکی روونە و ئاشکرایە، نافەرموێت گۆڕانی عیشقیان وەکو ئەوەی لای سەعید نوورسی بوونی هەیە. بۆیە سوورەتی (آل عمران)

بە فراوانی باسی لادانی عەقیدی یەهود و نەسارا دەکات. دوای ئەوە لە سورەتی (النساء)دا باسی هۆکارە بابەتیەکانی ئەو گۆڕانە مێژووییە دەکرێت، کە بریتیە لە ستەمکردنیان لە ژن و منداڵ، بەو شێوەیە سوبحانی ریزبەندیەك لە هەموو سوورەتەکانی قورئان پیشان دەدات، کە بیرۆکەی ئەمەش بریتیە لە گۆڕانی شارستانیەتەکان –کە ناکرێت فراوانتر لەسەری قسە بکەم لەبەر کەمی ماوە و کات– دەبینیت لێرەشدا دووبارە دیدێکی فیقهیانە زاڵە. تەنانەت ئەو دوو ئایەتەش کە دەیانکاتە بناغەی قورئان لە تەفسیرکردنیدا، کە لە ئایەتەکانی: ﴿هو الذی بعث في الامین رسولا منهم یتلوا علیهم ءایته و یزکیهم و یعلمهم الکتب والحکمة و ان کانوا من قبل لفي ضلل مبین﴾ (الجمعة/٢). ﴿ادع الی سبیل ربك بالحکمة و الموعظة الحسنة و جادلهم بالتی هي احسن ان ربك هو اعلم بمن ضل عن سبیله وهو اعلم بالمهتدین﴾ (النحل/١٢٥). دەبینیت کە دووبارە ئەو بناغەیەش کە لێرەدا دایدەنێت بناغەیەکی فیقهیانەیە، واتە مامەڵەیەکی دەروونگەرا نیە لەناوەوە بێت، مامەڵەیەکە لە دەرەوەی مرۆڤدا، بۆ نموونە لە تەفسیری ﴿یتلو علیهم آیاته﴾ دەفەرمووێت ئەو ئایەتانە بریتین لە ئایەتەکانی ﴿آفاق﴾ و ﴿أنفس﴾، سەیر کردنی ئاسمان و زەوی و...هتد، لەگەڵ ئەوەدا کە لە مرۆڤدا کەشف دەکرێت، تەزکیەش ﴿یزکیهم﴾ واتە خوێندنەوەی ئایەتەکانی بەهەشت و جەهەننەم، ﴿و یعلمهم الکتاب و الحکمة﴾... کیتاب واتە رێسا گشتیەکانی حوکمەکانی شەریعەت، حیکمەتیش چونێتی جێبەجێکردنی ئەو رێسایانە. ئەم چوار شتە کە بریتین لە خوێندنەوەی ئایەتەکانی ئافاق و ئەنفوس و تەزکیە (خوێندنەوەی ئایەتەکانی جەهەننەم و بەهەشت –کە تەزکیە لای کاك ئەحمەد مانایەکی دیکەی هەیە– فێرکردنی کیتاب (رێسا گشتیەکان) و هەروەها حیکمەتیش (چۆنێتی جێبەجێکردنی رێساکان)، ئەمانە لای مامۆستا ناصر ستراکچەرێکە لە هەموو قورئاندا دووبارە بووەتەوە. بۆیە دەفەرموێت زۆربەی سورەتە مەکیەکان بە ئایەتەکانی ئافاق و ئەنفوس دەست پێدەکەن. تەنانەت زۆرێك لە هەڵەی موفەسیرەکان بەمە راست دەکاتەوە، بۆ نموونە لە سورەتی (العادیات)دا موفەسیرەکان –العادیات– بە ئەسپی موجاهیدەکان راڤە دەکەن، سوبحانی دەفەرموێت نا.... لەبەر ئەوەیَ لە سەرەتای سورەتەکەوەیە و سەرەتای سورەتەکانیش ئایاتی ئافاق و ئەنفوسە، ئەو تەفسیرە شیاوترە کە باس باسی هەورەکانە، نەك یاڵی ئەسپەکان کە بەدەم باوەن، کە زۆربەی تەفسیرەکان

وایان باسکردووە، لە کاتێکدا باسی کەون و هەوری ئاسمانە. دەبینیت ئەو ڕێسایەی کە دایدەنێت ئەو تەفسیرانەش ڕاست دەکاتەوە {٤٠}.

تەنانەت دەفەرموێت ئەو سورەتانەی بە ئایاتی ئەحکام دەست پێدەکەن وەکو سوڕەتی (الحج) یان سورەتی (الانفال)، ئەوا دەبێت لە سورەتەکەی دیکەی پێش ئەو سورەتەدا ئایاتی تەزکیە و پێش ئەویش ئایاتی ئافاق و ئەنفوس ببێت {٤١}، بۆ ئەوەی ئەو ستراکچەرە پارێزراو بێت، لێرەشدا دووبارە مامەڵەیەکی فیقهیانە دەبینیت. هەروەها لەو پۆلبەندیە دوانیەکەی کە دەیکات بۆ نموونە هەمیشە نوێژ و زەکات بەیەکەوە، ئەم دابەشکردنە دابەشکردنێکی فیقهیە بۆ قورئان. هەموو ئەمانە ئەوەمان پیشان دەدا کە مامۆستا ناصر فەقیە بووە بەڵام فەقیهێك بە مانا فراوانەکەی، فەقیهێك کە هەقی فیقهەکەی خۆی داوە و زۆر جێگەی سەرنجە کە بەرپەرچی هەموو ئەوەی داوەتەوە کە پێچەوانەی ئیستدلالەکانی ئەوە بەبێ ترس! زۆر بوێرانە و رەسەنانە بەیانی تێگەیشتنەکانی خۆی کردووە. تەنانەت هەندێك فەتوای شازیشی هەیە بەو مانایە، کە بەبۆچوونی من فیکرەی هەندێکیانی لە کاك ئەحمەدەوە وەرگرتووە و دواتر خۆی لێکۆڵینەوەی لەسەر کردوون، بۆ نموونە ئەو قەناعەتی وایە کەسی بانگخوازی یەکەم دەتوانێت نەڕوات بۆ نوێژی هەینی، کە لای کاك ئەحمەدیش هەمان شت هەیە، بەڵام ستوبحانی هاتووە ئیستیدلالێکی قووڵتر لەوەی موفتیزادەی بۆ دەکات، بۆیە من پێم وایە کە مامۆستا ناصر زۆرێك لە فیکرەکانی لە کاك ئەحمەدەوە وەرگرتووە بەڵام دواجار بەوەی کاك ئەحمەدیشەوە نەوەستاوە و بەڵکو زیاتر بەدوایدا چووە و فیقهی هەبووە بۆ قورئان و بەمەش بونیادی قورئانی بەو پێشگریمانەیەی خۆی کەشفکردووە، دوایی ئەم بونیادەی کردوەتە بناغەیەك ئەحکامە فیقهی و ئوصولیەکانی خۆی لێدەرهێناوە. ئەم قسەیەی ئێستا کردم پوختەی ستوبحانیە. دوای ئەوەش کە گەیشتوەتە ئەو دەرەنجامە، واتە دەتوانین مامەڵەکردنی ستوبحانی بکەین بە چەند قوناغێکەوە، قوناغی گەنجی و ئەو کاتەی خەریکی خوێندنی حوجرە و فیقهی تەقلیدی و شەرع و فەقێیەتی بووە بەڵام سەرکەوتووتر لە فەقێکانی دیکە، هەتا ئەو کاتەی کە مەدرەسەی قورئانیان لە شاری پاوە دروستکردووە لەگەڵ هاوڕێکانیدا و بەرەبەرە شارەزا بووە لە فیکری شیعەکان و بیریارەکانیان و فیکری موفتیزادە و تەنانەت فیکری سەلەفی و دواتریش شارەزابوون و تێکەڵبوونی لەگەڵ فیکری (برایانی

موسوڵمان)دا، واتە لە دوای قۆناغی فەقێیەتی بەولاوە کە دەبێتە مەلا لە گوندی دوریسان ئیتر خەریکی خوێندنەوە و بەدواچوونی دەرەوەی ئایین بووە، لەو کاتانەدا بووە کە زۆر گفتوگۆی لەگەڵ لایەنە چەپ و نەتەوەییەکانی ئێراندا کردووە و وەکو موعجەب بوونی بە فیکری شیعی مەعریفەی دەرەوەی ئایینی خوێندووەتەوە...

ئەمەش قۆناغێکی تری ژیانی مامۆستا ناصرە. واتە قۆناغی یەکەمی خوێندنی حوجرەی بووە، قۆناغی دووەم فیکری سیاسی بۆ دروست بووە لەگەڵ فیکری دەرەوەی ئایینیدا کە شتی لێ خوێندووەتەوە و بەدواچوونی زۆر قووڵ و وردی بووە، هەرچەند ئەم قۆناغەی زۆر ئاشکرا نیە و تەنانەت ئەوانەی لەگەڵیدا ژیاون زۆر کەشفی ناکەن، رەنگە بەسەیرکردنی کتێبخانەکەی دەربکەوێت کە چ شتێکی دیکەی خوێندۆتەوە، ئیتر لێرە بەدواوە وەکو قۆناغێکی نوێ وەرگەڕانێك لە ژیانی سوبحانیدا دروست دەبێت وەکو زۆربەی بیریارەکانی دیکە، بۆ نموونە سەعید نوورسی دوای ئەوەی کە لە روسیا دەگەڕێتەوە و لە تەمەنی چل و پێنجساڵیدا ئەو شۆڕشە رۆحی و فیکریەی بۆ دروست دەبێت یان کاك ئەحمەدی موفتیزادە کە لە ساڵی چل و سێی هەتاویدا ئەوەی بۆ دروست دەبێت{٤٢}. مامۆستا ناصریش بە هەمان شێوە لەسەرەتای شۆڕش و دوای شۆڕشی ئیسلامیەوە بۆی دروست دەبێت و ئیتر واز لەو مەعریفە دەرەوەی ئایینیە دەهێنێت و دەبێتە کەسێکی قورئانی، ئەم سەردەمە قورئانیەشی بەبۆچوونی من دوو قۆناغی هەیە: قۆناغی یەکەم: ئەو کاتەیە کە دەیەوێت بونیادی قورئان بدۆزێتەوە بەپێشگریمانەیەکی فیقهیەوە بەڵام زۆرباش و سەرکەوتووانە ئەو کارە ئەنجام دەدات، قوناغی دووەم: لەنێو قورئاندا بریتیە لەو قۆناغەی کە ئیتر قیام دەکات و رازی نابێت بەو تەشویهانەی بەناوی ئایینەوە لە ئێراندا دەکرێن، سیستەمی سیاسی بەدیاریکراوی و ئەو تێکدان و شێواندنانەی دەسەلاتداران و واعیزەکانی ئێران ئەنجامی دەدەن کە ئەو ناویان دەنێت (محرف القرآن).... دێن ئایەتەکانی قورئان دەکەنە دەلیل بۆ شتانێکی ناقورئانی! لێرەدایە کە بەبۆچوونی من مامۆستا ناصر قیام دەکات، قیامێك کە لەسەر ژیان و کەسایەتی خۆی زۆر دەکەوێت ئەوە بوو دواجار شەهیدیان کرد! لێرەدایە کە ستراکچەری قورئانی بەو دیدەی خۆیەوە کەشفکردوە، واتە بۆی دەرکەوتوە کە قورئان ستراکچەرێکی هەیە، ئەم بنەمایەش دەکرێت شارستانیەت و...هتد، پێی بخوێنرێتەوە، دەگونجێت مەزهەبەکانی پێ راست بکەیتەوە و دەکرێت شەهادەتی

پێ ئەنجام بدەیت! چونکە شاهیدیدان لای مامۆستا ناصر سێ جۆرە... شاهیدی تاکەکەسی و شاهیدی خێزانی و لەگەڵ شاهیدی کۆمەڵگەدا، شاهیدی دەبێت لەهەر سێ ئاستەکەدا دروست ببێت ئەگەر نا موسوڵمانان گوناهبارن! شاهیدی تاکەکەسی واتە کەسێك ببێت کە ببێتە شاهید بەسەر تاکە تاکەی کەسەکانەوە، شاهیدی خێزانی واتە خێزانێك ببێت لەهەر کۆمەڵگەیەکدا ببێتە شاهیدی خێزانی واتە خێزانێك ببێت لەهەر کۆمەڵگەیەکدا ببێتە شاهید بەسەر خەڵکیەوە کە لە قیامەتدا وتیان بۆچی ئێوە وەك خێزانەکانی دیکە ئەحکامەکانی ئایینتان جێبەجێ نەکرد، بەڵگەیان پێ نەبێت لەسەر ئەوەی کە خێزانێك نەبوو لە کۆمەڵگەی ئێمەدا بتوانین چاوی لێ بکەین، ئینجا شاهیدبوون لەسەر ئاستی کۆمەڵگەکان بەشێوەیەکی گشتی، کە ئەمە یەکێك لە دابەشکردنە زۆر جوانەکانە لای مامۆستا ناصر بەبۆچوونی من. کە دەشێت بووترێت ئەمە جۆرێکی دیکە دارشتنەوەی فیقهیانەتری فیکری حەسەن بەنایە کە لای ئەو بریتیە لە چاکسازی تاکی و چاکسازیە خێزانیەکان و پاشان چاکسازی کۆمەڵگە کە ئەمەش کورتە و برپرەی فیکری ئیخوانیە. سوبحانی ئەمە دەبەستێتەوە بە شاهیدیدانەوە و لەسەر هەرسێ ئاستی تاك و خێزان و کۆمەڵگە کە ئەمەش یەکێك لە دابەشکردنە زۆر ورد و جوانەکانی لای سوبحانیە کە دێت ڕێسا کۆمەڵیەکان لەنێو کۆمەڵگەدا لە ڕێسا تاکی و خێزانیەکان جیا دەکاتەوە، کە دەشێت ئەمە بکرێتە بناغەی زانستە مرۆڤایەتیەکان لە فیکری سوبحانیدا و تەنانەت دەشکرێت بکرێتە نامەیەکی دوکتۆراش.

خاڵێکی ورد لەم بابەتەدا هەیە دەمەوێت ئاماژەی پێبدەم ئەویش ئەوەیە کاتێك سەیری زانستە مرۆڤایەتیەکان دەکەیت لە ڕۆژئاوادا دەبینیت دوو ئاستە، ڕێسا تاکیەکان ئەوەی کە پەیوەندی بە تاکەکەسەوە هەیە، کە دەروونزانی و ئەو زانستانەی پەیوەندیان بە دەروونناسیەوە هەیە نوێنەری ئەم ئاستەن لە زانستە مرۆڤایەتیەکان کە بە بۆچوونی من باشترە پێی بووترێت (علوم النفس). ئاستی دووەمیان ئەو ڕێسایانە دەگرێتەوە کە پەیوەندی بەهەموو کۆمەڵگەوە هەیە. بەڵام ناصری سوبحانی بەم دووانە ڕازی نابێت! بێگومان ئەمە یەکێك لە هێڵە زۆر باریك و جیاکەرەوەکانی نێوان ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوایە، کە بەبۆچوونی من هەم حەسەن بەننا پێکاویەتی و هەمیش ناصری سوبحانی کە دووبارە دیدێکی قورئانی هەیە لەو بوارەدا باش پێکاویەتی کە لەم نێوانەدا ئاستێکی دیکەش هەیە کە ئەویش ئەو

زانستانەن کە پەیوەندیان بە خێزانەوە هەیە{٤٣}. ئەمە ئەو شتەیە کە لە زانستە مرۆڤایەتیەکانی رۆژئاوادا ونە، لەوێ ئەم بوارە بوونی نیە، هەر بۆیەش ئێستا خێزان ئەو رۆڵەی نیە لەوێ کە پێشتر بوویەتی لە کۆمەڵگەکانی پێش مۆدێرنەدا!... خێزان لەسەردەمی نوێدا شوێنکەوتەی رێسا تاکیەکانە، واتە ئارەزووی مرۆڤەکەیە بیەوێت خێزان دروست دەکات و بیەوێت وازیشی لێدەهێنێت! بەو مانایەی کە خێزان ئیتر ئەو دەزگایە نیە تاکی بەشوێن خۆیدا کێش کردبێت، بەڵکو ئەو خۆی ئەو دەزگایەیە کە بەشوێن تاکەوەیە!.

پیاوێکی رۆژئاوایی دەتوانێت تاکۆتایی تەمەنی لەگەڵ چەندین ژندا بژیت و لێیان جیا ببێتەوە، ژنێکیش هەر بەهەمان شێوەیە. دەکرێت کەسێك لە رۆژئاوادا باوکیشی نەبێت و دایکیشی نەبێت و هیچ عەیبیش نەبێت. بەلام ئەو کەسەی سەرنجی کۆمەڵگە رۆژهەلاتیەکان دەدات کە بە رای بەندە ئەمە زۆر پێویستە هەموو رۆشنبیرەکانی رۆژهەلات بیزانن و ئاگاداری بن کە زانستە مرۆڤایەتیەکانی رۆژئاوا بەتەنها ئێمە تێر ناکەن. ئەگەر ئێمە بەرەو مۆدێرنە دەڕۆین ئەوا من قسەیەکم نیە، بەلام ئەگەر هێشتا لە رۆژهەلاتدا دەژین ئەوا بێجگە لە رێساکانی تاك و رێساکانی کۆمەڵگە، کۆمەڵە رێسایەکی دیکەشمان هەیە کە ئەویش رێساکانی خێزانە هەر بۆیە لە زانستە مرۆڤایەتیەکانی رۆژئاوادا پێی دەووترێت ئەحوالی شەخصی —قانون الاحوال الشخصية— ئەگەر لێرەدا سەرنج بدەین قووڵی یاسامان بۆ دەردەکەوێت!!... بەلام بەبۆچوونی من ئەمە دەبێت زانستێکی دیکە بێت لە ئاستی خێزاندا نە ئەحوالی شەخصی، کە ناصری سوبحانی باش ئەمەی پێکاوە کە دەڵێت شاهیدی سێ بوارە، شاهیدی تاك، شاهیدی خێزان، لەگەڵ شاهیدی کۆمەڵگە. کەواتە رێسای تاك و رێسای خێزان و رێسای کۆمەڵگەش، کە دەبوو فیکری ئایینی زۆرکاری لەسەر ئەمە بکردایە کە یەکێك لە داهێنانەکانی ئەو پیاوە بلیمەتەیە!.

دووبارە دەتوانین بڵێین زۆربەی چارەسەری گرفتەکانی کۆمەڵگە لەلای سوبحانی لە دیدێکی فیقهیانەوە هەوڵی بۆ دەدرێت، بەلام دواتر باسی ئەوە دەکەم کە فیقھ لای مامۆستا ناصر بەمانا تەقلیدیەکە نیە کە تەنها ئەحکامی تاکەکەسی بن واتە وەك ئەوەی حوکمێك بۆ فلانە شت و حوکمێکی دیکە بۆ فلانە شتی دیکە یان بۆ فلان بابەتی دیکە بەڵکو رێسا فیقهیەکان لای مامۆستا ناصر بەرزبوونەتەوە لە حوکمی تاکیەوە کە فلانە شت حەلالە و ئەوە حەرامە و ئەمەشیان مەکروهە...

بەرەو سیستەم، ئەمەش یەکێك لە داهێنانەکانی ئەوە کە توانیویەتی فیقهی پێ بەرز بکاتەوە. بۆ نموونە نایەت لە ئابووریدا وەکو ئەوەی کە فەقیهەکانی دیکە کردوویانە هەرچی ئەحکامی فیقهی تایبەت بە ئابووری جیای بکاتەوە، هەروەها نایەت لە سیاسەتدا وەکو ئەوەی کە زۆر بینراوە لە فەقیهەکانی سەدەی بیست بەتایبەتی لای عەرەبەکان، فەقیهە گەورەکانیان و تەنانەت تازەکانی وەکو زوحەیلی و...هتد، هاتوون هەرچی ئەحکامی فیقهی کە پەیوەندی بە سیاسەتەوە هەیە کۆیان کردووەتەوە. بەڵکو مامۆستا ناصر هاتووە لە خودی ئەو ئەحکامە فیقیانە سیستەمی ئابووری لێ دروست کردووە کە ئەمە گەورەترین داهێنانێکە لە فیکری ئاییندا کردوویەتی{٤٤}. سوبحانی هاتووە لەو ئەحکامانەی پەیوەندیان بە سیستەمی سیاسیەوە هەیە سیستەمی سیاسی دروست کردووە، ئەمەشە رۆحی باسەکانی سیستەمی سیاسی لای ئەو، کەواتە دوبارە لێرەشدا مامەڵەکردنی ئەو مامەڵەکردنێکی فیقهیانەیە بەڵام سیستەمی فیقهی!... جوانتر لەمە تەنانەت کاتێك کتێبی (فەتواکان)ی دەخوێنێتەوە هەست دەکەیت دابڕاو نین لەیەکتری بەڵکو هەست بەبوونی سیستەمێك دەکەیت، لەکاتێکدا ئەمە لە نوێترین فەتواکانی فەقیهێکی گەورە و ناسراوی جیهانی ئیسلامی وەکو (یوسف القرضاوی)دا بەدی ناکەیت، هەست دەکەیت پەیوەندیان بەیەکدیەوە نیە، لێرەدا باسی شتێك دەکات و فەتوای لەبارەوە داوە لەولاتر باسی شتێکی دیکە دەکات زۆر دوور لە ئەو، بەو مانایەی پرش و بلاویەك هەیە لە فەتواکانیدا{٤٥}، بەڵام مامۆستا ناصر کۆی فەتواکانیشی سیستەمێك دروست دەکەن! ئەو نایەت کۆمەڵە فەتوایەك بدات و پێشەکیەك بنووسێت بۆ فەتواکانی بەڵکو پێشەکیەکی نووسیوە بۆ کۆی فەتواکانی! واتە تیۆراندنێکی گشتی و داڕشتنی سیستەمێك و بەپێی ئەو سیستەمە فەتواکانی ئەنجام دەدات، کە ئەویش لەسەر بناغەی تەسەور و تەسدیقاتی ئایینیە{٤٦}. کە دێت وێناکردنە ئایینیەکان دیاری دەکات و پاشان تەسدیقاتەکان، یان جیهان بینی وەك ئەوەی لە لێکۆڵینەوەی نوێدا دەکرێت، کە بابەتی نوێ پێویستی بە چوار شت هەیە کە ئەوانیش بریتین لە مەرام وجیهانبینی و ئامراز و چەمك، هەست دەکەیت ئەو چوار شتە لە پێشەکی فەتواکانیدا دادەرێژێت و بەپێی ئەو چوار شتەش دوایی لەگەڵ هەر یەك لە فەتواکانیدا مامەڵە دەکات! دووبارە سیستەمێك بۆ فیقهەکەی دادەنێت. هەروەها سیستەمێك بۆ ئیجتیهادکردن و موجتەهید دادەنێت کە

موجتەهید کێیە، سیستەمێك بۆ كەسی ئەهلی شورا دادەنێت لە باسی سیستەمە سیاسیەكەیدا. هەروەها بابەتی ئابووری لای ئەو بابەتێكی پرش و بلاّو نیە، دەبینێت كە هەمووی كۆ دەكاتەوە لە سیستەمێكدا و سیستەمەكەش كۆ دەكاتەوە لە وشەیەكدا كە ئەویش زاراوەیەكی قورئانیە و بریتیە لە (العفو){٤٧}. كە بە راستی ئەمە شتێكی زۆر گەورەیە لای سوبحانی، برینی فیكری ئایینی تەقلیدیە ئەو خورافەیەی تێكشكاند كەوا دەزانرا ئیتر تەواو فیكری ئایینی كۆتایی هات.

مامۆستا ناصر دوو شتی كرد، سەیری كرد هێشتا ئەو فیقهە نەریتیە شتی تێداماوە و دەكرێت داهێنانی نوێتری تێدا بكرێت، ئەمەش یەكێك لە خالّە جەوهەری و جیاوازەكانی نێوان (سوبحانی) و (عبدالكريم سروش)ە، بەبۆچوونی من ئەو دوو كەسایەتیە چەند جیاوازیەكیان هەیە، كە یەكێك لە جیاوازیەكان ئەمەیە، عەبدولكەریم سروش باوەڕی وایە كە بە فیقه سەردەمی نویّ دروست ناكرێت، كە منیش لەمەدا وەكو حەقیقەتێكی زانستی بۆچوونم پێچەوانەی سوبحانیە كە دەكرێت دواتر باسی ئەوە بكەم، سروش لە كتێبی (مدیریت و مدارات) باوەڕی وایە كە فیقە دەولّەتداری پێناكرێت، چونكە فیقە شتی تیكە تیكە و جیاوازە و سیستەم پێك ناهێنێت{٤٨}، بەلاّم ناصری سوبحانی توانی ئەوە بسەلمێنێت كە فیقە تەنها ئەحكامی پارچە پارچە و لە یەكتر جیاواز نیە، بەلّكو سیستەمێكە بەیەكەوە كە بۆ خۆی توانی ئەوە بكات كە سیستەمی ئابووری و سیاسی لە فیقهی نەریتی دەربهێنێت نەك لە مەزهەبەكان!... بەلاّم عەبدولكەریم سروش دەلّێت بە زانستە مرۆڤایەتیەكان مودیریەتی كۆمەلّگە دەكرێت نەك بە فیقە چونكە فیقە ئەحكامی تەقلیدیە و سیستەم نیە، بەلاّم سوبحانی دەلّێت سیستەم هەیە و توانیشی بیسەلمێنێت كە هەیە!.

هەروەها لە قۆناغەكانی تەفسیركردنی قورئاندا لای سوبحانی بە هەمان شێوە هەست بەبوونی سیستەمێك دەكەیت. كە زۆربەی شتەكان ئەحكامی فیقهی پێدەرهێناون، ئەو دەرەنجامە تازانەی گرتوونی هەمووی دەرەنجامی فیقهین. تەنانەت زۆرجار حوكمی بوون و نەبوونی عیبادەتێكی لە شوێنكاتێكدا دۆزیوەتەوە! بۆ نموونە تەسبیحات لە ساتی رۆژهەلاّتن و رۆژئاوا بووندا ﴿...قبل طلوع الشمس و قبل غروبها...﴾ یاخود نوێژێكی سوننەت لەساتی هەلّهاتنی خۆردا كە ئەمە لای فەقیهەكانی دیكە باسنەكراوە، یاخود ئەو چارەسەرانەی بۆ شتەكانی سەردەمی

نوێی دەکات، بۆ نموونە بوونی پەیکەر و وێنە لە ماڵەکاندا و ...هتد، نایەت وەك (محمد عمارە) یان وەکو (محمد شحرور) بەو شێوەیە تەفسیری قورئان بکات کە لەگەڵ فیکری نوێدا گونجاوە، بەڵکو سوبحانی دێت لە فیکری فیقهی نەریتیەوە وەڵامێکی رازیکەر بۆ ئەو بابەتە دەدۆزێتەوە! واتە هەر ئەو ئەحکامە ئوسولیانەی خۆی لە قورئان و سوننەتەوە دەریان دەهێنێت ئەو دەرەنجامەی پێدەبەخشن. لێرەوە کەواتە ناصری سوبحانی دوو شتی کرد، یەکێکیان ئەوەی ئیمکانیاتی فیقهی تەقلیدی دۆزیەوە، دووەمیشیان توانی بیسەلمێنیت کە ئەمانە وەڵامگۆی بۆشاییەکانی سەردەمی نوێن.

## خەوشەکانی سەردەمی نوێ لای سوبحانی:

لای سوبحانی لەگەورەترین خەوشەکانی سەردەمی نوێ بریتیە لەهەرچی زیاتر دوورخستنەوەی مرۆڤەکان لەیەکتر، واتە دروستبوونی جیاوازی چینایەتی کە ئەمە یەکێك لە خراپترین دەرەنجامەکانی سەردەمی مۆدێرنەیە، یەکێکی دیکە لە خراپیەکانی سەردەمی نوێ بریتیە لە دروستکردنی ململانێ لە نێوان نەتەوە جیاوازەکاندا، لێرەدایە کە دەکرێت وەڵامی چۆنیەتی فیکری نەتەوەیی لای مامۆستا ناصر بدۆزینەوە.

یەکێکی دیکە لە دەرەنجامە خراپ و ترسناکەکانی سەردەمی نوێ بریتیە لەبوونی زەمینەی دروست بوونی چینی ئاسنینی دەسەڵاتدار و بەردەوام قۆستنەوەی هەلەکان و گەورە بوونێکی شێر پەنجەیانە، لەولاشەوە ژێردەستەبوون و لاوازتر بوونی چینی دەرەوەی دەسەڵات کە ئەمانە هەموویان بۆشایی گەورەن لە سەردەمی نوێدا، بەڵام سوبحانی وەڵامی هەموو ئەوانە لە قورئانەوە دەردەهێنێت یاخود بڵێین لە فیکری فیقهیەوە هەوڵی پڕکردنەوەی بۆشاییە ترسناکەکانی سەردەمی نوێی داوە. کە لە کاسێتەکانی باسی سیستەمی ئابووری و سیستەمی سیاسیدا بە روونی دەردەکەوێت بۆ نموونە بەرزبوونەوەی هەندێك بۆ ئاسمان و رۆچوونی هەندێکی دیکەش بەناخی زەویدا! یان ئەوەی لە فیکری نەتەوەییدا کۆمەڵێك نەتەوە خۆیان بە (شعب الله المختار) دەزانن! ئەو وەڵامی ئەو بابەتە دەدۆزێتەوە، وەڵامی موسایانە بە زاراوەی خۆی، کە حەزرەتی موسا هەم ئیشی نەتەوەییشی کردووە و هەم ئیشی پێغەمبەرانەش، سەرچاوەی هێزی هەردوو

شتەكەش یەك شت بووە، ئەوە نیە كە ناودژێتی —تناقض— لە نێوانیاندا ببێت!. بە دژی زۆرداری و ستەمی فیرعەوندا رۆیشتووەتەوە لە هەمان كاتیشدا مافی نەتەوەی خۆیشی داوا كردووە ﴿وان ارسل معي بني اسرائيل﴾ كە بەنی ئیسرائیل نەتەوەی ئەو بوون، بەبێ ئەوەی بۆچوونی شۆڤێنی بۆ دروست ببێت!... بەلاَم فیكری نەتەوەیی نوێ ناكرێت ژیانی شۆڤێنی دروست نەكات كە لە لای (مەكئەنتایر)یش بەهەمان شێوەیە، ئەو دەلێت من ژیانی لیبرالیم پێ باشترە تا ژیانی جەماعی{٤٩}، چونكە ژیانی بەكۆمەلّ مومكین نیە فاشیەت دروست نەكات! بەلاَم سوبحانی وەلاَمی ئەم پرسیارەی دووبارە لە قورئانەوە دەرهێناوە كەواتە دەرەنجامێكی فیقهیە، هەروەها سیستەمی شورا لای سوبحانی و نەقۆستنەوەی دەسەلاَت و هەلە سیاسی و ئابووریەكان لەلایەن كەمینەیەكەوە، لێرەشدا دووبارە هەست دەكەیت دەرەنجامێكی فیقهی گرتووە.

هەست دەكەیت زۆربەی شتەكانی كاك ئەحمەدی موفتیزادە لای مامۆستا ناصری سوبحانی بوونیان هەیە بەلاَم قوولّتر و قورئانیانەتر و مەقاسیدیانەتر، هەر بۆیەش ناصری سوبحانی زۆر لەگەلّ (شاطبی)دا ژیاوە تەنانەت كتێبەكانی (شاطبی) پوختە كردوون{٥٠}.

هەروەها شتێكی گرنگتر لای سوبحانی بریتیە لە دۆزینەوەی وەلاَمێكی فیقهیانەی قوولّ بۆ كێشەیەكی جەوهەری وەكو (بابەتی كوشتار لە ئیسلامدا) كە بە تایبەت ئەمرۆ پرسێكی گەورەیە، بدۆزرێتەوە، بێگومان لە مێژووی هزری نوێی ئیسلامدا دوو بالّی دژ هەبوون دەربارەی جیهاد و فیكری قیتال لە ئیسلامدا، بالێك كە بەتەواوەتی و بەمانای وشە ئەوەیان بەرجەستە كردووە و دوای پەنجاكان و زیندانەكانی میسر ئەم فیكرە تەفكیریە تەهجیریە دەركەوتووە كە فیكری جیهادیان تا ئەوپەڕی توند كردووە، دووبارە كۆمەلێكی دیكەش كە لە كۆتایی سەدەی نۆزدە و سەرەتای سەدەی بیستدا (ئەحمەدیەكان) لە پاكستان و هیندوستاندا ئەوەیان كردووە كە فیكری جیهادی بەهەموو شێوەیەك رەت دەكەنەوە و ئەمەش بۆخۆی داستانی خۆی هەیە، بەلاَم مامۆستا ناصری سوبحانی بە وەلاَمێكی فیقهیانەی قورئانیانە، توانی تیۆراریزەكردنی فیكری قیتال بكات لە ئیسلامدا، تیۆراندنێكی مەدەنیانە، تیۆریایەك كە هەم پێوەرە نەریتیەكانیشی پاراست بێت وەك ئەوەی كە زۆر لە كلتوردا شارەزا بووە، واتە پێوەرەكانی شەرع (قورئان) و (سوننەت)یشی پارێزگاری لێكرد و هەم

لەگەڵ پێداویستیەکانی سەردەمی نوێشدا هێناویەتیەوە. کە بە بۆچوونی من یەکێك لە گەورەترین گرفتەکانی سەردەمی نوێ بریتیە لەوەی کە ناتوانێت دژەکانی خۆی لەنێو خۆیدا جێبکاتەوە، ناتوانێت جێی ئەو کەسانە بکاتەوە کە ئینکاری مۆدێرنە دەکەن و رازی نابن بەسەردەمی نوێ جگە لەوەی بەکپکردنەوەیان نەبێت و لەناوبردنیان نەبێت.

ئێستا ئێمە دەزانین کە فیکری قاعیدە یاخود ئەوجۆرە باڵە توندڕەوانە یان بڵێین ئەو تیرۆرستانە بە زاراوەی ئەمڕۆ، فیکرێکە ناتوانێت لەگەڵ سەردەمی نوێدا بژی، بەلام ئەوە هەر ئەوان نین کە ناتوانن لەگەڵ سەردەمی نوێدا بژین، بەڵکە سەردەمی نوێش ناتوانێت لەگەڵ ئەواندا بژی، کە ئەمە قسەیەکە پێویستی بە روونکردنەوەی زیاتر هەیە. بۆ نموونە یاخی بوونی بزوتنەوەکانی گەنج و لاوان لە رۆژئاوادا سەیر بکەین، وەکو یاخی بوونی (هیپی)یەکان و ئەو یاخیبوونانەی گەنجەکانی رۆژئاوا لە پەنجاکان و شەستەکاندا کردوویانە، کە بە بۆچوونی (شاهۆ سەعید) یەکێکە لەو رۆشنبیرە کوردانەی باش ئەم بابەتەی هێناوەتە نێو رۆشنبیری کوردیەوە کە لە دوایین ژمارەی گۆڤاری (رەهەند)دا باسی لێوە کردووە، واتە ئەو گەنجانەی یاخین لە هەموو شتێك، هەر کەسێکیان بینیوە رووتیان کردۆتەوە، هەر دوکانێکیان دیوە وێرانیان کردووە، یاخیبوونی خۆیان لە کۆمەڵگە بەشێوازی جۆراوجۆر پیشانداوە، بەشێوازی جلوبەرگیان، بە قەنافیزەکانیان و قژ رەنگاورەنگەکانیان، کە ئەمانە تازە دێتە نێو ولاتی ئێمەوە، لەوێ رەمزی یاخیبوونە بەو شتانە هەرچەندە لای ئێمەوە رەمزی مۆدێرنە بوونە! کە لە رۆژئاوا هەزاران نموونەی لەو جۆرە هەیە بەلام مۆدێرنە لەوێ ئامراز و میکانیزمەکانی قبوولکردن و جێکردنەوەی ئەمانەی پێیە، لەکاتێکدا ئەوان زۆر یاخیترن لەوانەی رۆژهەلات، بەلام سەردەمی نوێ ئامرازەکانی جێکردنەوەی ئەم مزرە ئایینیە توندڕەوەی پێ نیە!... لێرەوە کەواتە کێشەکە دوو سەرەیە، هەم ئەوان لەگەڵ سەردەمی نوێ ناگونجێن، هەم مۆدێرنەش ئامرازەکانی ئەوانی پێ نیە.

ناصری سوبحانی لە کاسێتەکانی باسی (قیتال)دا باش توانیویەتی تیۆرایزەی ئەم بابەتە بکات بەبێ گۆڕانی تەفسیر، هەر بە قورئان لە تەفسیرکردنی سورەتی (محمد) و هەروەها لە تەفسیری ئایەتی جیهاد لە سوورەتی (الحج)دا، واتە توانیویەتی هەم تیۆرایزەکردنێکی پێشتری فیقهیانەی باش بکات هەمیش لەگەڵ

سەردەمی نوێشدا بگونجێت، لە هەمان کاتیشدا ئەو قەیرانە قووڵەی کە فیکری ئایینی و بزوتنەوە ئایینیەکانی تێکەوتوە بەتایبەتی لە کۆتایی هەشتاکان و سەرەتای نەوەدەکاندا لە کوردستان، کە زۆرێك لە گەنجەکانی لە مەترسی ئەو فیکرە و تیاچوونیان رزگار کرد و دەتوانم بڵێم ئەمە بوو بە بناغەی فیکری باڵی ئیسلامی بێ میلیشیا و مەدەنی بۆ دروست بوونیان{٥١}، کە ئەمەش دووبارە مامەڵکردنێکی فیقهیە. کەواتە دەتوانین بڵێین مامۆستا ناصر کەسێك بووە زۆرتر ئەو لایەنەی ئایینی گرتۆتە خۆی کە من بە زاراوەی (فەقیە بوون) لێکم داوەتەوە، فیقهیش بەو مانایەی کە تەنها ئەحکامی خەمسە نیە، حەلاڵ و حەرام و سوننەت و موباح و مەکروە، بەڵکو بەمانایەکی فراوانترە واتە هەموو زانستە کردەییەکان، هەموو ئەوانەی دەچنە لایەنی کردەیی مرۆڤەوە کە لە سیاسەتەوە دەیگێڕێتەوە هەتا ئیشە قەلبیەکان. لێرەوە دەبینیت زۆربەی بۆچوونەکانی سوبحانی لەنێو ئەمانەدا کۆدەبێتەوە، هەرچەندە چرکەساتی فەلسەفی و عیرفانی لای ئەو بوونیان هەیە بەلام دەتوانین بڵێین تەنانەت ئەو چرکەساتە فەلسەفی و عیرفانیانەش کە باسیان دەکات لە خزمەتی دیدە کردەییە فیقهیەکەی خۆیدایە. بۆ نموونە لە باسی ﴿اسماءالله الحسنی﴾دا باسی حاڵ و چرکەساتی دەروونی و مەقاماتی ئەهلی تەسوف و عیرفان دەکات، هەست دەکەیت لێرەشدا دووبارە تەوزیفکردنەوەیەکی ئەو بابەتانەیە بۆ بابەتە کردەییەکان{٥٢}. لێرەوە کورتەی قسە ئەوەیە مامۆستا ناصری سوبحانی فەقیهێك بووە بەتەواوی مانا، ئەم بۆچوونە فەقیهانەشە کە دەکرێت زۆرتر بۆشاییەکانی سەردەمی مۆدێرنەی پێ پڕ بکرێتەوە یان بە واتایەکی دیکە مۆدێرنە زیاتر لەگەڵ بابەتە فیقهی و کردەیەکاندا دەیکرێت و جێیان دەکاتەوە هەتا چرکەساتە فەلسەفی و چرکە ساتە عیرفانیەکانی سەردەمی پێش مۆدێرنە.

هەست دەکەیت لێرە و لەوێ لەو گۆڕان و قەیرانە کۆمەڵایەتی و نێونەتەوەییانەی کە لە سەردەمی نوێدا هەیە، بۆچوونە فیقهیەکان یان کۆمەڵە فیقهیەکان زیاتر دەتوانن جێگای خۆیان بکەنەوە هەتاوەکو لایەنە عیرفانیەکان و هەروەها فەلسەفیەکانیش.

هەست دەکەیت فەلسەفەی میتافیزیك کە فەلسەفەیەکی پێش سەردەمی مۆدێرنەیە کەمتر بەرگریکاری هەیە و کەمتر باسی لێوە دەکرێت، هەرچەندە باڵێکی فیکری لە ئەورووپادا دەرکەوتووە کە بەرامبەر مۆدێرنە بوونەتەوە ئەگەرچی خۆیان پۆست مۆدێرن نین واتە لەسەردەمی نوێ خۆیەوە رەخنەی مۆدێرنە ناکەن بەڵکو لە

کلتوری پێش مۆدێرنە و لە نەریتەوە ئەو کارە دەکەن کە ئەمە گەیشتۆتە ولاتی خۆشمان{٥٣}، بەلام هەست دەکەیت هێشتا فەلسەفەی میتافیزیك، فەلسەفەی پێش سەردەمی مۆدێرنە ئەو توانا و ئامادەیەی نیە، واتە ئەو بەشەی ئایین کە پەیوەندی بەفەلسەفەوە هەیە ناتوانێت ئەوەندەی بەشە فیقهیەکە ئامادەیی ببێت. ئەمە لەلایەك، لە لایەکی دیکەوە تەنانەت بەشە فیقهیەکە زیاتر دەتوانێت لە بەشە عیرفانیەکە بوونی ببێت چونکە چەندین جار و لە شوێنی دیکەدا باسمان کردووە کە سەردەمی مۆدێرنە سەردەمی عاریف بوون نیە. بەلکو سەردەمی تینوویەتیە بە عیرفان، سەردەمی تینوو بوونە بە ئەزموونە رۆحیەکان، کە رەنگە گەورەترین ئەزموونێك لەسەردەمی مۆدێرنەدا ببێت خودی ئەو تینوویەتیە بێت نە ئەوەی ئەزموونی رۆحی دروست ببێت و ئەو ئەزموونە رۆحیانەش کە دروست دەبن زۆر کەم تەمەنن، زۆر کالن، ناتوانن ئەو ئەزموونە گەورەیە بن کە شۆکەیەکی گەورە لەسەردەمی مۆدێرنەدا دروست بکەن{٥٤}، بەلام بەپێچەوانەوە دەکرێت بلێین ئامادەیی لایەنی کردەیی ئایین -لایەنی شەریعەتی و فیقهی ئایین- زۆرترە، بۆ نموونە لە تایبەتمەندترین برگەکانی مۆدێرنەدا ئامادەیی هەیە وەکو لە سیستەمی بانکدا دەبینیت فەتوا هەیە، هەروەها لە بابەتی چوونە سەر مانگ و تەنانەت لە بابەتی فۆتۆکوپیکردنی مرۆڤدا ئایینەکان فەتوایان هەیە، تەنانەت بەرامبەر ماف مرۆڤ فەتوایان هەیە!... ئەمەش پیشاندەری ئەو راستیەیە کە فیقه زۆرتر ئامادەیی هەیە لەسەردەمی نوێدا.

سوبحانیش زۆرتر ئەو بوارەی هەلبژاردووە بۆ مامەلەکردنی لەگەل ئایین لەم سەردەمەدا، وەك پێشتریش ئاماژەم پێدا سوبحانی جیا لە فەقیهەکانی دیکە توانی دوو شت بکات : ئیمکانیاتەکانی فیقهی نەریتی پیشاندا و هەروەها سەلماندیشی کە ئەو داهێنانانە وەلامگۆ و پرکەرەوەی پرسیار و بۆشاییەکانی سەردەمی مۆدێرنەن. کە لە فەتواکانیدا دەتوانیت زۆرێك لەو تایبەتمەندیانەی ناصری سوبحانی هەست پێبکەیت، کە یەکێك لە گەورەترین تایبەتمەندیەکانی بریتیە لەوەی کە فەتواکانی فەتوای سیستەماتیزە کراون، جیهان بینیەك دادەرێژێت و بەپێی ئەو جیهان بینیە فەتواکانی دادەرێژێت دەتوانین بلێین ئەمە یەکەم تایبەتمەندی فەتوای سوبحانیە.

دووەمین تایبەتمەندی فەتواکانی سوبحانی بریتیە لەوەی کە فەتوای عام و خاصی هەیە، فەتوایەك نیە بۆ هەموو تاکەکانی نێو کۆمەلگە وەکو لای فەقیهەکانی

دیکە دەبینرێت. فەتوا هەیە تایبەتە بە ئەهلی روخسەت و هەشە تایبەتە بە ئەهلی عەزیمەت. کە بۆ هەمووشیان باش ئیستیدلالی کردووە کە دەشێت بووترێت باشترین وەسفێك بۆ سوبحانی ئەوەیە ناوی بنێین (فەقیهێکی بەڵگەدار —الفقیە المستدل) کە ئیستیدلالی قورئانی زۆرباش دەکات بۆ بابەتەکانی، بەلأم فەتواکانی جیاوازن، بۆ نموونە ئەو فەتوایەی بۆ کەسێکە دەیەوێت نوێگەری ئایینی بکات جیاوازە لە فەتوای کەسانیی دیکە، یان ئەو فەتوایانەی تایبەتن بە ئەهلی عەزیمەتەوە جیاوازن لەو فەتوایانەی تایبەتن بە ئەهلی روخسەت، دیارە کاتی خۆیشی لای فەقیهە کۆنەکان و لای فەقیهە تازەکانیش ئەم مامەڵەیە هەبووە کە فەتواکانیان جیاواز بووە بەلأم نەگەیشتووەتە ئاستی حەلاڵ و حەرام! بۆ نموونە بۆ ئەهلی عەزیمەت وا باش بوو بەوجۆرە بێت بەلأم خۆی بخاتە شوێنی ئەهلی روخسەت گوناهی ناگات{٥٦} بەلأم لە فەتواکانی سوبحانیدا بەو جۆرە نیە، بەڵکو ئەو فەتوایانەی تایبەتن بە ئەهلی عەزیمەت هی ئەوانن و بۆیان نیە لێی بێنە خوارەوە، بۆ نموونە وەك ئەو فەتوایەی کە ئەهلی عەزیمەت بۆیان نیە بەشداری بکەن لە سوپای ستەمکاردا، یان ئەگەر مەرجەکانی نوێژی هەینی نەهاتبنە دی بۆی نیە بەشداری نوێژی هەینی بکات، یان بە زاراوەی خۆی ئەو بانگخوازەی کە قیام دەکات فەتوای تایبەتی بۆ هەیە و لەگەڵ ئەمانەش دەبێت لە شتە موباحەکاندا زێتر لە ئەهلی روخسەت خۆی بگرێتەوە، بۆ نموونە ئەو دەیسەلمێنێت کە بوونی پەیکەر و تابلۆ و ....هتد، شتێکی حەلاڵە لەنێو ماڵدا و بە حوکمی ئەوەی رێسا گشتیەکەی شەریعەتی پێغەمبەری خودا (د.خ) لەگەڵ رێسا گشتیەکانی شەریعەتەکانی پێش حەزرەت وەکو یەك وان جگە لە چەند شتێکی هەندەکیدا نەبێت کە تایبەتمەندی ئەو زەمەنانەی دیکەیە، بۆیە بەپشت بەستن بەم رێسا گشتیانە لە قورئاندا دەیدۆزێتەوە کە لەبەر ئەوەی بۆ سلێمان پێغەمبەر و...هتد، —درودی خودایان لەسەر بێت— پەیکەر دروستکردن دروست بووە کەواتە بۆ ئێمەش دروستە، ئەمەش بەپێی ئەو ئوسوڵە فیقهەی کە خۆی بۆ خۆی دادەنێت، چونکە ئەو یەکێك لە رێساکانی بریتیە لەوەی کە ئەوەی جائیزە بۆ ئەهلی کیتاب ئەوا جائیزە بۆ ئێمەش، هەر لێرەشدایە پرسیاری ئەوەی لێدەکەن کە لەبەر ئەوەی ئەوان شەراب دەخۆنەوە کەواتە دەبێت بۆ ئێمەش دروست بێت، ئەویش دەفەرموێت نا .... من دەڵێم (ئەهلی کیتاب)! کە ئەصڵ وایە لە نەحو و سەرفدا یاخود لە —علوم الآلة—دا کە هەر حوکمێك بەسترا بە

هەر ئیشتیقاقێکەوە بۆ نموونە بە کیتابەوە ئەوا ئـەو سیفەتانە لەسـەر ئـەو حوکمـە بینا دەکرێت کە پەیوەندی بە ئیشتیقاقەکەوە هەیە واتە بە (کتب)ەوە، لەبەرئەوەی ئەم حوکمەش بەسـتراوە بـە ئـەهلی کیتابـەوە ئـەوا ئـەو حوکمانـە لـەو مەسـەلەیەدا وەردەگیرێت کە پەیوەندی بە کیتابەکەیانەوە هەیە، واتـە دەبێـت لـە کیتابەکەیانـدا ئەو شتە حەلاڵ بێت، ئـەوەی کـە خۆیـان کردوویانـە لـە کیتابەکـەدا نیـە ئـەوە هـیچ پەیوەندیەکی بە ئێمەوە نیە، ئەوە وەکو موسوڵمانێك وایـە کـە مونحـەریف دەبێـت. لێرەوە دەگاتە ئەو فەتوایەی کە پەیکەرسازی و هەبوونی پەیکـەر و ...هتـد، ئەوانـە گەر بۆ پەرستن نەبێت شتێکی حەلاڵ و دروستە. بـەلاّم لەگـەڵ ئەوەشـدا دەڵێـت لـە ماڵەکەی مندا هەتا ئێستاش پەردەکان سادەن!... هتد، مەبەسـتم ئەوەیـە یـەکێکی دیکە لە تایبەتمەندی فەتواکانی سوبحانی سەرەڕای سیستەماتیزە بوونیـان، بریتیـە لە تایبەتی بوونی فەتواکانی کە فەتوای گشتی هەیە و فەتوای تایبەتی هەیـە{٥٧}. کە ئەمەش شتێکە زۆر گرنگە.

سـێیەمین: تایبەتمەنـدی فـەتواکانی بریتیـە لـەوەی کـە ئـەم فەتوایانـە لـە موجتەهیدێکـەوە سـەریان هەڵـداوە، واتـە دوای لێکۆڵینـەوە و توێژینـەوە لەهـەر بابەتێکدا ئینجا فەتوای خۆی داوە، لـە کاتێکـدا لای هەنـدێك لـە فەقیـە و مـەلاکانی دیکە هەر ئەوەندەێ فەتوایەکیان دەست کـەوت باخۆیـشیان تـەحقیقیان نـەکردبێت یەکسەر فـەتوای پێـدەدەن، بـەلاّم سـوبحانی هـەرگیز وای نـەکردووە. لێـرەوە لـە فەتواکانیدا و بەشێوەیەکی گشتیش لە بابەتەکانیدا دوو شت دەبینین:

یەکەمیان: لەبەر ئەوەی دوای تەحقیق وتوویەتی بۆیـە زۆر بـە دڵنیاییـەوە باسـی دەکات، ئەمە یەکێك لەو تایبەتمەندیانەیەتی کە یەکێك گـوێ لـە سـوبحانی دەگرێـت رەنگە زۆر پێی سەیر بێت{٥٨}!.

دووەمیان: بریتیە لەوە کە ئەگەر تەحقیقی لە بابەتێکدا نـەکردبێت بـەبێ شـەرم دەڵێت هێشتا ئەمەم بۆ روون نەبووەتەوە، واتـە هـەموو شتەکان دەبەستێتەوە بـە لێکۆڵینـەوە و بەدواداچوونەوە کـە ئەمـەش دووبـارە یـەکێك لـە تایبەتمەندیـەکانی فەتوایە لای ناصری سوبحانی{٥٩}.

چوارەم: تایبەتمەندی فەتواکانی سوبحانی بریتیە لە کەمی فەتواکانی، بۆ نموونە کە سـەیری موفتیـەکانی میسر و عەرەبستانی سعودی و...هتـد، دەکـەیت هەسـت دەکەیت فـەتوایان زۆر هەیـە کـە لای هەنـدێکیان دەگاتـە چـەندین بـەرگ لـە کتێبی

فەتواکانیان. لەکاتێکدا فەتواکانی ناصری سوبحانی زۆر سنووردارن، ئەگەرچی تەمەنێکی کەمی بوو بەڵام دەکرا فەتواکانی زۆربن، بۆیە ئەم کردەیەکی بەویست بووە، واتە بەوجۆرە نەبووە کە هەر بە سروشتی وا کەوتبێتەوە کە فەتوای کەم بێت وەکو چۆن عەلی کوڕی ئەبو تالیب -خودای لێ ڕازی بێت- گێڕانەوەی فەرموودەی کەمە. بەڵام فەتواکانی فەتوای جەوهەرین، واتە لە هەناوی سەردەمەوە دێنەرێ، دیارە کە تەمەنی مرۆڤ بەشی تەحقیق ناکات لە هەموو بابەتەکاندا و بەتایبەتیش تەحقیقێکی وردی لەو شێوەیە، هەروەها بەهۆی مەرجەکانی ئیجتیهاد و موجتەهید بوونیشەوە لە سەردەمی نوێدا کە سوبحانی چەندین مەرجی بۆ موجتەهید داناوە -دواتر باسی دەکەین- بۆیە ئەو ویستوویەتی زیاتر تەمەنی خۆی بۆ ئەو شتانە دابنێت کە کرۆکی کێشەی موسوڵمانانە لەسەردەمی نوێدا، بۆ نموونە باسکردنی لە سیستەمی ئابووری و سیستەمی سیاسی کە کەم کەسی دیکە هەیە بەو شێوە سیستەماتیزەکراو و بەو قووڵیە بۆی چوو بێت، کە شتێکی جەوهەرین لە ژیانی موسڵمانانی سەردەمی مۆدێرنەدا، کە دەکرێت سەردەمی نوێ کورت بکرێتەوە بۆ پارە یان ئابووری. بۆیە فەتواکانی هەرچەندە کەم و سنووردارن بەڵام زۆر جەوهەرین، واتە ویستوویەتی دیراسەیەکی قورئانی بۆ کێشە جەوهەریەکانی ئەمڕۆی مرۆڤایەتی بکات. لێرەوە دەتوانین ئەوە بڵێین کە کەسێك بووە بەتەواوی مانا هوشیار بووە بەشەرع و خوێندنەوەی فیقهیانەی خۆی کە نەیویستووە هیچکامیان لە پێناوی ئەوی دیکەدا دابنێت هەروەك زۆرێك لە ڕۆشنبیرانی ئایینی دەکەونە نێو ئەو قەیرانەوە کە یان ئەوەتا زۆر دەبەسترێنەوە بە دەقی ئایینیەوە و بە پێشگریمانەی داخراوی خۆیانەوە دەقە ئایینیەکانیش سنووردار دەکەن، یان ئەوەتا وازی لێدەهێنن و بەڵام بە نەفەسێکی ئایینی دەبنە مۆدێرنیزمێکی نوێ، بەڵام سوبحانی توانیویەتی لەو نێوانەدا خۆی ڕاگیر بکات. کە دەشێت بڵێین ڕۆشنبیرە چونکە هەم پێی لەنێو کلتوردایە و هەمیش دەزانێت ڕووە و کوێ دەبزوێت. ئەمەش بۆ خوێندەوارێکی ساڵانی هەفتا و هەشتاکان ئەمە زۆر زۆر گەورەییە.

هەروەك وتمان لای سوبحانی هەم عیرفان و هەم فەلسەفەش کە تەوزیف دەکرێنەوە لە بابەتەکانیدا لەبەر خاتری بۆچوونە فیقیەکانێتی زیاتر. بۆیە دەبینیت بۆچوونە فەلسەفیەکانی تەقلیدین ئەگەرچی دەکرێت بۆ هێزی ئایینی ئیسلامی هەندێك شتی مەزنیان تێدا بێت، بەڵام بەبۆچوونی من کەمتر داهێنانی مامۆستا ناصر

لە بوارە فەلسەفیەکەدا بوونی هەیە. بۆ نموونە لە زۆربەی بابەتەکانیدا پشت دەبەستێت بە هێز و کردار واتە -بالقوة و بالفعل- بە واتای جوولآنی بەردەوامی توانای ئامادەیی لەهێزدابووی مرۆڤ رووە و کردار، کە ئەم دوو زاراوەیە لای سوبحانی زۆر دووبارە دەبێتەوە، وەکو چۆن زاراوەکانی (تغییر) و (حرکت) لە فیکری فەلسەفی کاک ئەحمەدی موفتیزادەدا زۆر ئامادەیی هەیە، ئەوا بوونی -بالقوة- و بوونی -بالفعل- لای مامۆستا ناصری سوبحانی زۆرتر بوونی هەیە، کە ئەمە لە کلتوری فەلسەفەی یۆنانیەوە بۆ ئێمە بەجێماوە، بەلآم ئەو تەوزیفی کردووەتەوە{٦٠}.

تەنانەت ئەو پۆلبەندیانەی کە لۆژیکیەکان کردوویانە بۆ (خەلق) لە ئاستە جیاوازەکانی ژیان و بووندا کە دەست پێدەکات(مەخلوقات) هەیانە بوونی هەیە و زۆربوونیشی هەیە، هەیە بوون و زۆربوون و جوولەشی هەیە، لە ئاستێکی دیکەدا مەخلوق هەیە کە بوونی هەیە و وەچەخستنەوەشی هەیە و جولەشی هەیە و بەلآم عیلم و ئیرادەی نیە، ئینجا دواجار لە هەموویاندا عیلم و ئیرادەش هەیە. ئەم پۆلبەندیە کە لای لۆژیکیەکان هەیە، مامۆستا ناصر زۆر بەجوانی تەوزیفی کردۆتەوە، بەلآم زیادکردنێکی بۆ نیە چونکە ئەمە هەر بەو شێوەیە لای خەلکی دیکەش بوونی هەیە، بەلآم دەشێت بووترێت تەنها زیادکردنێکی تایبەتی لای سوبحانیەوە بۆ ئەم بابەتانە ئەوەیە توانیوویەتی لە قورئاندا بۆیان بگەرێت! هەر بۆ نموونە ئەو مەخلوقەی بوونی هەیە و زیاد ناکات بریتیە لە (جمادات) ئەوەی بوونی هەیە و زیادیش دەکات بەلآم توانای جمان و جولآنی نیە بریتیە لە جیهانی (رووەك- نباتات) پاشان بوون و زیادکردن و حەرەکەتیش هەیە ئەوە جیهانی ئاژەلە (حیوانات) دواتریش هەموو ئەمانەی هەیە زیاد لەوەش شتێکی دیکەی هەیە( کە بە زاراوەی مەنتیقیەکان پێی دەوترێت (فصل) کە ئەو شتە لە شتێکی دیکە جیا دەکاتەوە) کە بریتیە لە عیلم و ئیرادە بە نیسبەتی مرۆڤەوە کە جیای دەکاتەوە لە گیاندارەکانی دیکە، وەك مەنتیقیەکان دەلێن: (مرۆڤ بریتیە لەو ئاژەلەی کە دەدوێت و قسە دەکات)، واتە مرۆڤ گیاندارێکی گۆیایە. لێرەدا گۆیا بوون فەسلە بۆ مرۆڤ کە جیای دەکاتەوە لە ئەوانی دیکە، گۆیابوونیش هەر لای لۆژیکیەکان خۆیان بریتیە لە عیلم و ئیرادە. ئەم دوو زاراوەیەش لە مرۆڤناسی سوبحانیدا زۆرترین ئامادەییان هەیە، واتە سەنتەربوونی مرۆڤ لای ئەو بەستراوە بەبوونی ئیرادە و زانستەوە، بەو

مانایەی هەموونزیك بوونەوەیەك لای سوبحانی لە مرۆڤی کامڵ بریتیە لەو مرۆڤەی هەم عیلمیشی هەیە و هەمیش ئیرادە، کە دەکرێت بابەتی مرۆڤناسی لای مامۆستا ناصری سوبحانی قسەی زۆرتری لەسەر بکەین. بەڵام ئەوەی لێرەدا مەبەستمە ئەوەیە ئەو چەمك و زاراوە فەلسەفیانەی کە لای سوبحانی هەیە هەمان چەمك و زاراوەکانی فەلسەفەی کلاسیکین، بۆیە تەنها داهێنانێکی ئەو لێرەدا بریتیە لەوەی کە یەکێتیەکی دروستکردووە لە نێوان شەریعەت و ئەو بۆچوونە فەلسەفیانەدا، کە فەیلەسوفەکانی دیکە لەو بوارەدا فەشەلیان هێناوە کە رەنگە ئەمە جەنگی هەزار ساڵەی نێوان فەیلەسوفەکان و شەریعەتناسان بێت، هەروەها ناصری سوبحانی توانیویەتی جارێکی دیکە ئەو چەمکە فەلسەفیانە بۆ تێگەیشتن لە قورئان تەوزیف بکاتەوە. تەنانەت جیهانی بەرزەخ کە گەورەترین قەیرانی فەیلەسوفە ئیسلامیەکان بووە لەو سەردەمەدا، ئایا جەستە جارێکی دیکە زیندوو دەبێتەوە؟ ئایا لە جیهانی بەرزەخدا تەنها رۆحە کە زیندووە یان جەستەشە؟ ئایا مرۆڤ لە جیهانی بەرزەخدا چی بەسەر دێت؟ کە ئەمە بەشێکە لە جیهان بینی مامۆستا ناصر —دواتر دێینە سەر باسکردنی— کە توانیویەتی چارەسەرێکی زۆر ژیرانە بۆ ئەم کێشانە بدۆزێتەوە لە جیهانبینی ئایینی و لە جیهانبینی ئیسلامیشدا.

## تیۆریای مەعریفەی سوبحانی:

هەروەها هەر ئەو پۆلبەندیە جیهانبینیەی دەیکات کە مرۆڤ دابەش دەکات بۆ سێ هێزی پێکەوە بەستراوی جیاواز لە یەکتر کە بریتین لە (بصر) و (فؤاد— قلب) و (سمع)، کە ئەمجۆرە پۆلبەندیە لای زانا و فەیلەسوفەکانی دیکە بە پەرشوبڵاوی بوونی هەیە، بەڵام دووبارە بلیمەتی سوبحانی لەوەدایە کە توانیویەتی بە دیاریکراوی لە زاراوە قورئانیەکانەوە ئەو جیهانە فەلسەفیە بخولقێنێت. ئەو سێ زاراوەیە کە بناغەی مەعریفەی مرۆڤن لای ناصری سوبحانی، بۆیە دەتوانین بڵێین جیهانبینی و تیۆریای مەعریفی —النظرية الابستمولوجية— لەو سێ زاراوەدا کورت دەبێتەوە کە مرۆڤ چۆن مەعریفە کۆدەکاتەوە.

سوبحانی پێی وایە یەکەمین دەروازەیەك کە مرۆڤ لە رێگەیەوە رووبەرووی غەیری خۆی دەبێتەوە چ ئەو غەیرە خودا بێت یان مەخلوقات بێت، چ مرۆڤەکانی دیکەش بن، کە ئەم سێ شتەش دووبارە لە فەلسەفەی کلاسیکدا زۆرترین ئامادەییان هەیە

(خالق و بوون و مرۆڤەکانی دیکە)، (بصر)، یەکەمین ئامرازێکە کە مروڤ بەهۆیەوە رووبەڕووی دەرەوەی ببێتەوە، واتە یەکەم ئامرازی بەدەستهێنانی مەعریفە بریتیە لە (بصر). بەلاّم لێرەدا دەبێت ئاماژە بەوە بدەین کە (بصر) لای سوبحانی جیاوازە لە (عین–چاو) چونکە چاو لای ئاژەڵەکانی دیکەش هەیە، بەلاّم (بصر) بریتیە لەو هێزەی لەنێو مرۆڤدا هەیە و شتەکانی دەرەوەی مرۆڤیش دەبینێت و تەنها بینینی رووت نیە بەڵکو رێسای گشتیش لەو شتانەش دەردەهێنێت کە دەیانبینێت. رەنگە ئەمە بتوانین بڵێین نزیکە لە (ئەزموون)ەوە لەسەردەمی مۆدێرنەدا، چونکە مرۆڤەکان لە سەردەمی نوێدا لە رێگەی ئەزموونەوە رێسای گشتی دەردەهێنن، بۆ نموونە چاو دەبینێت لە بوونی پلەیەکی گەرمی دیاریکراودا قەبارەی تەنێك زیادی کردووە، هەروەها تەنێ دیکەش دەبینێت لەمەشەوە دەگاتە ئەو دەرەنجامەی کە تەنەکان بە گەرما دەکشێن. بەلاّم (بصر) هەر بەوەوە ناوەستێتەوە رێسا گشتیەکە دەربهێنێت بەڵکو سیستەمی نێوان رێسا گشتیەکانیش دەدۆزێتەوە، واتە لەنێوان هەر کۆمەڵە رێسایەك لە بووندا دەتوانێت سیستەمێك پێك بهێنێت، بەو مانایەی وەك دکتۆر سروش دەڵێت بۆی دەربکەوێت ئەم بوونە ئەندازەیەکی تێدایە و ئەندازیارێکی هەیە.

ئەم بوونە شتێکی پرشوبلاّو نیە بەڵکو بینایەکە یان پێشانگایەکە وەکو سەعید نوورسی دەڵێت، تابلۆی جوان و نەخشین لە هەموو شوێنێکەوە تێیدا رازاوەتەوە. هێزی (بصر) دەتوانێت هەست بەمانە بکات بەلاّم ئەم هێزە ئیشی هەتا ئێرەیە و ناتوانێت بگاتە پشتی ئەو سیستەمانەوە، واتە ئەم بوونە کەشف دەکات بەلاّم نازانێت لەپشتی ئەم بوونەوە چیە! ئەوە بەهێزێکی دیکەیە کە ئەو بوونە کەشف دەکرێت، پێویستی بە دروستبوونی وەرگەڕانێکە(قلب)ێکە لەنێو ئەو سیستەمەدا و دەتوانێت هەنگاوێك بنێت، وەك مەولانا دەڵێت تەنها هەنگاوێکە و تەواو، هەنگاوێك بەسەر سیستەمەکاندا بنێت و بکەوێت بەو دیودا و خاوەنی ئەو بوونەی بۆ کەشف ببێت، ئەویش هێزی (فؤاد)ە، یان هێزی (قلب)ە کە ئەو بازدانە دەکات. ئەم هێزەش هێزێکی مردوو نیە کە تەنها دەرەنجامێکی لۆژیکی وشکی ببێت، بەڵکو هێزێکی زیندووە، تەنها زانست نیە بەڵکو ئیختیاریشی تێدایە.بەڵکو تەنها زانست نیە لەگەڵ بوونی ئیختیاردا بەمانا وشکە ئەخلاقیەکەی کە بتوانێت فلاّن شت بکات یان نەیکات بەڵکو تاسە و شەوقیشی هەیە، تینووە بۆ پشتی ئەو سیستەمە دادەگیرسێت. کە

وشەی (فؤاد) لە (فئد)ەوەیە بەمانای داگیرسان، کە دەشێت بڵێم دۆزینەوەی ریشەی وشەکان و وشەناسی –فیلۆلۆژیا– لای مامۆستا ناصری سوبحانی ئامادەیەکی زۆر گەورەی هەیە کە دەکرێت بووترێت ئەمە یەکێك لە خاڵە بەهێز و هەروەها لاوازەکانی سوبحانیە، کە دواتر زۆرتر قسەی لەسەردەکەم{٦١}.

لێرەوە کەواتە هێزی (فؤاد) هێزێکە موشتاقە بۆ پشتی سیستەمە مادیەکان، هێزێکە (خاوەنی) ئەم بوونە کەشف دەکات، بەهۆی ئەم هێزەوە کە تاسەی بۆ هەیە بەلام هێشتا ناتوانێت بزانێت کێیە و چیە؟. هەست بەبوونی دەکات بەلام نازانێت چیە! لێرەوە هێزی سێیەم دێتەبوون کە ئەویش هێزی (سمع)ە، کە تەنها رێگەیەکە بۆ گەیشتن بەو شتەی لە پشتی مادەوەیە، ئەویش رێگەی وەحیە. من نزیکەی زیاتر لە دووسالٚ خوێندنەوە و بەدواداچوونم کرد لە بواری ئاینەکان و بەراوردی نێوانیان –دراسە مقارنە الادیان– هەستم کرد ئەم سێلیزمە تەنها لە ئاینی ئیسلامدا بەم چەشنە بوونی هەیە! هەم پشت بەستن بە بینین –کە ئەمە دکتۆر عەلی شەریعەتی زۆر باسی کردووە کە دەڵێت تەنها کتێبێکی ئاسمانی کە زۆرترین تەرکیزی لەسەر چاو بێت بریتیە لە قورئان– هەم هێزی (فؤاد)یش کە بەشە مرۆییەکە لێرەدایە، هەم هێزی (سمع)یش. زۆربەی ئاینەکانی دیکە دەڵێن ببیستە نالێن ببینە، بەلام ئاینی ئیسلام دەڵێت: هەم ببیستە، هەم داگیرسە، هەمیش ببینە!.

ئەم سێلیزمەش دەکرێت بڵێین ئامرازەکانی مەعریفەن لای سوبحانی و لە قورئانیشدا تەوزیفی کردونەتەوە. کە بە بڕوای مامۆستا ناصر ریزبەندیەك لەنێوان هەر سێ هێزەکەدا هەیە، واتە یەکەمجار (بصر) دێت ئینجا (فؤاد) و دواتر (سمع)، هەرچەندە لە قورئاندا پێش و دواکەوتنێك هەیە لە نێوانیاندا، کە سوبحانی دەفەرموێت لەو شوێنانەی قورئاندا کە (سمع) پێشکەوتووە ئەوە باس باسی وەحیە ئەگەرنا بونیادی سەرەکی بریتیە لە بوونی (بصر) و(فؤاد) و (سمع) یەك لە دوای یەك، چونکە یەکەمجار چاو دەبینێت ئینجا دلٚ دادەگیرسێت و دواتر مرۆڤ گوێ دەگرێت بەهێزی (سمع). کە دەشێت بڵێین ئەمە لەگەلٚ فەیلەسوفەکانی مەعریفەی ئاینی رۆژئاوادا نزیکیەکی هەیە بەبێ ئەوەی سوبحانی لەو بوارەدا خوێندنەوەی ببێت، بۆ نموونە (جیمس جوێس) دەڵێت: کاتێك هەموو تواناکانی مرۆڤ واتە هێزی (بصر) کۆتایی هات ئینجا هێزی (سمع) دەست پێدەکات، کاتێك هەموو کوچە و کولانەکان گەیشتنە بنبەست ئینجا مرۆڤ بۆ ئاسمان سەر هەلدەبڕێت. هەسیت

دەکەیت نزیکیەك هەیە لە نێوان ئەو بۆچوونەی (ناصری سوبحانی) و ئەو جۆرە بۆچوونانەدا. لێرەشەوە ناکرێت مرۆڤێك (بصر)ی نەبێت ببێتە موخاتەبی ئایین — دەکرێت مرۆڤ چاوی نەبێت بەلام ناکرێت (بصر)ی نەبێت، واتە بە زمانە ئوسولیەکەی قسە بکەین بالغ بوو بێت، نەهەر بالغ بوو بێت بەڵکو دەبێت (حاجە)شی ببێت، کە ئەمە شتێکە سوبحانی زۆر باسی کردووە، بۆ ئەوەی موخاتەب بێت بە گوتاری ئایینی تەنها ئەوەندە بەس نیە ئەو کەسە موکەلەف بێت بەمانا ئوسولیەکەی بەلکو لەگەل بالغ بوونیشیدا دەبێت پێویستی بەو گوتارە هەبێت. کە ئەمەش یەکێك لە داهێنانە ئوسولیە زۆرجوانەکانی مامۆستا ناصرە. واتە دەتوانین بلێین ئەمە میتۆدێکە لە ئوسولی فیقهدا سوبحانی هێناویەتیە ناوەوە. کە لەوە و پێش بە پەرتەوازەیی لای زاناکانی دیکە بووە بەلام ئەوەی کە ببێتە بەشێك لە ئوصولی فیقە سوبحانی کردوویەتی: ئەحکامی ئوسولی فیقە ئەحکامە ئەزەلیەکانی قورئان تەنها بە بالغ بوونی مرۆڤ نابنە تەکلیف بەسەر مرۆڤەوە بەلکو دەبێت حاجەشی بەو ئەحکامانە ببێت، چونکە ئەگەر پێویستی نەبوو بابیشی گرێتەوە و موکەلەفیش بێت ئەوا ئەگەری ئەوە هەیە لەبار بچێت، درەختێك ئەگەر زیاد لە رادەی پێویستی خۆی ئاوت کردە بنەکەی لەبری سوود زیانی بۆ درەختەکە هەیە ! مرۆڤیش با موکەلەف بێت بە حوکمەکان بەلام ئەگەر پێویستی پێی نەبوو ئەوا دەبێت بەبار بەسەریەوە و بەرگەی ناگرێت. بۆیە سوبحانی قەناعەتی وایە تەنانەت زیکرەکانیش بەو شێوەیەن. کە ئەو نموونەیە دەهێنێتەوە بە هاوەڵەکانی پێغەمبەری خودا (د.خ) هی وایان بووە پێغەمبەری خودا ئەمری پێکردووە کە تەسبیحات بکات، هەبووە ئەمری پێکردووە ئیستیغفار بکات، واتە بەپێی پێویستی ئەو مرۆڤە. لێرەوە هەموو حوکمە ئایینیەکان بە بۆچوونی ناصری سوبحانی لەپاڵ سێ مەرجی ئوسولیەکاندا کە بریتین لە بالغ بوون و عاقل بوون و موسلمان بوون، چوارەمێکیش پێویستە کە بریتیە لە بوونی (حاجە). بوونی ئەو چوار مەرجەش پێکەوە مرۆڤ دەکەنە موکەلەف لە حوکمە شەرعیەکان. بۆ نموونە حوکمی جیهاد بە مانای (قیتال) هەر ئەوەندە بەس نیە کە ئەو کەسە (بالغ بێت) و (عاقل بێت) و (موسولمان) بێت، بەلکو دەبێت خۆیشی و کۆمەلگەکەشی پێویستی بەو قیتالە ببێت{٦٢}، ئەمە ئامادەییەکی گەورەی هەیە لە فیقهی ئوسولی ناصری سوبحانیدا. تەنانەت (حاجە)ش تەنها پێویستیەکی رووکەش نیە بەلکو رەنگە پێویستیەك بێت

بچێتە پشتی نەفسیشەوە، تەنانەت لە گفتوگۆیەکیدا لەگەڵ (مەلا ئەحمەد) ناوێکدا دوای ئەوەی کە شتەکانی خۆی بەیان دەکات (ناصری سوبحانی زۆر بلیمەت و لێهاتووە لەبواری لێکۆڵینەوە و گفتوگۆدا و باش ئادابەکانی ئەو بابەتەی لەبەر چاو گرتووە، سوبحانی یەکێك لە گەورەترین شارەزایانی زانستی ئادابی بەحس و مونازەرە بوو) دوایی دەیسەلمێنێت هەر کەسێك بەو شێوەیە بیر نەکاتەوە لە ئایین لایداوە، یەکسەر ئەوەی بەرامبەری ئەمە ئیستیغلال دەکات و دەڵێت دەی من باوەڕم بەوەی تۆ نیە کەواتە من لە ئایین دەرچووم! بۆ ئەوەی دوایی بەخەڵکی بفرۆشێتەوە کە من تەکفیرکراوم لە لایەن سوبحانیەوە! سوبحانی دەفەرموێت: نا.. رەنگە من نەمتوانی بێت تۆ ئامادە بکەم و ببیتە (سامع) بۆ من یان بەیانەکانم لەو ئاستەدا نەبن تۆ دڵنیا بکەن کە ئەمە ئایینە. هەتا ئێستەش پەردەیەك لە نێوان من و تۆدا هەیە کە ناهێڵێت گوێمان لەیەکتری بێت ئەگەرچی بەیەکیشەوە قسە دەکەین{٦٣}! بەکورتی دەیەوێت بڵێت کە هێشتا من نەمتوانیوە حاجەکەی تۆ بدۆزمەوە یان لە بنەڕەتدا تۆ پێویستیت بەوەی من نیە. لەبەر ئەوە ئەو حوکمەی من ناتگرێتەوە، ئەگەرچی لە رووکەشدا ئەو (بالغ و عاقل و موسوڵمان)یش بوو! کەواتە بابەتی حاجە لای سوبحانی بابەتێکی قووڵە، کە دەتوانین بڵێین بوونی هێزەکانی (بصر) و (فؤاد) و (سمع) و بوونی مرۆڤ وەکو هەبوویەکی خاوەن عیلم و ئیختیار و پێویستی (الحاجە)ش بابەتەکانی (مەعریفەتناسی) و (مرۆڤناسی) لای ناصری سوبحانی پێکدەهێنن. دەکرێت بڵێین ئەمە تیۆریای (ئیستیقرائی)یە لە زانستی لۆژێکدا کە شتەکان یەکە یەکە کۆدەکەیتەوە تا رێسای گشتیان لێ دروست دەکەیت، دواتریش لە رێسا گشتیەکانەوە دەگەیتە سیستەمێك، واتە ئەمە بریتیە لە رێگای ئیمبریقی کە بەرامبەر رێگای میتافیزیکە، رێگەی ئیمبریقی لە پارەکانەوە -جزء- دەجوڵێت بۆ گشت -کل-، بەڵام رێگەی میتافیزیك بەپێچەوانەوەیە، رێسا گشتیەکە دەدۆزێتەوە و دەیکاتە بناغە بۆ دەرهێنانی بەشەکان -جزئیات- دەتوانین بڵێین ناصری سوبحانی لە تیۆریای مەعریفەی خۆیدا -الابستمولوجیا- توانی ئیمبریقیا و میتافیزیك پێکەوە کۆ بکاتەوە، کە هەتا ئێستاش گرفتێکی لۆژیکی کۆن و نوێیە، ئەمەش داهێنانێکی دیکەی سوبحانیە لە مەعریفەناسی خۆیدا و کەسێك خوێندنەوەی لەو بوارەدا نەبێت رەنگە دەرکی ئەم بابەتە نەکات. سەردەمی نوێ سەردەمی جوڵانە لە بەشەوە بۆ گشت، بە کورتی ئەزموون و

ئیمبریقیایـە. لەکاتێکـدا سـەردەمی کـۆن لـە (کـل)ەوە دابـەزیوە بـۆ (جـزء)، واتـە میتافیزیك بووە. لێرەشەوە هەموو ئەوانەی باس لە عەقڵیەتی میتافیزیکی دەکەن بە هەڵەدا چوون، چونکە میتافیزیك عەقڵ نیە بەڵکو پرۆگرام و میتۆدیکـە لـە رێگەیـەوە لـە (کـل)ەوە دێیتـەوە بـۆ (جـزء) و بەرامبـەر ئیمبریقیایـە. کـە ناصری سـوبحانی توانیویەتی کۆکردنەوەیەك بکات لە نێوان ئەو دوانەدا، بە بۆچـوونی مـن هیـچکام لـە لۆژیکیەکان نـەیان توانیـووە ئـەوە بکـەن. بـۆ نموونـە کەسێکی وەکـو (محمـد بـاقر الصدر) کە رەنگە گەورەترین لۆژیکیـستی سـەدەی بیـستەم بێـت لـە شارسـتانیەتی ئیـسلامیدا، کتێبێکـی هەیـە بـە تایبـەتی لەسـەر (اسـتقراء)، هـەروەها لـە کتـێبی (فلسفتنا)شدا زۆرباش ئەو بابەتەی روون کردۆتەوە –بێگومان ئاشکرایە شیعەکان لە فەلـسەفەدا زیـرەکن– بـەلام لەگـەڵ ئەوەشـدا (محمـد بـاقر الـصدر) نـەیتوانیوە کۆکردنەوەیەك لە نێوان میتافیزیك و ئیمبریقیادا بکات، وەکو دوو شتی جیا لەیـەکتر دەیانبینێت و دووچاری هـەمان گرفـت بـووە. بـەلام ناصـری سـوبحانی توانیویـەتی بەکۆکردنـەوەیان چارەی ئـەو گرفتـە بکـات. بـۆ نموونـە لای سـوبحانی جـولان لـە (بصر)ەوە بەرەو (فؤاد) بریتیە لە ئیمبریقیا چوونە لـە (جـزء)ەوە بـۆ (کـل)، بـەلام ئەم ئیمبریقیایە دەکاتـە بناغەیـەك هـەتا رێـسای گـشتی تێـدا تـەوزیف بکـات. واتـە بانگەشەی ناصری سوبحانی لەو بوارەدا بریتیە لەوەی کە بەهۆی ئیمبریقیا –بصر– ەوە رێسای گشتی کەشف دەکات بەلام ئەمە تا ئەو کاتەی دەگاتە لوتکـەی کـەماڵی خـۆی ئـیتر دوای ئـەوە ئیمبریقیـا یـان ئـەزموون بـەردەوام نیـە وەکـو ئـەوەی ئەزموونیـەکان دەڵـێن بـەڵکو هـەتا کەشـفکردنی رێـسا گـشتیەکەیە و گەیـشتنە لـە (جزء)ەوە بە (کل)، ئـیتر لێـرەوە دەتوانیـت ریسا گشتیەکە بکەیتـە بنەمایـەك بـۆ (جزء)ێك هێـشتا ئەزموونیـشت نـەکردووە. بەمەیـە کـە توانیوویـەتی هـەم ئیمبریقیا تەوزیف بکات هەمیش بیکاتـە بناغەیـەکی میتـافیزیکی بۆ ئـەو شـتانەی کـە هێـشتا کەشف نەکراون. واتە لە رێگەی (بصر)ەوە رێسا گشتیەکان دێـن. بـەکورتی بـەهۆی ئیمبریقیاوە –رێگەی حسی و ئیستیقرائی– دێـت رێـسا گـشتیەکە کەشـف دەکـات، بەلام کەشفکردنە بەردەوام تا دوا ماددە ناجوڵێت و بەردەوام هەر مژوڵی کەشفکردن بێت بەڵکو کە گەیشتە خاڵێك دەرکـەوت بـایی ئەوەندەیـە رێـساکەی پـێ بدۆزێتـەوە ئیتر دەبێتە بناغەیەکی گـشتی وتـا رادەی ئـەوەی جوزئیاتـەکان شـاهید بـن بەسـەر رێسا گشتیەکەوە.

بۆ نموونە لە دیراسەکردنی قورئاندا بۆی دەردەکەوێت کە مرۆڤ خەلیفەی خودایە لەسەر زەوی، کە یەکێکە لە بۆچوونە خیلافیەکان بەوەی ئایا مرۆڤ خەلیفەی فریشتە و جنۆکەیە یان خەلیفەی خودایە؟!... قسەی زۆری لەسەر کراوە، بەڵام سوبحانی ئەوە دەسەلمێنێت کە مرۆڤ خەلیفەی خودایە لەسەر زەویدا، لێرەوە سوبحانی بە دیراسەی ئیستیقرائی و (سمع)یشەوە دەگاتە ئەو دەرەنجامەی کە خودا هەرچی پێویست بێت بۆ ئەم خەلافەتە بەم مرۆڤەی بەخشیوە، هەرچیەکیش رێگر بێت لە رێی ئەو خەلافەتەدا ئەوا خودا ئەو توانایەی بە مرۆڤ داوە لەسەر رێگەی خۆی لایبەرێت.

جا لێرەوە دوای ئەوەی کە سوبحانی ئەم رێسایەی بۆ دەرکەوت، دەفەرموێت ئەمەشە مانای (الرحمن الرحیم)- یەکێکیش لەو شتانەی کە زیان بە مرۆڤ دەگەیەنێت و دەبێتە رێگر لەبەردەم جێبەجێکردنی خەلافەتەکەی یاخود ئەو ئەمانەتەی پێی سپێردراوە بریتیە لە نەخۆشی، بۆیە ئەو دەڵێت من قەناعەتم وایە هیچ نەخۆشیەك نیە لە مرۆڤدا چارەسەر نەکرێت ئەگەرچی هەموو پزیشکەکانی دونیاش لەسەر ئەوە کۆك بن کە چارە ناکرێت. ئەوا من بەو رێسایەی خۆم دەتوانم پێچەوانەی ئەوە بسەلمێنم کە نەخۆشیەك ببێت هەتا قیامەت چارەنەکرێت! بۆیە دەفەرمووێت-من لەو سەرەوە دێمەوە، ئەوان لەم سەرەوە دەڕۆن، لە رێگە ئیستیقرائیەکەوە، یەکە یەکە نەخۆشیەکان دەبینن، بەڵام بەو رێسا گشتیە ئەو سەرم لێگرتووە کە هیچ نەخۆشیەك نیە بەبێ چارەسەر! {٦٤}، سەیر دەکەیت لێرەدا رێگە میتافیزیکیەکە تەوزیف دەکات. لێرەشەوە دەتوانین بڵێین سەرەڕای ئەو سێ هێزەی دیکە لە مەعریفەتناسی سوبحانیدا -لای خەڵکی دیکەش باس کراوە و بابەتی لەسەر نووسراوە- بەڵام چوارەمێکیش هەیە کە بۆیان کەشف نەکراوە ئەویش بریتیە لە میتافیزیك و بەمەش جیهانبینی ئەو پیاوە بە تەواوەتی کامڵ دەبێت.

## مرۆڤناسی لای ناصری سوبحانی:

یەکێکی دیکە لە بابەتە قووڵەکان لای ناصری سوبحانی بریتیە لە مرۆڤناسی ئەو، بە بۆچوونی من ئەمەش یەکێك لەو تێگەیشتنە قووڵانەیە کە سوبحانی لە

کلتوری ئیسلامیدا کەشفی کردووە، دەتوانم بڵێم کە توانیویەتی بەهۆیەوە سەردەمی نوێش بخوێنێتەوە.

ئەو دوالیزمەی کە لای ناصری سوبحانی هەیە بریتیە لە خەلق و ئەمر کە هەم لەباسی سیستەمی سیاسی و سیستەمی ئابووری و هەم لە مرۆڤناسیەکەیدا و هەروەها لە بابەتی (علوم الحدیث)دا کە ناردوویەتی بۆ زاناکانی کەنداو کاتێك ویستوویانە ئەنسکلۆپیدیای زانستی فەرموودە دابنێن، لە تەفسیرەکانیدا و لە زۆربەی بابەتەکانیدا دیکەیدا تەوزیفی کردوونەتەوە، کە بریتیە لە زانست و ئیرادە و ئەوانیش دەچنە ناو بابی خەلق و ئەمرەوە، سوبحانی دەفەرمووێت هەموو شتێك کە خودای گەورە دروستی کردووە دوو لایەنی هەیە، لایەنی دروستبوونی ئەو شتە واتە خەلق بوونی، لەگەڵ ئەو ئەرکەی کە ئەو مەخلوقە هەیەتی، کە ئەو باوەڕی وایە هەموو شتێك لەم بوونەدا وەزیفەی خۆی هەیە و دەبێت هێندەی ئەرکەکەی خۆیشی چاوەڕوانیمان لێی هەبێت. واتە لای ئەو مانای ئایەتی ﴿...ألآ لـه الخلـق و الأمر...﴾{٦٥} بریتیە لەوەی کە هەر هەبوویەك لەم بوونەدا لەهەمان ئەو کاتەی کە خەلق کراوە ئەمرێکیشی پێدراوە، بەو مانایەی کە هەر مەخلوقێك ئەرکێکیشی هەیە. جا هەموو شتەکان هەر لە سەرەتاوە تا دەگاتە دروستبوونی مرۆڤ –کە لە کاسێتەکانی باسی سیستەمی سیاسیدا بەجوانی ئەم تیۆریایەی شیکردووەتەوە و هەروەها لە شوێنەکانی دیکە و لە (المفاهیم) دا {٦٦} کە بۆ خوێندکارانی نووسیوە لەسەری بخوێنن بەهەمان شێوە باس دەکات یان هەردوو چەمکی (استعداد بالقوة) و (استعداد بالفعل)یش بەهەمان شێوە دەکرێت بووترێت نزیکە لەم بۆچوونەوە.

لەوێوە کە باسی ئەوە دەکات سەرەتا ئەو دەمەی ئەم بوونە شتێك بووە لە شێوەی دوکەڵدا و پاشان ئەو قۆناغانەی دیکەی بوونی تەیکردووە، هەر شتێك لەم قۆناغانەی بووندا لەگەڵ بوونەکەیدا ئەرکێکیشی هەبووە، بۆ نموونە دوکەڵ لەگەڵ ئەوەدا کە وەکو دوکەڵێك بوونی بووە لە هەمان کاتدا ئەمرێکیشی هەبووە بریتی بووە لەوەی بگۆڕێت بۆ سەر قۆناغی دواتری بوون و ببێتە مادده. پاشانیش کە بووەتە بارستاییەك و ئەمیش خەلقی بووە بەو سیفەتانەوە کە هەیبووە، ئەرکێکیشی بووە کە بریتی بووە لەو توانایەی بۆ تەقینەوە بوویەتی بۆ دروستکردنی زەوی و بەشەکانی دیکەی بوون. دوای ئەوەی کە زەوی دروست بووە دووبارە ئەویش خەلقی هەیە وەکو بوونی زەوی، هەروەها ئەرکیشی هەیە کە بریتیە

لەو توانایانەی لە زەویدا هەیە بۆ پەرستش و ئاوەدانکردنەوە. دەبینیت هەتا دەگاتە مرۆڤ هەر یەکە لە شتەکانی ناوبوون هەم خەلقەکەی لە لایەن خوداوە بووە -جل جلاله- هەم ئەرکەکەشی لە لایەن خوداوە بووە. بەلام کە دەگاتە زەوی هەست دەکەیت خودای گەورە زەوی دروستکردووە وەکو خەلق بەلام ئەمری ئەم زەویە کە بریتیە لە عیمارەت و عیبادەت لێرەدا خودا -جل جلالە- وازی لێهێناوە و داوێتیە دەست خەلیفەیەك{٦٧}.

لێرەدایە گفتوگۆی نێوان خودا و فریشتەکان دەست پێدەکات ﴿و اذقال ربك للملئکة انی جاعل في الارض خلیفة قالوا أتجعل فیها من یفسد فیها و یفسك الدماء و نحن نسبح بحمدك و نقدس لك قال انی أعلم مالا تعلمون﴾ (البقرة/٣٠) کەواتە لێرەدایە مامۆستا ناصری سوبحانی دەفەرمووێت مرۆڤ خەلیفەی خودایە، واتە ئەو ئەرکەی لە شتەکانی دیکەی بووندا خودا خۆی جێبەجێی دەکرد لەگەڵ دروستبوونی زەویدا دایە دەستی مرۆڤ وەکو خەلیفەی خۆی لە زەویدا. بەمەش سوبحانی دەیسەلمێنێت کە مرۆڤ خەلیفەی فریشتە و جنۆکان نیە، بەڵکو خەلیفەی خودایە لەسەر زەویدا. لێرەوە دروستبوونی مرۆڤیش هاوکاتە لەگەڵ بوونی ئەرکێکدا کە ئەویش ئەمری پەرستشکردنی بۆ خودای گەورە و ئاوەدانکردنەوەی زەویە، واتە ئەمری زەویشی درایە دەست! لێرەشەوە هیومانیزم و گەورەیی مرۆڤناسی ناصری سوبحانی دەست پێدەکات کە مرۆڤ لە چ مەقامێکی مەزندا دەبینێت، ئەمرێك کە لەوەو پێش ئەنجامی دەدات. لێرە بەدواوە دەبێت مرۆڤ ئەنجامی بدات! لێرەشدایە کە ئەم مرۆڤە پێویستی بە دوو شت هەیە، پێویستی بە زانست هەیە کە کارەکەی بزانێت، پێویستی بە ئیرادە هەیە بۆ ئەوەی ئازاد بێت لەوەیدا کە دەیکات یان نایکات. بەلام فریشتەکان تەنها عیلمەکەیان هەبووە ئەویش بەو ئاستە قووڵەی لای مرۆڤ نا ﴿...و علم آدم الاسماء کلها...﴾ بۆیە دەرکی ئەم بابەتە ناکەن هەرچەندە قەناعەتێکی تەواویان بە بڕیارەکەی پەروەردگار بووە چونکە خۆیان نەیانتوانیووە ئەزموونی ئەوە بکەن کە لای مرۆڤ هەیە و لەو بابەتە تێنەگەیشتوون، بۆیە مرۆڤ بۆ ئەوەی بتوانێت ئەم ئەمری خەلافەتە جێبەجێ بکات دووشتی پێبەخشراوە کە بریتین لە (زانین-علم) توانای ناولێنان یاخود (بارت) گووتەنی توانای رەمزاندن، یان دەتوانین بڵێین بوونی (زمان-لغة-language)یە لای مرۆڤ. هەروەها (ئیرادە)ش کە بتوانێت شتێك بکات یاخود نەیکات ﴿و هدیناه النجدین﴾ لێرەوە هەست دەکەیت

ئەم دوالیزمە لە بۆچوونەکانی مامۆستا ناصردا زۆر ئامادەیی و حزوری هەیە، بۆ هەموو شتێك تەنها بوون عیلم بەو شتە بەس نیە بەڵکو دەبێت بەشی ئیختیاریشی تێدا بێت، واتە لە هەموو زانستێکدا بوونی خودی زانستەکە بەتەنها بەس نیە بەڵکو بەکارهێنانی خودی زانستەکەش گرنگە، بۆ نموونە ئەو دەڵێت بۆ بەرگدروویەك تەنها ئەوەندە بەس نیە شارەزایی لە کارەکەیدا هەبێت بەڵکو دەبێت دەست پاکیش بێت لە کارەکەیدا و قوماش و پارچەی موشتەریەکانی نەدزێت{٦٨}.

ئەمە ئەو دوالیزمەیە کە سوبحانی لە تەفسیری قورئاندا زۆر تەوزیفی دەکات. کە ئەمە بناغەیەکی لۆژیکی دەرەوە ئایینیشی هەیە چونکە فۆکۆیاما لە کتێبی (دوایین مرۆڤ–the last man)دا تەنها لایەنی عیلمی مرۆڤ باس دەکات، –باسی بازاری ئازاد و دیموکراسی دەکات. بەڵام لە کتێبی (قەیرانی متمانە–trust)دا لایەنی ئیختیاری مرۆڤی باس کردووە، کە دەتوانین بڵێین یەکەمی ئەم دوالیزمەیە کار لەسەر ئیرادەی مرۆڤ ناکات بەڵکو بکوژی ئیرادەی مرۆڤە. ئیختیار بۆ مرۆڤەکە ناهێڵێتەوە، تەنانەت کە لە یاسا دەرباز دەبین دەماندەنە دەست راگەیاندن کە راگەیاندن حەزەکانم بۆ دیاری دەکات لە رێی کەناڵەکانی تیڤی و ئەنتەرنێتەوە، بۆیە دەتوانین بڵێین مۆدێرنە سەردەمی کوشتنی ئیرادە و ئیختیاری مرۆڤە ئەگەرچی پێچەوانەی ئەوە بانگەشەی بۆ دەکرێت. ئەو هەموو رێکخراو و بزوتنەوانەش کە لەسەر مافەکانی مرۆڤ قسە دەکەن مانای ئەوەیە کە هێشتا مرۆڤ و مافەکانی مرۆڤ بوونیان نیە بۆیە ئەوەندە بە جیددی و شێلگیرانە گرنگ گیراوە کە ببێت، واتە ئیختیاری نیە، مرۆڤ بەدەستی خۆی نیە چۆن پۆشاکێك بکاتە بەری، تەنانەت جۆری خواردنەکەشی بەدەست خۆی نیە...هتد، هەموو شتەکانمان بۆ دیاریکراوە.

بۆیە ئەم سەردەمە ئەگەر نەڵێین سەردەمی کوشتنی مرۆڤە ئەوا لانی کەم ئیرادەی لە مرۆڤ سەندۆتەوە. لە کاتێکدا زانستە کۆن و کلاسیکیەکان لەسەر دوالیزمەی (زانست) و (ئیرادە) لای مرۆڤ بە یەکسانی ئیشیان کردووە، بۆ نموونە ئەگەر سەیری زانستەکانی فەرموودە –علوم الحدیث– بکەین ئەوا لەو زانستانەدا ئەو کەسەی کە فەرموودە دەگێڕێتەوە –الراوی– تەنها شارەزابوونی لە گێڕانەوە و ناسینی فەرموودەکاندا بەس نیە، بەڵکو دەبێت متمانەشمان پێی ببێت کە درۆ ناکات لە گێڕانەوەی فەرموودەدا. ئەمە ئەو دوالیزمەیەیە کە مامۆستا ناصر زۆرباش کەشفی کردووە و بەبۆچوونی من باش رۆحی زانستە ئیسلامیەکانی ناسیوە، کە لە

دیدی مرۆڤناسیشەوە بۆ ئەم بابەتە رۆشتووە. دەبینین کاتێك باسی موسا دەکات کە وەسفی ئەو لە قورئاندا بە ﴿قوی أمین﴾ کراوە. سوبحانی دەفەرمووێت ﴿قوی﴾ەکەی پەیوەندی بە شوانیکردنەکەیەوە هەیە کە شارەزابوون و لێهاتووییە لەو کارەدا و ﴿أمین﴾ەکەشی لایەنی ئیختیارەکەیەتی. یاخود کاتێك باسی یوسفی پێغەمبەر دەکات کە (حفیظ علیم)ە، دەفەرمووێت (حفیظ)ەکە پەیوەندی بە شارەزا بوونی لە بەڕێوەبردنی ئابووری و لایەنە زانستیەکەیەوە هەیە. کەواتە لای مامۆستا ناصر مرۆڤ دوو دیوی هەیە تەنها دەرك نیە وەك ئەوەی فەلسەفەی کلاسیکی یۆنانی کۆن مرۆڤ تەنها بۆ دەرك و زانین کورت دەکاتەوە کە هەر بوونی حیکمەت بەسە بۆگرەنتی بوونی هەموو چاکەیەك لای مرۆڤ. سوبحانی دەفەرمووێت: نا... دیوێکی دیکەی هەیە. تەنانەت لە فەلسەفەی کلاسیکی ئیسلامیشدا کاتێك ئەو یەکێتیەك لە نێوان (عاقل) و (مەعقول)دا دروست دەکات هەست دەکەیت حیساب بۆ لایەنی ئیختیاری مرۆڤ ناکات. لێرەوە جیهانبینی مامۆستا ناصر بۆ مرۆڤ تەنها کورت نابێتەوە بۆ دەرك و زانین و یەکبوونی نێوان عاقل و مەعقول بەڵکو حیساب بۆ لایەنی ئیختیار و ئیرادەی مرۆڤیش دەکات، بە مانایەکی دیکە تەنها لایەنی تەوسیفی (prescriptive) نەگرتووە کە کاری مرۆڤ تەنها وەرگرتنی مەعلومات بێت و بەمەش بەردەوام مەعریفەی زیاد بکات، بەڵکو لایەنی تەوسیەیی (normative) بە هەمان شێوە حیسابی بۆ کراوە و لە مرۆڤناسی خۆیدا لایەنی ئیختیاریشی لای مرۆڤ فەرامۆش نەکردووە {٦٩}.

## قەیرانی فیکری ئیسلامی و سوبحانی:

قەیرانێك کە ئەمڕۆ لە فیکری ئیسلامی نوێدا بەدی دەکات بریتیە لەوەی کە نەیتوانیووە بڕواتە نێو کۆمەڵگەوە. ئەمە ئەو خاڵەیە کە ئیسلامیەکان هەستیان پێنەکردوە یان ئەگەر هەستیشیان پێکردبێت نەیانتوانیوە دەست نیشانی بکەن و بەیانی بکەن. بە بەردەوامی پارتە ئیسلامی و بزوتنەوە و رێکخراوە ئیسلامیەکان دروست دەبن بەڵام ناتوانن بچنە نێو کۆمەڵگەوە! ناتوانن هونەر دروست بکەن، ناتوانن ئابووری دروست بکەن، هەروەها ناتوانن سیاسەت دروست بکەن کە خۆیان متمانەی تەواویان بەوە هەیە کە دەتوانن بیکەن، بەڵام ئەو دیوارە نەبینراوە چیە کە رێگە نادات ئەنجامی بدەن؟! بەبۆچوونی من سوبحانیش لەم بابەتەدا لەژێر

کاریگەری فیکری ئیسلامی نوێدایە کە دەشێت بڵێم ئەمە ئەو رەخنەیە کە من هەمە لە بابەتی سیاسی و سیستەمی ئابووری لای ئەو، فیکری ئیسلامی و سوبحانیش لەم بوارەدا دەکرێت بۆ( کۆمەڵە)یەك بشێت بەلام بۆ کۆمەلگە ناشێت. ئێمە ئەگەر لە رووی سۆسیۆلۆژیەوە سەیری کۆمەلگە بکەین دەبینین هەندێك خەصلەت وتایبەتمەندی هەن بۆ کۆمەڵ و هەندێك خەصلەت و تایبەتمەندیش هەن بۆ تاکەکان دەگەرێنەوە. بە حوکمی ئەوەی فیکری ئیسلامی نویَ زۆرتر کاریگەرە بە فیکری ئیشتراکی هەتا فیکری لیبرالی، بۆیە هەست دەکەیت زۆرتر بەلای بابەتە بە کۆمەڵیەکاندا رۆیشتوون هەتا بابەتە تاکیەکان.

هەرچەندە بەبۆچوونی من لیبرالیەت لە فیکری ئایینیدا ئامادەیی هەیە، بەلام لێرەدا ئەوان زیاتر بە لای ژیانی بە کۆمەڵدا رۆیشتون نەك ژیانی کۆمەلگە کە ئەوە دوو شتی جیان لە یەکتر. بۆیە بەبۆچوونی من فیکری ئیسلامی لە ژیانی کۆمەلگە تێنەگەیشتووە بەلام لە ژیانی بەکۆمەڵ باش تێگەیشتووە بەڵکو باشیش تەوزیفی کردووە. واتە ئیسلامیەکان لە مەیدانی رابوونی ئیسلامیدا ژیانی بەکۆمەڵیان هەیە نەك ژیان لە نێو کۆمەلگەدا. ئەمەش هەندێك خەسڵەتی تایبەتی بۆ دروست کردوون یان بڵێین ژیان لەنێو کۆمەڵدا هەندێك تایبەتی دەدات بەو کۆمەڵە، کە ئەو خەصڵەتانەش جیاوازن لەو خەصڵەتانەی لە خودی کۆمەلگەدا هەیە بە مانا فراوانەکەی. هەروەها جیاوازیشن لەو خەصڵەتانەی لە تاکدا هەیە. لەو خەصڵەتانەش بۆ نموونە بۆچوونی شمولی لەنێو کۆمەڵەدا دروست دەبێت و دەکرێت بڵێین فیکر و جیهانبینیەکیان هەیە جۆکەریە بۆ هەموو شتێك دەشێت، سیحرێکە دەتوانێت هەموو شتەکان چارەسەر بکات. کەسەکان لەنێو کۆمەڵەدا کەسانێکی ئەنسکلۆپیدیایین تایبەت نین لە بوارێکی دیاریکراودا و دەتوانن هەموو شتەکان بکەن. هەر بۆیەش ناتوانن لەگەڵ وردبوونەوە و تایبەتمەندیەکانی کۆمەلگەدا بێنەوە و شکافێك لە نێوان ئەوان و کۆمەلگەدا دروست دەبێت.

بێگومان تاکەکان لەنێو کۆمەڵێکدا خەسڵەتی جوانی خۆیانیان بۆ دروست دەبێت بەلام لە هەمان کاتیشدا هەندێك خەصڵەتی دیکە دروست دەبن کە رێگرن لە تێگەیشتنی کۆمەلگە. لێرەشەوەیە کە (مەکئەنتایر) دەڵێت من ژیانی بەکۆمەڵم پێخۆشە بەلام لەسەردەمی نوێدا ژیانی بە کۆمەڵ حەتمەن فاشیەت دروست دەکات!... چونکە ژیانی کۆمەڵە نەك ژیانی کۆمەلگە. بە رای من ئەوانەی لەنێو

کۆمەڵدا دەژین لە شتەکانی کۆمەڵگە تێناگەن، کرانەوەیان نابێت بەسەر کۆمەڵگەدا. بۆ نموونە نازیەکان لە ئەڵمانیادا دەبینیت کە دەکرێت هەموو کۆمەڵگە بکرێتە سەربازگەیەکی گەورە بۆ کۆمەڵەکەی خۆیان، یاخود وەك ئەزموونی بەعس لە ولاتی ئێمەدا! کە نەك هەر رۆحی کۆمەڵگەیان نەناسی بەڵکو کۆمەڵگەیان وێران کرد. لەسەر بناغەی پەژموردەکردنی گوڵەکانی کۆمەڵگەیە گوڵە نایلۆنەکانی خۆیان دادەنێن!.

ئەزموونی حیزبە کوردیەکانیش بە ئیسلامی و عیلمانیەوە دەبینیت کە ژیانی بەکۆمەڵیان هەیە نەك ژیان لەنێو کۆمەڵگەدا، هیچ کەسێکی نێو کۆمەڵ نیە بتوانێت لە خەصڵەتە تایبەتمەندەکانی کۆمەڵگە تێبگات. لێرەوە فیکری نەتەوەیی فیکری کۆمەڵگەیە– نەتەوە کۆمەڵگەیە، نە فیکری کۆمەڵێك بێت لە کۆمەڵگەدا، بۆیە ئەو کەسانەی لەنێو کۆمەڵێکدا دەژین ناتوانن لە فیکری نەتەوەیی تێبگەن بەڵکو بکوژی فیکری نەتەوەیین. بە رای بەندە فاشیەت دروست دەکەن و دەبنە شۆڤینیزم. ئەمەش زیادەڕەوی کردن نیە لە سەر نائیسلامیەکان، بەڵکو حیزبە ئیسلامیەکانیش دەگرێتەوە، واتە هەموویان لە هەناویاندا تۆوی فاشیەتیان هەڵگرتووە. واتە فیکرێکە بۆ کۆمەڵەیە، بەقوربانیکردنی نەتەوە و کۆمەڵگەیە لە پێناوی کۆمەڵەکەیاندا. ناشتوانن لەم بابەتە تێبگەن، هەروەها لە مافە تاکیەکانیش تێناگەن بەو مانایە. دەبینیت لە چەندەها کاسێت و بابەتەکانی سوبحانیدا ئەوەندەی باس لە ژیانی بە کۆمەڵ دەکرێت —من نامەوێت مامۆستا بەوە تاوانبار بکەم بەلاّم دەمەوێت حەقیقەت بڵێم بە حوکمی ئەوەی زۆر تەمەنم لەگەڵ گوێگرتن و خوێندنەوەی بابەتەکانیدا بردۆتەسەر– هێندە باسی تاك ئامادەیی نیە، تەنانەت کۆمەڵگەش ناتوانێت هێندەی کۆمەڵ ئامادەیی ببێت. رەنگە ئەمە یەکێك لەو خاڵە وردانە بێت کە کاك ئەحمەدی موفتیزادە لە قۆناغی دووەمی ژیانیدا دەرکی پێکردبێت کاتێك باسی گفتوگۆکانی خۆی دەکات لەگەڵ چەپەکانی ئێراندا ( کە چ ئەویش و چ سوبحانیش بە حوکمی بلیمەت بوون و عیملاق بوونیان بەرامبەرەکانیان بەزاندووە) بۆیە موفتیزادە دەفەرموێت: بۆم دەرکەوت ئەمە تەنها جەدەل و بەرامبەر بەزاندن بووە نەك ئامانج دروستکردن بێت لەنێو کۆمەڵگەدا، یاخود جێبەجێکردنی ئەرك بێت لەنێو کۆمەڵگەدا. دەبینیت ئەمەی موفتیزادە بازدانێکە لە کۆمەڵەوە بۆ کۆمەڵگە. لەبەر ئەوە نەهەر دیدی سوبحانی بەڵکو دیدی زۆربەی فەقیە و بیریارە ئیسلامیەکانی

سەردەمی نوێ دیدێکی کۆمەڵیانەیە بۆ نەتەوە نە ئەوەی دیدێکی کۆمەڵگەیانە بێت،. واتە بەرگری لە نەتەوە دەکەن، کە مامۆستا ناصر یەکێکە لەو کەسانەی زۆرباش بەرگری لە نەتەوە کردووە تەنانەت لەبەردەم (خومەینی)شدا، بەڵام دواجار ئەمە دیدێك و بەرگریکردنێکی بە کۆمەڵە بۆ نەتەوە نە دیدێکی کۆمەڵگەیی.

ئەمە هیچ لەکەیەکیش نیە بۆ ئەو کە بەو جۆرە بێت، چونکە رۆشنبیری حەفتاکان و هەشتاکان بەوجۆرە بووە، زیاتر رۆشنبیریەکی مارکسی یان دژە مارکسی بووە نە فیکری کۆمەڵگە و نەتەوە.

مارکسیزم فیکری بە کۆمەڵە و بۆ دروستکردنی کۆمەڵگەیەکی سۆشیالیستیە، ئەگەر هەموو کۆمەڵگە لە پێناو دروستکردنی کۆمەڵگەیەکی سۆشیالیستیدا تیا بچێت گرنگ نیە و کێشەیەك نیە لە فیکری مارکسیدا! . کە زۆرتر ئەو قوتابخانە فەلسەفیانەی دەکەونە دوای ئەو قۆناغەوە بۆ کۆمەڵن، بەڵام مامۆستا ناصر بە حوکمی ئەوەی لە کوردستانی ئێران ژیاوە و زیاتر کاریگەر بووە بە رۆشنبیری ئەو کاتەی ئێران و رۆشنبیری ئیسلامی ئەو سەردەمە و هەروەها کاریگەربوونیشی بە هزری کوردی و ...هتد، ئەمانەش رۆشنبیریەکی بەکۆمەڵ بوون نە رۆشنبیری کۆمەڵگە، لەبەر ئەوە باسی ماف تاك زۆر بەکاڵی ئامادەیی هەیە بەتایبەت لە باسی موڵکیەتدا بەڵام ئەوەندە ئاوازە کە دەکرێت بەئاسانی کۆمەڵگەت لێبسێنێتەوە و بیخاتە نێو ژیانی کۆمەڵەوە، موڵکیەتت لێوەربگرێتەوە ﴿...ولا تؤتوا السفهاء اموالكم...﴾ موڵکەکانی ئێوە هی کۆمەڵەن. هەڵبەت من تەفسیرێکی تایبەتم هەیە بۆ ئەو ئایەتە، مامۆستا ناصر یان بیریارانی دیکەی ئیسلامی بەوجۆرە لەو ئایەتە تێگەیشتوون، نە ئەوەی وابزانم ئایەتەکەش وادەڵێت ( کە بە بۆچوونی من ئایەتەکە شتێکی دیکەیە). دواجار شارەزابوونی مامۆستا ناصر لە قوتابخانە فەلسەفیەکانی دواتر وایکردووە زیاتر دیدێکی کۆمەڵیانەی هەبێت بۆ نەتەوە نە دیدێکی کۆمەڵگەیی، کە دوو دیدی جیاوازن لە یەکتری، هەرچەندە هەتا ئێستاش فیکری کوردی- ئیسلامی دیدێکی کۆمەڵیانەی هەیە بۆ نەتەوە (nation)، ئێستا دیدی ئەمریکا دیدێکی کۆمەڵگەییە بۆ نەتەوە، واتە کۆمەڵگە هەر ئەوە نیە لەوە و پێش بووە، خێڵێك یان کۆمەڵێك بن بەیەکەوە بژین بەڵکو شتێکیشە لە داهاتووشدا دروست دەبێت، هەروەها (بۆ نموونە) وانەی (کۆردۆلۆژی) لە زانکۆدا دەخوێنرێت کە بریتیە لە دیدێکی کۆمەڵیانە بۆ نەتەوە نە دیدێکی کۆمەڵگەیی بۆ نەتەوە، واتە کوردبوون

تەنها بریتیە لەوەی کە هەین نە ئەوەی کە دەتوانین ببین. سوبحانی بە زیرەکی و وردبینی خۆی هەستی بەم بابەتە کردبوو، بەردەوام ئیرادەی ئەوەی هەبووە بەرگری لە گەلی کورد بکات وەك نەتەوەکەی خۆی —وەکو پێشتریش ئاماژەم پێدا— ئەو پێی وابوو کە مافەکانی نەتەوە دەکرێت لەنێو فیکری ئاییندا بهێنرێنە دی. کە خۆی ناوی ناوە بەرگریەکی (موسا)یانە لە نەتەوە. بەڵام ناتەواویەك لەم بۆچوونەدا هەیە، لەبەر ئەوەی سوبحانی ئاگاداری قوتابخانە زمانەوانیە نوێکان نەبووە بە باشی، تەنها پشتی بە فیقهی لوغەی کۆن و زانستی زمان ناسی کۆن بەستووە. هەروەها ئاگاداری ئەو مەکتەبە مێژوویانەش نەبووە کە لە دوای هەشتاکانەوە هاتوونەتە نێو رۆشنبیری رۆژهەڵاتەوە. بۆیە بە حوکمی ئەوەی ئەو زیاتر ئاگاداری رۆشنبیری ساڵەکانی حەفتا و سەرەتای هەشتاکانی سەدەی بیستەم بووە و لەو سەردەمەدا ژیاوە، بواری نەبووە ئاگاداری قوتابخانە فەلسەفی و زمانەوانیەکانی سەردەمی نوێ بێت وەکو (چۆمسکی) و (دیسۆسیر) و (مەدرەسەی حەولیات) و...هتد، کە بەهۆی ئەمانەوە هەنگاوێکی هاویشتووە لە کۆمەڵەوە بەرەو کۆمەڵگە، تا لێرەوە کۆمەڵگە باشتر بناسرێت و پێویستیەکانی بدۆزرێنەوە. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا دەتوانم بڵێم کە سوبحانی زیاتر لە فیکرە کۆمەڵیەکانی دیکە نزیکتر بووە لە فیکری نەتەوە یان لە کۆمەڵگەوە.

لە فەلسەفەی زمانی نوێدا زمان تەنها ئامرازێك نیە بەدەست مرۆڤەوە بەکاری بهێنێت بۆ گەیاندنی ماناکانی خۆی بەڵکو زمان جیهانبینی مرۆڤ دەخولقێنێت و مرۆڤ خۆی ئامرازە بەدەست زمانەوە. راستە زمان بابەتێکی ئیعتیباریە و لەسەرەتاوە مرۆڤ خولقاندوویەتی بەڵام دواجار ئەو بابەتە ئیعتیباریە ئەوەندە گەورە بووە مرۆڤی کردۆتە گیرۆدەی دەستی خۆی، بەڵام دەبینیت کە کاتێك مامۆستا ناصر باسی زمان دەکات رێك وەکو ئامرازێك وەسفی دەکات، ئەمە دیدێکی کلاسیکی و کۆنە سەبارەت بە زمان، بۆ نموونە دەڵێت حەقیقەتی شتەکان لە هەموو زمانەکاندا شتێکە، واتە کاتێك کوردێك دەڵێت (کەوچك)، عەرەبێك دەڵێت (ملعقة) و فارسێکیش دەڵێت (قاشق) و ئینگلیزێك دەڵێت (spoon)...هتد، خۆ حەقیقەتی کەوچکەکە لە هەموو زمانەکاندا هەر کەوچکە ! بەڵام تەنها وشەکە جیاوازە، وشەکەش بەهۆی هەواوە (الهواء) دروست دەبێت. لێرەدایە کە سوبحانی بە نەتەوە پەرستەکان دەڵێت :عەیب ناکەن شوێنی هەوا کەوتوون{٧٠}. کاتێك ئەمەم لای مامۆستا ناصر بینی

هەستم کرد دیدی ئەو بەرامبەر بە زمان دیدێکی زۆر کلاسیکیە. ئەمەش وایکردووە لە نەتەوە تێنەگات وەکو حەقیقەتێکی گەورەتر لە کۆمەڵ، هەروەها تیۆریە کلاسیکیەکانی زمان رێگربوون لەبەردەمیدا تا لەوە تێبگات: کە زمان حەقیقەتی نەتەوە و جیهان بینی نەتەوە دروست دەکات. ئاخر ئێمە بێجگە لە زمان چی دیکەمان هەیە! نەتەوە جگە لە زمان شتێکی دیکەی نیە. بۆیە دووبارە دەڵێم ئەمە خەوشێکە لە هزری سوبحانیدا، چونکە هەم دیدی جەماعی بوون و شمولیەتی ئایین –شمولیەتی ئەحکامی ئایینی– هەروەها تێنەگەیشتنی لەو حەقیقەتانەی لەدەرەوەی جەماعەن و لەنێو کۆمەڵگەدا هەن وایانکردووە دیدی ئەو بەوجۆرە بێت و دواجاریش ئەمە خواستی بۆچوونی فیقهیە و کەسێك ئەگەر فەقیە بوو رەنگە هەر بەو جۆرە بتوانێت بیر بکاتەوە!.

بەڵام دەشێت ئەوەش بڵێم کە مامۆستا ناصر قەناعەتی وایە دەشێت کۆمەڵگەی نموونەییش دروست بکرێت، واتە هەر هەمان جەماعەی نموونەیی بنەمایەکە بۆ دروستبوونی کۆمەڵگەیەکی نموونەییش. بەو مانایەی سوبحانی دەرکی ئەوەی کردووە کە رێساکانی کۆمەڵگە جیاوازن لە رێساکانی تاك، لەبەر ئەوەش شەهادەت دەبێت لەهەرسێ ئاستەکەدا جێبەجێ بکرێت، هەم لە بواری تاکەکەسدا، هەم لە بواری خێزاندا و هەم لە بواری (کۆمەڵگە)شدا. ئەو دەرکی ئەوەشی کردبوو کە هەندێك لە ئەحکامەکانی ئایین ناتوانن بوونیان ببێت هەتا کۆمەڵگە نەبێت، لێرەشەوە کە باسی فیکری بە(کۆمەڵ)م لای سوبحانی کرد ژیانی نێو جەماعەشم مەبەست بوو نە ئەو جەماعەیە لە فیکری ئەودا خۆی دەمێنێتەوە، نا.. بەڵکو ئەم جەماعەیە بەردەوام دەجوڵێت هەتا دەبێتە کۆمەڵگە یەك کە بتوانێت ئەرکی( شەهادەت) بەجێبهێنێت، شەهادەت لەسەر کۆمەڵگەکانی دیکە، بۆ نموونە لەسەردەمی مۆدێرنەدا کۆمەڵگەیەك نەتوانێت بەڵگەی پراکتیك نەکردنی ئایینی لەنێو کۆمەڵگەدا هەبێت کاتێك لە قیامەتدا رووبەڕووی ئەو پرسیارەکرایەوە کە: بۆچی لایەنی کۆمەڵگەیی ئایینت پراکتیك نەکرد؟. لەبەر ئەوە ئەو ژیانە جەماعیەی لای سوبحانی دەجوڵێت بەرەو بەکۆمەڵگە بوون. یەکێك لە تایبەتمەندیەکانی کۆمەڵگەش بریتیە لە زمان و زمانیش گەورەترە لەوەی تەنها وشە بێت، زمان ئەو شتەیە هەیمەنەی بەسەر تاکەکاندا هەیە و بەڵکو رۆحی هەموو کۆمەڵگەیە.

## زمان لای مامۆستا ناصری سوبحانی:

بەبۆچوونی زۆرێک لە فەیلەسوفەکان دەکرێت هەموو داهێنانەکانی سەردەمی نویێ کورت بکرێتەوە بۆ دوو بوار کە بریتین لە زانست و فەلسەفەی مێژوو و زانست و فەلسەفەی زمان، واتە هەموو فەیلەسوفە گەورەکان و عەقڵە مەزنەکانی سەردەمی رۆشنگەری و مۆدێرنە هەر داهێنانێکیان کردبێت یان لە مێژوودا کردوویانە یان لە زماندا، دواجار ئەم داهێنانەشە رەنگی داوەتەوە لە زانستە ئەزموونی و زانستەکانی دیکەدا.

ئەگەر ئێمە بێین بەم میتۆدە مامۆستا ناصر بخوێنینەوە کە ئەو وەک کەسێک کە لە پێش سەردەمی مۆدێرنەدا ژیاوە و زۆر ئاگادار نیە بەسەر گۆڕانە مەعریفیە نوێکانەوە جیا لەوەی کە پێیگەیشتووە لە (عەلی شەریعەتی) و (مطهری) و (عەبدولکەریم سروش) و (تاڵەقانی) یان لە رێگەی رۆشنبیرە عەرەبەکانی وەکو (سید قطب) و (حسن بەنا) و (محمد غزالی) و هەروەها رۆشنبیری هیندی وەک (ئیمامی مەودودی) و (ابوحسن ندوی) و (اقبالی لاهوری) و...هتد، ئیتر وەکو چۆن دیراسەی قورئانی کردووە نەهاتووە بەوجۆرەش راستەوخۆ دیراسەی سەردەمی نوێی بکات. من دەڵێم بریا مامۆستا ناصر (هەزار رەحمەتی لێبێت و گۆڕەکەی پڕ نوور بێت) بمابایە هەتا مەکاتیبە فەلسەفی و مەعریفیە نوێکانی دوای نەوەدەکانیشی بناسیبایە، ئەو کەسێکی زۆر زیرەک و لێهاتوو بوو بۆیە بە بڕوای زۆرێک لە بیریاران گۆڕانی جەوهەری لە هەندێک بابەتی فیکری خۆیدا دروست دەکرد، بریا سەفەری ئەورووپای بکردبایە و بواری دیراسەی بۆ بخولقایە تا لەوێ قوتابخانە نوێیەکانی فەلسەفەی زمان و مێژوو و فەلسەفەی ببینایە. ئیدی بە رای من زۆر گۆڕانی گەورە لە فیکری ئەودا دروست دەبوو، هەرچەندە زۆرێک لە هاوفیکرەکانی رەنگە رازی نەبن بەم بۆچوونەی من بەرامبەر بە سوبحانی، بەڵام من دڵنیام کە دەکرا ئەمە روو بدات، بە بەڵگەی ئەوەی ئەو بێ ئەوەی ئاگاداری فەلسەفەی زمان و مێژووی نوێ بێت بەو مانا قووڵەی کە باسم کرد بەڵام بەتەنها و پشتبەستنی بە توانای زیرەکی و خەیاڵی خۆی و خوێندنەوە و ناسینی کلتوری ئیسلامی و تەرکیز خستنە سەر (قورئان) زۆرێک لەو داهێنانە نوێیانەی لەلایەن خۆیەوە کەشفکردووە کە دەکرێت ئاماژە بەهەندێکیان بدەین. هەرچەندە سوبحانی رۆشنبیریەکی پێش مۆدێرنەی هەبووە، پیشاندەری توانای شەخسی و تایبەتی ئەو کەسایەتیەن، هەروەک چۆن سەعید

نوورسی بە توانای دانسقە و تایبەتی خۆی لەسەردەمی مۆدێرنەدا کە ئەستەمە کەسی عاریفی وەك ئەو جارێکی دیکە دروست ببێت، ئەو توانیویەتی لەم سەردەمەدا ئەزموونی عیرفانی ببێت و عارفێکی گەورەش بێت. بەهەمان شێوە بلیمەتی و توانای تاکی و دانسقەی سوبحانیش لە بواری فەلسەفەی زمان و زمان ناسیدا دەردەکەوێت کە چۆن توانیویەتی بە کلتوری پێش مۆدێرنەوە کەرەستە ئامادە و زانراوەکانی زانستی زمانەوانی کۆن لە خوێندنەوە و ناسینی بابەتە نوێیەکاندا تەوزیف بکاتەوە، بەڵام دواجار بەهۆی ئاگانەبوونی تەواوی لەبابەتەکانی فەلسەفەی زمانەوانی و مێژوویی نوێ بۆشاییەك لە بۆچوونەکانیدا دەبینرێت هەرچەندە تێڕوانینی زۆر ورد و مەزنی هەیە بەبەراورد لەگەڵ هەندێك ڕۆشنبیری ڕۆهەڵاتدا:

بۆ زیاتر ڕوونکردنەوەی ئەم بابەتە ئەگەر بگەڕێینەوە بۆ ئەو قۆناغەی سوبحانی کە ئیتر بەتەواوەتی لەگەڵ قورئاندا دەژی و ڕێگەی ئیستیقرائی وازلێهێناوە و راستیەکانی قورئان دەکاتەوە دەلیل بۆ ئەوەی جوزئیاتی ژیانی پێ کەشف بکات. لەم قۆناغەدا یەکەم سەرچاوە و کۆتا سەرچاوەی سوبحانی بریتیە لە قورئان و بێجگە لەویش تاکە سەرچاوەیەکی دیکەی زانستی زمانە، واتە لە قورئانەوە بۆ (راغب الاصفهانی) و لەویشەوە بۆ مامۆستاکانی راغبی ئەصفەهانی، بەو مانایەی بەردەوام لە زاراوەکانی قورئانەوە چووە بۆ زمانناسی و دۆزینەوەی ریشەی وشەکان. ئەمە ئەو میتۆدەیە کە ناصری سوبحانی لە دواقۆناغی ژیانی و تەفسیری قورئاندا زۆر پشتی پێبەستووە کە دەکرێت ئێمە باس لە ئیجابیات و سلبیاتی ئەم میتۆدە بکەین: ئەگەر سەرەتا لە دیوە ئیجابیەکەی زمانناسی سوبحانیەوە دەست پێبکەین، (تەنانەت ئەم زمان ناسیەی سوبحانی هانیدام ببمە فەقێ و زانستەکانی حوجرە بخوێنم) مامۆستا ناصر لە بواری زمانناسیدا بلیمەتیەکی سەرسوڕهێنەری هەیە !، دەتوانین بڵێین سوبحانی فەلسەفە و فیقهی زمانی کۆنی باش دەرك کردووە. زمان لای ئەو تەنها وشە نیە بەڵکو لەپاڵ وشەدا تەعبیریش هەیە، لە پاڵ تەعبیریشدا سیاق هەیە. بۆ نموونە دەقی ئایینی لای ئەو تەنها وشە نیە بەڵکو بریتیە لە کۆی وشەکانی ئایەتێك و خودی ئایەتەکە و ئینجا ئەو سورەتەش کە ئەو ئایەتەی تێدایە و پاشانیش هەموو سورەتەکان پێکەوە. دوای ئەوەش ئەو دەقەی ئیعجاز تەنها بریتی نیە لە لایەنی زمانەوانی (لغوی). یاخود دەلالەتی وشەکە و

تەعبیرەكـە بریتـی نیـە لـە ئیعجازەكـەی، دەلالـەتی سـورەتەكەش بریتـی نیـە لـە ئیعجازەكەی و تەنها لەوانەدا كـورت نابێتـەوە، بـەڵكو ئـەو یەكێتییەیـە كـە لـە نێـوان (دال) و (مدلول)دا هەیە كە لە بەلاغەی كۆندا وایە گوایـە وشـە هێنـدەی نـزیكترە لـە ماناوە هێندە فەسیحترە، (دال) نزیك دەبێتەوە لە (مدلول) تا لە كۆتاییـدا دەبنـەوە بەیەك بەجۆرێك كاتێك وشەكەت وت ئەوا رێك ماناكە بەرجەستە دەبێـت. بـۆ نموونـە هـەر خـودی خوێندنـەوەی ئایەتـەكانی قیامـەت لـە لایـەن سـوبحانیەوە بـەو نەغمـە مۆسیقی و ئاوازە بەرز و نزمانەوە كە دەیخوێنێت خودی ماناكە بەرجەسـتە دەكـات، واتـــە لای ئـــەو خـــودی وشـــەكە و چـــۆنێتی خوێندنـــەوە و دەربڕینەكـــەی ماناكەشیەتی{٧١}.

سـوبحانی لـە كەشـفی لایـەنی مۆسـیقی قورئانـدا زۆر سـوودی لـە سـەیید قوتـب وەرگرتوە لەم رووەوەشـەوە دەڵێـت هەرچـەندە سـەرەتای ئـەم بابەتـە لای سـەیید دەركەوت بەڵام بەداخەوە دوای خۆی كەسێك نەبوو ئەم كارە تـەواو بكـات و قـوڵایی زیاتری پێبەخشێت{٧٢}. هەست دەكەیت لـە دیـدە كلاسـیكیەكاندا ئـەو هـەنگاوێك چووەتە بانتر. تەنانەت لە قورئانناسی خۆیدا بۆ كەشفی ماناو دەلالەتەكان پشتی بە فەرهەنگ و قامووسەكان نەبەستووە وەكو ئـەوەی موفەسـیر و زمانناسـەكانی دیكـە كردویانـە كـە ماناكـانی دەرەوەی قورئانیـان كردووەتـە دەلیـل بـۆ قورئـان، بـەڵكو سوبحانی دەڵێت قورئان لەفز و وشەكانی بەكارهێناوە بـۆ مانایـەك كـە لـەوەو پـێش بۆی بەكار نەهێنراوە، كە دەتوانین بڵێین ئەمـە داهێنـانێكی زمانـەوانی ئـەوە، بۆیـە دەڵێـت هـەروەكو چـۆن كـە هەنـدێك كتـێبی نـوێ دادەنرێـت لـە كۆتـایی كتێبەكـەدا فەرهەنگێگ بـۆ مانـای زاراوە نوێكـان دانـراوە ئـەوا لـە كۆتـایی قورئانیـشدا دەبێـت فەرهەنگێك ببێت بۆ مانا نوێیەكانی زاراوەكانی قورئان كە لە فەرهەنگەكانـدا دەسـت ناكەون{٧٣}. ئەمەش یەكێكە لەو شتە جوانانەی لای مامۆستا ناصـر كەشـفكراوە. بەڕاسـتی سـوبحانی زۆربـاش توانیویـەتی بابەتـەكانی زمانـەوانی كەشـف بكـات بەتایبەتی پەیوەندی نێوان لەفز و مانا كە جێگای ئیشكردنی زۆرێك لە زمانناسـەكان بووە، هەرچەندە بەداخەوە مـەرگ بـواری ئـەوەی نـەدا زیـاتر درێـژەی پێبـدات، بـۆ نموونە زانستی( ئیشتیقاق) كە بریتیە لە چوار پێنج بەش، سـوبحانی ئـەم زانـستەی زۆرباش بۆ دیراسەكردنی قورئان بەكارهێناوە. بۆ نموونە دەفـەرموێت هـەر وشـەیەك لە زمانی عەرەبیدا بە (ج) دەست پێبكات و (ن)ی بەشوێنیدا هاتبێت ئـەوا (خفـی)ی

تێدایە –شاراوەیی– وەك (جن) یان (جنـە) تەنانـەت بەهەشـت ئەوەنـدە باخـەکانی چڕن شاراوەیەکی تێدایە! یان ئەگەر وشـەیەك بـە (ن) دەسـت پێبکـات و (ب)ی بـە شوێندا بێت ئەوە دەرکەوتنی دوای شاراوەیی –اظهار بعد الخفاء– وەکو (نبأ)، هـەر وشەیەك بە (ب) دەست پێبکات و (ت)ی بە شوێندا بێت بڕینی تێدایە –قطع– وەکو (بتر) و (بتك) ...هتد{٧٤}، هەموو ئەمانە پیشاندەری ئـەو راسـتیەن کـە سـوبحانی باش لە فیقـه و فەلسـەفەی زمانـەوانی کـۆن شـارەزا بـووە. هـەروەها دەتـوانم بڵـێم نزیکی ئەو لەگەڵ زمانەوانی نوێدا لەو خاڵەدایـە کـە تایبەتمەندیـەك دەدات بـە زاراوە قورئانیـەکان کـە ناکرێـت لـە زانسـتەکانی زمانـدا بیدۆزیتـەوە، ئەگەرچـی هـەموو وشەکانی قورئان لـە زمـانی عەرەبیـدا هـەن بـەڵام لـە قورئانـدا مانایـەکی تایبـەتیان وەرگرتووە. لێرەدایە سوبحانی توانای داهێنانکـاری زمانمـان پیشـان دەدات (القـدرة التولیدیة للغة) ئەمەش بەڵگەی زیرەکی و بلیمەتی ئەوە لە زمانناسیدا!.

بەڵام یەکێك لەو کەلێنانەی لە زمانناسی سوبحانیدا دەبینرێت بریتیە لەو پەیوەندیە بێسەر و بەر (العلاقة الاعتباطیة) و نالۆژیکیانەی لە نێوان (دال) و (مدلول)دا هەیە کە فەلسەفەی زمانەوانی نوێ دەریخستووە، واتە پەیوەندیەکی لۆژیکی لە نێوان وشە و مانادا بوونی نیە بەو مانایەی پێویست بوو بێت ئەو (دال)ە بۆ فلان (مدلول) بەکار بهێنرێت بەڵکو ئەوە تەنها رێکەوتنی مرۆڤەکان بووە وایکردووە ئەو (دال)ە بۆ ئەو (مدلول)ە بەکار بێت. ئەگەر بهاتایە و پەیوەندی نێوان (دال) و (مدلول) پەیوەندیەکی حەتمی لۆژیکی و دەرەنجامی بووایە ئەوا مەحاڵ بوو زمانە جیاوازەکان دروست ببن بەڵکو هەموو زمانەکان یەك شێوە دەبوون، بەوجۆرە نەدەبوو کوردێك بڵێت (بەرد) و عەرەبێکیش بڵێت (حجر)، هەموومان یان دەمانووت (بەرد) یان دەمانووت (حجر)، بەڵام ئەوە عەرەبەکان رێککەوتوون کە بەو ماددە دیاریکراوە بڵێن (حجر) و کوردیش بڵێن (بەرد) و ئینگلیزەکانیش بڵێن (stone)و...هتد، چونکە ئەمە شتێکی ئیعتیبارییە، دەبینیت ئیتیفاقی مرۆڤەکان کاریگەری هەیە لەو بابەتەدا، ئەم رێککەوتنە وا دەکات لەهەر بەکارهێنانێکی نوێی لەفزەکاندا بیرکردنەوەی مرۆڤەکانیش بچێتە نێوان (دال) و (مدلول)ەوە. واتە کە زمانی خێڵێك، نەتەوەیەك، یاخود ناوچەیەك فێر دەبیت، تەنها زمانەکەیانت [illegible]گرتووە بەڵکو بەهۆی ئەو پەیوەندیە نالۆژیکیەی لەنێوان لەفز و مانادا هەیە [illegible] و نەتەوەیەش کە لە نێوان (دال) و (مدلول)ەکەدا هەیە

وەریدەگریت، جیهانبینی ئەوانیش وەردەگریت. لێرەوە دەکرێت (دال)ێك لای نەتەوەیەك بۆ مانایەك بەكار بێت، بەڵام هەر لە هەمان زمان و لای كۆمەڵێكی دیكە بە مانایەكی دیكە بەكار بهێنرێت، بەهۆی پەیوەندیە هەرەمەكیەكە و رێككەوتنەكەی ئەوانەوە كە فلاَن وشە بەو مانایە بەكار بهێنن، ئەوا فیكری خەڵكەكەش دەخزێتە نێوان (دال) و (مدلول)ەكەوە. تەنانەت ئەمە لە جیاوازی نەوەكانیشدا بەوجۆرەیە، بۆ نموونە ئێستا ئێمە ئەو زاراوانەی لە زمانی كوردیدا بەكاریان دەهێنین كە جیاوازە لەو مانا و مەدلولەی نەوەی پێشووتر كە هەمان لەفزی بۆ بەكارهێناوە. لەبەر ئەوە ناتوانیت بۆ دۆزینەوەی مانای وشەیەك كە ئەمڕۆ ئێمە بە شوێنیدا دەگەڕێین بچینەوە سەر ئەو مانایەی كە لە سەردەمەكەی پێشووتردا بۆی بەكارهاتووە، واتە ناتوانین فیلۆلۆژیانە بچین بەشوێن ریشەی وشەكانەوە، ئەمە ئەو بۆشاییەیە كە لە فیكری زمانەوانی سوبحانی و كەسانی دیكەشدا هەیە، لەبەر ئەوەی رێكدەكەوێت لەفزێك بە درێژایی مێژوو بۆ چەند مانای زۆر دوور لەیەكدی بەكار هاتبێت، بۆیە ئەگەر تۆ بتەوێت هەر كام لە ماناكانی بدەیت بەسەردا، هێشتا دەتوانیت مانای دیكەی بۆ بدۆزیتەوە، بۆ نموونە لە زمانی عەرەبیدا (اضداد) دروست بووە كە بریتیە لەو وشانەی بۆ مانای دژ بەكار دێن وەكو (قسط) كە بۆ دادپەروەریش بەكار هاتووە بۆ ستەمیش بەكارهێنراوە! ئەمە چۆن وایلێهاتووە؟! بەهۆی نەبوونی پەیوەندی لۆژیكی نێوان لەفز و مانا و رێككەوتنی مرۆڤەكانەوە هەر جارەی بۆ مانا و مەدلولێكی جیاواز بەكارهاتووە. هەر بۆیە ناتوانیت بگەڕێیتەوە بۆ ریشەكەی، دەبوو مامۆستا ناصر ئەوەندە بەشوێن رەگ و ریشەی وشەكاندا نەچووایە واتە هەر ئەوەندە بیزانیایە فلاَن وشە لەنێو عەرەبی سەردەمی دابەزینی قورئاندا چۆن بەكارهاتووە و لەنێو قورئانیشدا چۆن بەكارهێنراوە، ئیتر پێویست نەبوو بڕوات بەو قووڵیە بەشوێن ریشەی وشەكانەوە بێت، چونكە ریشەدۆزی چ ریشەی مێژوویی بێت، چ ریشەی نەسەب بێت، چ ریشەی وشە بێت بەشێكی زۆری زانستەكانی پێش سەردەمی مۆدێرنەی داگیر كردووە، كە عەرەبەكان زۆر تێكەوتوون لەو بابەتەدا، كاتێك منداڵێكیان ناردووە بۆ لادێیەك تا زمانی عەرەبی رەسەن فێر ببێت تەنها فێری زمانی عەرەبی رەسەن نەبووە بەڵكو فیكری ئەو شوێنەشی وەرگرتووە لەگەڵ فێربوونی زمانەكەیاندا. لەبەر ئەوە كاتێك وشەیەكی قورئانی دەبەیتەوە بۆ پێش دابەزینی قورئان تەنها مانای ئەو وشەیە لەپێش قورئاندا نادۆزێتەوە بەڵكو لەگەڵیدا

فیکری پێش قورئانیش دەسەپێنێت بەسەر قورئاندا{٧٥}، بۆ نموونە ئەوەندەی من دیراسەی فیکری مامۆستا ناصرم کردبێت، هەست دەکەم ئەو تەعبیرانەی قورئان کە دەیانباتەوە بۆ سەردەمی پێش قورئان دوچاری ئەم گرفتە بووە، لە (شذور الذهب)دا باسی (مضارع) دەکات و دەیباتەوە سەر (ضرع) واتە (گوان) هەرچەندە ئەوە تەفسیرێکی زۆرجوانە بۆ ئەو بابەتانە کە ریشەی ئەو وشانە چۆنە و لە کوێوە هاتووە؟، بەلاّم لە هەمان کاتدا سەیر دەکەیت تەنها (ضرع)ەکە بوونی نیە وەکو وشە (دال) بەڵکو فیکری عەرەبی ئەو کاتەش کە خەڵکانێکی (بەدەوی بوون و ئاژەڵیان بووە دێت ئامادەیی پەیدا دەکات لە تەفسیرکردنی قورئاندا. ئەمەش وادەکات کە خوێندنەوەیەکی پێشین بێت بۆ قورئان، نە خوێندنەوەیەکی داهاتووانە، ماناکەی سنووردار دەکات، بەلاّم ناصری سوبحانی لەوەدا نزیك بووەتەوە لە زانستی زمانەوانی نوێ کە باوەڕی وابووە قورئان سیستەمێکی کامڵە و زاراوە بەکارهاتووەکانیش لە ناویدا مانایەکیان لە خودی سیستەمە وەرگرتووە کە جیاوازە لە مانا زمانیە پێشنەکانیان ئەگەرچی پێشتریش بەکارهێنرابن{٧٦}.

بەگشتی سوبحانی کەسێکی بلیمەت بووە لە زمانناسیدا کە باش لە زمانەوانی کۆن شارەزا بووە، باش لە (نحو) شارەزا بووە کە کاسێتەکانی باسی (شذور الذهب) بەڵگەی ئەم راستیەن، هەروەها باش لە زانستی (صرف) و (بلاغە)دا شارەزا بووە و زۆر باشیش توانیویەتی تەوزیفی ئەو زانستە بکاتەوە لە تەفسیرکردنی قورئاندا. بۆ نموونە لەباسی شەهادەتدا کە کێ شاهیدە؟، دێت زانستی گەردان (صرف) تەوزیف دەکات، دەڵێت ئەو چاوگانەی (مصدر الافعال) کە بۆ (حرفە) بەکاردێن لەسەر کێشی (فعالە)ن وەکو (صناعة) و (تجارة) و...هتد، بەلاّم ئەو پیشانەی کە پیتی دووەمیان لە پیتەکانی (حلق) بێت و لەسەر ئەو کێشەش بن ئەوا پیتی یەکەمی (کسرة) وەناگرێت بەڵکو (فتحة) وەردەگرن، واتە (فەعالە) وەکو (شەهادە)، کەواتە (شهادە)ش وەکو (تجارە) وایە، واتە ئەگەر کەسێك یەکجار ئەو کارە بکات پێی ناوترێت (تاجر) یان (صانع)، بەڵکو دەبێت بەردەوام خەریکی ئەو کارە بێت ئینجا سیفەتی ئەو کارەی پێدەدرێت، بۆیە شەهادەش بەهەمان شێوەیە بەلاّم کە پیتی یەکەمی (مەفتوحە) لەبەر ئەوەیە کە قورسە لە (کسرە)ەوە بڕۆیتەوە بۆ پیتی (حلق)، بۆیە کە کەسێك یەکجار شەهادەت ئەدا دەکات نابێتە (شاهد) بەڵکو دەبێت بەردەوام مژوڵی جێبەجێ کردنی ئەو ئەرکە بێت و بووبێتە مەلەکە

تێیدا{٧٧}. لێرەوە زانستەکانی (ئالە) لەسەردەمی کۆندا بریتی نین لە کۆمەڵێك دەرەنجامی مردووی وشك، بەڵکو توانای داهێنانکاریان تێدایە —تیۆریای تەولیدی چۆمسکی لە فەلسەفەی زماندا—. بۆیە دەتوانیت زانستەکانی (نحو و صرف و بلاغە) و...هتد، تەنانەت زانستی تەجوید یاخود (فۆنەتیك) بۆ گەیاندنی مانا تەوزیف بکەیت، بۆیە بەبۆچوونی من (مامۆستا ناصر) هەر وەکو چۆن توانا مومکینەکانی فیقهی کۆنی تەوزیف کردووە، بەهەمان شێوە توانا مومکینەکانی زانستی زمانەوانی کۆنیشی تەوزیف کردووە. من زۆر دیدی (نحو)ی ئەوم بەرچاو کەوتووە کە رەخنە لە زمانناسەکان دەگرێت، بۆ نموونە لە باسی (یاء النداء)دا —کە نەحویەکان وتویانە یا بۆ دوعا بەکار دەهێنرێت. تەنانەت لەبیرم دێت لەو شوێنێکدا دەڵێت سورەتی (لقمان) هەموو (نحو)ی تێدایە! بزانە چەند ورد بووە کە توانیویەتی هەموو رێساکانی زانستی (نحو) لەیەك سورەتدا بدۆزێتەوە!{٧٨}.

قوتابخانەی (ئیبن هیشامی ئەنصاری) کە قوتابخانەیەکی نەحوی قورئانیە و لە بواری رستەسازیدا بەناوبانگە لەنێو زاناکانی (نحو) و زانستی رستەسازیدا کە لە کتێبەکانیدا زیاتر لە حەوت (جزء)ی قورئانی تەوزیف کردوە، بەڵام هەست دەکەیت ناصری سوبحانی کاتێك زانستی زمانەوانی وتووەتەوە (ئیبن هیشامی ئەنصاری)شی تێپەڕاندووە، بەڵکو لە نەحودا تەفسیری زۆربەی قورئانی کردووە!، دواجار مامۆستا ناصر هەرچەندە لەو زانستانەدا شارەزا بوو بێت ئەوا سەنتەر لای ئەو هەر قورئان بووە، واتە هەر ئەوەندە ئەو زانستانەی تەوزیف کردوونەتەوە کە پێچەوانە نەهاتبێتەوە لەگەڵ ئەو سیستەمە گشتیەکەی قورئاندا یاخود —القرآن یفسر بعضه البعض—ەکەی لە قورئاندا کەشفکردووە. ئەگەرچی دیدی ئەو لەم بوارەشدا دیدێکی جەماعیە نە کۆمەڵگەیی و نەتەوەیی، هەروەها رێسا کۆنەکانی زانستی زمان و (علوم الآلة)ی بەکارهێناوە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا زمان ناسێکی گەورە بووە. مامۆستا ناصر توانیویەتی بە پێشفەرزە فیقهیەکانەوە، بە پێشفەرزە جەماعیەکەیەوە، بەپێشفەرزە رۆشنبیریە شەخصی و تاکیەکەی حەفتاکان و هەشتاکانیشیەوە سیستەمێکی کامڵ بۆ قورئان بدۆزێتەوە! لێرەشەوە دیدی ئەو دیاری بکرێت بەرامبەر هەموو کایەکانی مەعریفە، چ لە مێژوودا، چ لە کۆمەڵناسیدا، چ لە مرۆڤناسی و ئەخلاق و...هتد.

هەر وەك لە بابەتی (ئایین خۆری ژیانە) کە لەسەر (حسن بنـا)م نووسـیوە تێیـدا وتوومە کە ئیمام (حەسەن بـەنا) لەسـەرەتاوە ئیختیـارێکی کـردووە کـە ئـەو جۆرە ئایینداریەی هەڵبژاردووە، بەڵام دواجار ڕیساکانی نێـو ئیختیارەکـەی خـۆی زاڵبـوون بەسەریدا{٧٩}، ئەمە بۆ مامۆستا ناصریش بەهـەمان شـێوەیە، کاتێـك بـە دیـدێکی فیقهیەوە دێتە نێو ئەو بابەتانەوە. بە ڕاستی بلیمەت بووە، دەتوانم بڵـێم ڕۆشـنبیری سەردەمی خۆی بڕیوە، هەروەها دیـدی بەرامبـەر زانسـتە کۆنـەکانیش داهێنانکارانـە بووە، بەڵام دواجار دیدگاکانی سوبحانی چ لـە زمـان ناسـیدا، چ لـە نەتەوەناسـیدا و ...هتد، دیدێکی فیقهین، دیدی فیقیهیش هێنـدەی دۆزینـەوە و مامەڵەکردنـە لەگـەڵ هەبوودا هێندە گۆڕان نیە کە دیدی عاریفانە زۆرتر بەو جۆرەیە، کەشـفکردنی خـودە –وەك پێـشتر باسـم کـرد– نـە گـۆڕینی خـود، دۆزینـەوەی ئیمکانیـاتی خـودە و جوڵاندنیانە لە هێزەوە بۆ کردار نە گۆڕینی ئـەو توانا لـە هێـزدا بووانـە بـۆ شـتێکی دیکە.

## مامەڵەی سوبحانی لەگەڵ کایە مەعریفیەکاندا:

ئێستا دەمەوێت قسە لەسـەر دوو تـەوەرە گرنگـە بکـەم لای ناصـری سـوبحانی، تەوەرەی یەکەمیان: بریتیە لەوەی کە ئایا مامۆسـتا ناصـر لـە کایـە مەعریفیەکانـدا چـیکردووە؟. تـەوەری دووەمیـان: ئایـا سەرچـاوە مەعریفیـەکانی سـوبحانی چـی بوون؟. ئەم دوو تەوەرەیە بە بۆچوونی من ڕەنگە زۆرترین قسە هەڵبگرن، بەتایبـەتی لای توێـژی ڕۆشـنبیر کـە بیانـەوێت کەسایەتی و پێکهاتـەی فیکـری ئـەو بناسـن و بخوێننـەوە حەتمـەن لەمبارەیـەوە قـسەیان بـۆ دروسـت دەبێـت، پێـشتر باسـی مامەڵەکردنی سوبحانیم کرد لەگەڵ زانستی زمانەوانیدا کە پیشانماندا مامۆستا ناصر کەسێکی فیلۆلۆژیستە لە زمانناسیدا کە بە شوێن ڕیشەی وشەکاندا گەڕاوە تەنها لەو شـوێنانەدا نـەبێت کـە مانـا و مـەدلولی وشـەکە پێـچەوانە هاتبێتـەوە لەگـەڵ ئـەو سیـستەمەی دایناوە بـۆ تەفـسیر و مامەڵـەکردنی لەگـەڵ قورئانـدا، واتـە سیـستەمە قورئانیەکەی کردووەتە دادوەر بەسەر مامەڵە ڕیشە دۆزیەکەی خـۆی لـە زمانناسـیدا هەرچەندە زۆر پشتیـشی بـەو مامەڵەیـە بەسـتبوو کـە ئەمـەش شـتێکی نەوعیـە لای سوبحانی، ڕەنگە زۆر بەدەگمەن لای موفەسیران و فەقیهەکانی پێشتر بینرا بێت.

بێگومان من وتوومە کە مامۆستا ناصر فەقیە بووە -هەر وەك لەسەرەتای باسەکەوە ئەمەمان ورووژاند. لەسەر ئەمەش رەخنەی ئەوەم ئاراستە کراوە کە گوایە من سوبحانیم بچووك کردۆتەوە کاتێك بە فەقیە وەسفم کردووە. بەلاّم دەمەوێت بلّێم ئەو فەقیهەی من مەبەستمە رەهەندی زۆرە، شارەزای بواری تەفسیر و (علوم الحديث) و (علوم الآلة) ...هتد، دەگرێتەوە. وردتر بلّێم مەبەستم لە بەکارهێنانی زاراوەی فەقیە ئەو شتەیە کە لە فەیلەسوف و عاریف جیای دەکاتەوە، کە کایەکانی نێوان ئەو دوانەش گەلێك زۆرن، بە رای من ئەمە سیستەمێکە هەر کەسێك ئەمجۆرە رێگایە بگرێتەبەر بەناچاری جۆرێك مامەلّەی تایبەتی لەگەلّ زمانناسی و قورئان و زانستی فەرموودە و ...هتد، بۆ دروست دەبێت، تەنانەت لەگەلّ خودی ئایین بەگشتی و واقیعیشدا مامەلّەیەکی تایبەتی دەبێت دوایيش داهێنانەکانی بریتی دەبێت لە دەرئەنجامی ئەوجۆرە مامەلّەیە، بۆیە مەبەستی منیش لە فەقیە بوون ئەمەیە.

بۆ نموونە هەر لە باسی زمانناسیدا ئەوەی کە لە دەقناسی سەردەمی نوێدا ئەمڕۆ باسی لێوە دەکرێت دروستکردنی مانایە -توليد المعنى- بەلاّم جەوهەریترین جیاوازی نێوان فیقهی زمانەوانی کۆن لەگەلّ فەلسەفەی زمانەوانی سەردەمی نوێدا لەو خالّەدایە. ئەگەرچی لە فیقهی زمانی کۆندا ئەو باوەڕە هەیە کە دەکرێت مانای جۆراجۆر لە زمان وەربگیرێت، بەلاّم مانایەك هەیە کە راسترینی ماناکانە، دەبێت بگەڕێیتەوە سەر ئەو مانا راستەقینەیە. ئیتر ئایا ئەو مانایە لە خودی سیستەمە زمانیەکەوە وەردەگرێت، یاخود لە واقیعەوە و لە هۆکارەکانی پەیدابوونیەوە وەردەگیرێت، وەکو ئەوەی دەووترێت -اسباب النزول- یاخود لە لایەن کەسێکەوە کە بەیانی ئەو مانایە دەکات، وەکو زانستی فەرموودە کە بەیانی قورئان دەکات ئەو مانا راستەقینەیەت پێ نیشان دەدات، کە کاك ئەحمەدی موفتیزادەش ئەم تێڕوانینەی هەبووە، تەنانەت فەلسەفەی (ئیسرا و میعراج)ی پێغەمبەر (د.خ) لای کاك ئەحمەد بریتیە لەوەی کە پێغەمبەری خودا لەو سەفەرەیدا مانای راستەقینەی ئایەتی موتەشابیهی پێدەووترێت. کەواتە جۆرێك لەمامەلّە لەگەلّ زماندا دروست دەبێت کە یەك مانایە یاخود ئەگەر مانای جیا جیاشی ببێت- وەك ئەوەی حەزرەتی عەلی دەفەرمووێت بە ئیبن عەباس کە: بە قورئان موناقەشە مەکە لەگەلّ خەواریجەکاندا، چونکە قورئان مانای فراوان وەردەگرێت! ... مەبەست لەوەیە

ئەگەرچی مانای زۆرتریش وەردەگریت بەلام یەکێك لە ماناکان لەوانی دیکە راستترە. لێرەوە دەبینیت لە مامەڵەیەکی وەکو مامەڵەی سوبحانی لەگەڵ زانستی زماندا یاخود لە مامەڵەی زماننناسێکی سەردەمی کۆندا زمان مانایەکی راستەقینەی هەیە. تەنانەت مامۆستا ناصر کاتێك تەفسیری (آل عمران)دا باسی تەشابوه دەکات، لای ئەو تەشابوه بریتی نیە لەوەی ئایەتێك هەبێت چەند مانایەك وەربگرێت، بەڵکوهەر ئایەتێك یەك مانای هەیە، بەلام دەکرێت ئەو مانایە بە چەند شێوە تەئویل بکرێت، کە تەشابوه لە کاتێکدا زۆرتر دێتە کایەوە کە ئەهلی کیتاب لەبەرامبەر قورئان و ئیسلامدا راست بوونەتەوە، بێگومان ئەوان ئیلاهیاتناسی خۆیانیان هەیە، ئەمەش وا دەکات هەندێك شت لەبەرامبەر ئیسلامەوە بوروژێنن وەك ئەوەی ئەمە ئایینێکی نوێیە و وەلامی نیە بۆ ئەو بابەتانە. بۆ نموونە یەکێك لەو شتانەی کە دەیانوروژاند بریتی بوو لەوەی کە حەزرەتی مەسیح خودایە و سێیەمینی سێ خوداکەیە —ثالث ثلاثة— لێرەشەوە پێغەمبەری خودا و موسوڵمانان دەیان فەرموو شتی وا نیە، بەڵکو حەزرەتی عیسا بەندەیەکە لە بەندەکانی خودا. ئەوانیش لێرەدا شتێکی دیکەیان دەوروژاند لەبەرامبەر موسوڵمانەکانەوە، دەیانووت باشە ئەگەر (مسیح) کوڕی خودا نیە، ئەی کوڕی کێیە؟!. خودی ئەم رستەیە( کە باوکی مەسیح کێیە؟) ماناکەی روونە، واتە (تەشابوه) وەکو ئەوەی ئەمڕۆ لە فەلسەفەی زمانی نوێدا و لە زانستی هێرمینیوتیکادا دەکرێت دەقێك چەند مانایەکی هەبێت، ئەوا لەو کاتەدا چەند مانایەکی نیە بەڵکو یەك مانای هەیە، واتە تەشابوهەکە دەکەوێتە دوای دروستبوونی ماناکەوە، ئێمە مانای باوکایەتیمان زانی، پێغەمبەری خوداش (د.خ) واتای باوکایەتی دەزانی بۆیە ئەو پرسیارانەیان دەکرد، کەواتە قسەکە لە مانای ئەو وشەیەدا نیە. بۆیە وەحی دێتەخوارێ بۆ پێغەمبەری خودا و دەفەرمووێت: ﴿...ان مثل عیسی عند الله کمثل آدم...﴾{٨٢} ئەوە وەلامی تەشابوهەکەیە، نمونەی عیسا لای خودا وەکو ئادەم وایە، لە بنەڕەتدا رووی تەشابوهەکە لای ئادەم قووڵترە چونکە ئەگەر (مەسیح) باوکی نەبێت ئەوا ئادەم دایکیشی نیە!. کەواتە گرفتی ئایاتی تەشابوه بریتی نیە لەوەی کە ماناکانی روون نیە، مەتەڵێك نیە کەس ماناکەی نەزانێت{٨٣}، تەنانەت یەکێك لەو شتانەی کە سوبحانی دەیکاتە دەلیل بەڵکو سیستەمێکی وەکو زانستی میرات (علم المیراث)ی پێ راست دەکاتەوە، کە بە حوکمی ئەوەی من توێژینەوەی دەرچونەکەم لە کۆلیژی یاسا لەسەر میرات بووە و

چەند ساڵێکیش مامۆستای ئەو زانستە بووم لە حوجرە و چەند وانەیەکیشم لە زانکۆدا بە خوێندکاران وتۆتەوە. ئەوەم بۆ دەرکەوتووە ئەو سیستەمە بەو شێوە نەریتی و تەقلیدیەی هەیە لای زانایان بۆشاییەکی تێدایە، واتە شتێك هەیە هێڵرابێتەوە درابێتە دەست کۆمەڵگە خۆی، بەڵام مامۆستا ناصر دەفەرمووێت ناکرێت سیستەمێکی لەوجۆرە لە قورئاندا ببێت و هەموو شتێکی بەیان نەکرا بێت، بەو مانایەی شتێك نیە لەقورئاندا بە بەیان نەکراوی هێڵرابێتەوە، کە وابوو (موتەشابیه) چیە؟! موتەشابیه پەیوەندی بە روونی و ناروونی ماناکەیەوە نیە، بەڵکو لەشتێکدایە کە لەو دیو ماناکەیەوەیە، کەواتە هەموو قورئان یەك مانای رۆشنی هەیە و دەکرێت ئەو مانایە بدۆزرێتەوە. ئەمەش ئەو سیستەمە فیکریەیە کە فەلسەفەی زمانی کۆن ئیشی لەسەر کردووە، هەروەها ئوصولی فیقهیش ئیشی لەسەرکردووە و زمانی یاسای نوێش ئیشی لەسەر دەکات، کە زمانی یاساش وایە، واتە ئەحکام کە پێت دەڵێت ئەوە بکە و ئەوە مەکە. بۆیە مەنهەجیەتی (مامۆستا ناصر) یاخود مەنهەجێتی کەسێکی وەکو کاك ئەحمەدیش مەنهەجیەتێکی یاسایی بووە یان بە زمانی ئەو کاتە بڵێین مەنهەجیەتێکی فیقهی بووە. ئامادەشم گفتوگۆ لەگەڵ هەرکەسێکدا بکەم کە پێچەوانەی ئەم بۆچوونەی منی هەبێت. نمونە ئێمە سێ قوتابخانەی گەورەمان هەیە بۆ تەفسیری دەقە یاساییەکان، قوتابخانەی زانستی و قوتابخانەی مێژوویی و هەروەها قوتابخانەی دەقی. قوتابخانەیەکیان دەڵێت کاتێك کە شتێکی نوێ دێتە پێشەوە و لە دەقە یاساییەکاندا نیە، دەبێت نیەتی دانەری یاساکە بهێنینە پێشەوە، واتە ئەگەر ئەمرۆ ئامادە بووایە چی دەکرد. یەکێکی دیکە لە مەدرەسەکان دەڵێت نابێت فەرزی نیەت بکەین، بەڵکو هەر نیەتەکەی ئەو کاتە حیساب دەکەین و ئەمەی ئێستا قیاس دەکەین لەسەر ئەو، واتە ئەمیان دەبەین بۆ لای ئەو. یەکێکی دیکەشیان دەڵێت نەخێر زانستی تەئویلی یاسا چۆنمان پێ دەڵێت بەوجۆرە دەکەین! {٨٤}.

دووان لەم سێ قوتابخانەیە لەسەردەمە پێشینەکاندا بوونیان هەبووە کە بریتی بوون لە یەکەم، فەرزکردنی نیەتی شارع و دووەمیان قیاسکردن، فیقهی زەمانی کۆن لەسەر ئەم دووانەیان زۆر وەستاوە، لێرەوە مامەڵەکردنی مامۆستا ناصر گەڕانە بەشوێن کەڵەکە بوونی مانادا و لە هەمان کاتیشدا دۆزینەوەی مانایەکی راستەقینە، بۆیە دەبینیت زۆر ئیستیدلال دەکات، لەکاتێکدا ئەگەر تۆ باوەڕت بە فرە مانایی و

پلوراليزمى مەعريفى بوو ئيستيدلال ناكەيت، چونكە ئەوەى بەرامبەريش بەشێك لە حەقيقەتى تێدايە، بەلاَم دەبينيت كە يەكەم خەصلەتى مامۆستا ناصرى سوبحانى ئيستيدلال كردنە، هەروەها زۆر بە يەقينيشەوە باسى ماناكان دەكات. بۆ نموونە لە تەفسيرى سورەتى(الاعراف)دا دەڵێت: (الاعراف) بريتى نين لەوانەى كە هێشتا بڕيار نەدرابێت بچنە بەهەشت ياخود جەهەننەم، بەڵكو ئەوان لە بنەڕەتدا فريشتەن{٨٥}، هەر لە دونيا و كاتى مردندا خوداى گەورە ديارى دەكات كێ ئەهلى بەهەشتە و كێ ئەهلى جەهەننەمە، بە بڕواى سوبحانى ئەوەى زەڕەيەك ئيمانى لەدڵدا بوو بێت دەچێتە بەهەشت، چونكە مەلەكەى ئيمان لاى ئەو دروست بووە، بەكورتى مەبەستم ئەوەيە كە تاك مانايى و تەفسيرێكى ئاسنى لاى ئەو زۆر ئامادەيى هەيە بەلاَم لەگەڵ ئەوەشدا بە راستى زۆر بليمەتانە توانيويەتى سيستەمى قورئان كەشف بكات لەو بوارەدا، واتە بوونى سيستەمێكى وەها بۆ قورئان كە ناچار نەبيت مانا دژەكانت قبوڵ بێت، كە بە بۆچوونى من كەس لە موفەسيرەكانى پێش ئەو نەيتوانيوە ئەوە بكات، نەيانتوانيوە سيستەمێكى وەها بەرهەم بهێنن كە جۆرى مامەڵەكردنەكەت لەگەڵ قورئاندا ديارى بكات، بەردەوام بۆشاييەك هێڵراوەتەوە بۆ ئەوەى بيگەڕێننەوە بۆ ئەسەرێك يان فەرموودەيەك. واتە لەخودى سيستەمەكە ماناكەيان كەشف نەكردووە، بەلاَم سوبحانى سيستەمى قورئانى بە ماناى —القرآن يفسر بعضه بعضا— كەشفكردووە. ئەگەر ئێمە باوەڕمان وابێت (كتاب) سەرچاوەى يەكەمى ئەحكامە و سوننە لەپاش ئەو دێت چۆن بۆشاييەك هەبێت تا ئەو كەشفى بكات؟! بەڵكو (كتاب) دەبێت حەكەم بێت بەسەر سوننەوە. لەبەر ئەوە گرنگى ئەو پياوە لەوەدايە كە توانيويەتى ئەو سيستەمە گەورە بدۆزێتەوە.

با باس لە داهێنانەكانى سوبحانى بكەين لە هەندێك بوارى جياجيادا، كە ناكرێت بە ئەندازەى فراوانى بابەتەكان لاى ئەو قسەيان لەسەر بكەين، چونكە ئەوە سەدان كاتژمێر قسەكردنى لەسەركردنى دەوێت، بەلاَم ئەوەندەى من لە خوێندنەوە و بەدواچوونەكانى خۆمدا بۆ بابەت و بەرهەمەكانى ئەو دەركم كردبێت كە رەنگە گەلێك داهێنان و شتى جوانتريش لە فيكر و بەرهەمەكانى سوبحانيدا بوونيان ببێت و ئێمە پێمان نەزانيبێت و خەڵكانى ديكە ببن بتوانن كەشفى بكەن. بە راستى گەورەييە بۆ ئەو كە لە تەمەنێكى كەمدا توانى ئەو هەموو داهێنانە بكات و ئەو هەموو جوانيانە لەسەر شارستانيەتى ئيسلامى پيشان بدات، بەو جەستە بچووكەوە

بەرگەی ئەرکێکی گرت کە ئەگەر بدرایە بەسەر شاخەکاندا دەتوانەوە! گەر لە زانستی فەرموودەوە دەست پێبکەین؛ ئەوا زانستی فەرموودە و فەرموودەناسی یەکێکە لەو زانستانەی کە سوبحانی زۆر قسەی جوانی لەو بابەتەدا هەیە کە دەشێت بڵێم کردنەوەی دەرگایەکی نوێیە بۆ فەرموودەناسی، من خۆم ئەو وایلێکردووم جارێکی دیکە بچمەوە خزمەت فەرموودەکانی پێغەمبەری خودا و مامەڵەم لەگەڵ فەرموودەدا ببێتەوە.

کە ئەمەش رەنگە جەوهەریترین خاڵی جیاوازی نێوان کاک ئەحمەد و ناصری سوبحانیش بێت کە لەو گفتوگۆیەی کە لە (نگلّ) کراوە لە نێوان هەردووکیاندا بەباشی ئەمە دەردەکەوێت، کە هەست دەکەیت کاک ئەحمەد (هەزار رەحمەت لە گۆڕەکەی) کەمتر پشت دەبەستێت بە فەرموودە، تەنانەت (ظنی)ش. چونکە دەترسێت لەوەی ئەو فەرموودەیە وتەی پێغەمبەری خودا (د.خ) نەبێت و دروستکراو بێت، بۆیە دەبینیت زۆرتر تەرکیزی لەسەر قورئانە. لێرەدایە کە مامۆستا ناصر دەفەرمووێت: بۆ بەیانی هەموو قورئان پێویستیمان بەشتێکی دیکە هەیە کە پێی دەووترێت فەرموودە ئیتر من ناڵێم سەحیحی بوخاری یان موسلیم...هتد، بەڵکو رەنگە کۆی ئەوانە بێت یان شتێکی دیکە بێت، بەڵام لانیکەم شتێك هەیە بێجگە لە قورئان کە ئەویش فەرموودەیە. لێرەوە لەو ریسالەیەدا کە بۆ زاناکانی کەنداوی نوسیووە{٨٦} و لە تەفسیرەکانیدا کە باسی زانستی فەرموودەی کردووە بەتایبەتی لە تەفسیری سورەتی (البقرة)دا و هەروەها لەو دوو کاسێتەشدا کە بەکورتی باسی زانستی فەرموودەی کردووە، لەهەموو ئەوانەدا چەند داهێنانێك لای ئەو دەبینیت، زۆرێك لەو بابەتانەی سوبحانی یەکلایی کردوونەتەوە بریتین لە بابەتی خیلافی، بەڵام ئەو بە ئیستیدلال توانیویەتی بیسەلمێنێت کە ئەم قسەیان راسترە لەوەی دیکەیان، لەوانە بۆ نموونە قسە هەیە لەسەر ئەوەی ئایا پێغەمبەری خودا (د.خ) مەعصوم بووە یان بەپێچەوانەوە؟! دیارە ئیجماع هەیە لەسەر ئەوەی کە پێغەمبەری خودا لە گەیاندنی وەحیدا مەعصوم بووە و هیچ شتێکی نەشاردۆتەوە، ئەوەی بۆی هاتووە گەیاندوویەتی. بەڵام ئایا لە ژیانی تایبەتی و شەخصی خۆیشیدا مەعصوم بووە یان نا؟ ئەوە قسەیەکە مامۆستا ناصر بەدەلیلی قورئانی و بەتەفسیرکردنی چەندین سورەتی وەکو (عبس)ە و ...هتد، دەیسەلمێنێت کە پێغەمبەری خودا (د.خ) لە غەیری وەحیدا مەعصوم نەبووە، بەڵکو

مەعصومیەتەکەی ئەو لە ریسالەکەیدایە. ئەوە ئەو تەرجیحەیە کە زاناکان گیریان خواردبوو پێیەوە بەلاّم سوبحانی توانی لە قورئانەوە ئەو مەسەلەیە یەکلایی بکاتەوە. کە لە قورئاندا وشەی (ذنب) دراوە پاڵ پێغەمبەری خودا (د.خ)، (ذنبك) کە ئەوە ئیتر بە راشکاوی قورئانە {٨٨} !.

یەکێکی دیکە لەو شتانەی بریتیە لەوەی کە وا دەردەکەوێت مامۆستا ناصر بەهۆی ئەوەی سیستەمی قورئانی لای ئەو سیستەمێکی کامڵە و مانای روونی خۆی تێدایە و (الراسخون فی العلم) دەتوانن ماناکە بدۆزنەوە و سیستەمەکەی کەشف بکەن، کەوابوو دەوری فەرموودە چیە؟ بەبۆچوونی من مامۆستا ناصر باوەڕی وایە کە کاری پێغەمبەر بریتیە لە گەیاندنی –تبلیغ– ئەو وەحیە نە روونکردنەوەی (بیان) کە ئەمە لە تەفسیری سورەتی (البقرة)دا زۆر بەجوانی دەردەکەوێت، کە دەفەرمووێت: ﴿... لتبینه للناس...﴾ بە مانای(بەیان) نەهاتووە، ئەوەی کە دەتوانم بڵێم لە صەدا نەوەد و نۆ و پۆینت نۆی موفەسیرەکان بۆ ئەوە رۆیشتوون، بەڵکو بەمانای (لتبلغه) بەکار هێنراوە. ئەمەش شتێکی ناوازە نیە چونکە وتمان مامۆستا ناصر زۆر تەرکیزی لەسەر زانستی زمانە کە بە دوو شت توانیویەتی ئەوە جیا بکاتەوە، بە زانستی زمان لەگەڵ لۆژیکی زمان، سوبحانی باوەڕی بە لۆژیکی زمانیش هەیە، ئەمەش شتێکی نوێ نیە، بۆ نموونە دابەشکردنی زمان بۆ (اسم) و (فعل) و (حرف) دابەشکردنێکی لۆژیکیە و مامۆستا ناصر خۆیشی باسی دەکات، هەروەها بە سیستەمی قورئانیش. پشت بەستنی بە لۆژیکی زمان بەو مانایەیە کە دەفەرمووێت ﴿لتبینه﴾ یاخود بەیان بۆ پێغەمبەری خودا لەو شوێنەدا یاخود لەباسی زاناکانی ئەهلی کیتابدا ﴿...لتبیننه للناس ولا تکتمونه...﴾{٨٩} بەیانی دەکەن بۆ خەڵکی و نایشارنەوە، ﴿لتبینه﴾ کەوتۆتە بەرامبەر ﴿لا تکتمونه﴾ کەواتە پێچەوانەی (کتمان)ە، پێچەوانەی کەتمانیش بەیان نیە نەشاردنەوەیە واتە (بلاغ)ە، کەواتە ئیشی فەرموودە لای مامۆستا ناصر بریتیە لە (بلاغ) واتە (عدم الکتمان)، ئەو هەموو (بیان)ەش کە لە قورئاندا هاتوون بە مانای (تبلیغ)ن چونکە قورئان خۆی ماناکەی روونە {٩٠}.

شتێکی دیکە لەم بوارەدا بریتیە لە سوودبینینی سوبحانی لە (ئیبن تەیمیە) لە مامەڵەکردنی نێوان (قورئان) و (سوننە)دا، بەتایبەتی لە فەرموودەکانی ئەحکام و ئایاتی ئەحکامدا، واتە ئەو ئایەت و فەرموودانەی بکە و مەکەیان تێدایە. لێرەدا وا

دەردەکەوێت کە مامۆستا ناصر قەناعەتی وایە زۆربەی ئایەتەکانی قورئان ڕێسای گشتی (القواعد العامه)یان تێدایە، پێغەمبەری خودا (د.خ) بەلاغەکەی بریتی بووە لەوەی نموونەیەکی پیشانداوە بۆ ئەو ڕێسا گشتیە، ئەوەی کە (ئیبن تەیمیە) لە (اصول التفسیر)دا باسی دەکات، دەفەرموویت لە لۆژیکدا دوو جۆر پێناسە هەیە، (تعریف بالتحدید) هەیە کە ڕێك بابەتەکەت بۆ دەهێنێتەوە، (تعریف بالتمثیل)یش هەیە کە نموونەیەکت بۆ دەهێنێتەوە. (تعریف بالتحدید) وەکو ئەوەی پرسیار بکەیت نان چیە؟، پێت بڵێن نان بریتیە لە ئاردی هاڕدراوی برژاو، واتە پێناسەیەکی ورد و سنوورداری ئەو شتەم کرد. بەلاّم لە (تعریف بالتمثیل)دا نانێکت پیشان دەدرێت، واتە ڕوونکردنەوەی پێناسەیەکە بە پیشاندانی نموونەیەك. مامۆستا ناصر قەناعەتی وایە کە فەرموودەکانی ئەحکام یاخود بەشی تشریع لە سوننەتی پێغەمبەری خودادا ئیشی بریتیە لە (تعریف بالتمثیل). ئەو ئایەتەی کە پیشانی ئەوە دەدات شەیتان چی دەکات بە بەندەکانی خودا؟ کە وایان لیَ دەکات بەوەی (تەغییر)ی خەلقی خودا بکەن{٩١}، (تەغییر)ی خەلقی خودا ڕێسایەکی گشتیە، لە فەرموودەشدا هاتووە وەك ئەوەی (عبداللەی کوڕی مسعود) -ڕەزای خودای لێبێت- دەیگێڕێتەوە کە بریتیە لە خاڵ کوتان و باریك کردنەوەی برۆ و دان و شاشکردن و ...هتد ئەمانە هەمووی نمونەی ئەو (تغییر)ەن ونموونەی ئەو ڕێسا گشتیەن، یاخود ئەو فەرموودەیەی دەربارەی سورەتی (الفاتحة) دەفەرموویت ﴿مغضوب علیهم﴾ بریتیە لە (یەهود) و ﴿الضالین﴾یش بریتیە لە (نەسارا)، لە ڕێسا گشتیەکە، چونکە لە قورئاندا ئەو وەصفانە بۆ جگە لە (یەهود و نەسارا)ش بەکارهاتووە، بەلاّم ئەوان تەنها نموونەیەکی ئەو بابەتەن، کە بە ڕاستی ئەمە دۆزینەوەیەکی زۆر گەورەیە، ئەگەر زیرەکی و بلیمەتی و مەخیلەی بەهێزی ئەو مامۆستا بەڕێز و مەلا کوردە (ناصری سوبحانی)نەبووایە، هەزاران ڕەحمەت لە گۆڕی، کەسێك نەبوو ئەمە پیشان بدات کە ئەو مامۆستایەکی گەورەی ئێمە بوو لەو بوارەدا{٩٢}.

یەکێکی دیکە لەو شتانەی لای سوبحانی هەیە لەم بوارەدا بریتیە لەو ڕوونکردنەوانەی کە بۆ زانا عەرەبەکانی کەنداو و ئەوانەی لەسەر ئەنسکلۆپیدیای سوننەت دەنووسن وەکو (دکتۆر یوسف قرضاوی)و...هتد کردوونی: نەکەن بارێك بدەن بەسەر سەحیحی بوخاری و موسلیمداکە شاخەکانیش بەرگەیان نەگرتبێت،

بوخاری ئەو کاتەی سەحیحەکەی دەنوسیەوە ئەگەر بیزانیایە دوای قورئان دەبێتە گەورەترین کتێبی موسوڵمانان هەر خۆی بۆ خۆی دوور نەبوو لە ترسا بمردایە! چونکە ئەو وێنای نەدەکرد ئەو کتێبەی هێندە گرنگ بێت. لەبەر ئەوە ناکرێت ئێمەش بارێك بدەین بەسەر ئەواندا کە لە توانای خۆیان گەورەترە و شاخەکانیش بەرگەیان نەگرتووە. مەبەست رەتکردنەوەی سەحیحی بوخاری و موسلیم و...هتد نیە، بەڵکو جەوهەری بابەتەکە ئەوەیە تۆ رێساکانت ئەوەندە دەرك کردبێت تەنانەت نەبەسترابێتەوە بە سەحیحی موسلیم و بوخاریەوە ئەگەرچی باشترین کتێبی فەرموودەشن{٩٣}.

یەکێکی دیکە لەو شتانەی کە مامۆستا ناصر زۆر تەرکیزی لەسەر کردووە و رەنگە هەموو زاناکانی فەرموودەناسی پێچەوانەی ئەو بن تەنها چەند کەسێکیان نەبێت وەك باقلانی و...هتد، ئەویش بابەتی (صحابە)یە. مامۆستا ناصر رێسایەکی هەیە کە لە بابەتی ئیمان و زانستی فەرموودە و (صحابە) و هەروەها زۆر بابەتی دیکەی وەکو (فەلسەفەی ئەخلاق)دا باسی دەکات، کە ئەمەش داهێنانی خۆی نیە بەڵکو ئەو تەوزیفی کردووەتەوە کە بریتیە لە بابەتی مەلەکە. مەلەکەش بریتیە لەو شتەی کە لەنێو مرۆڤدا هێندە رۆدەچێت کە ئیدی ناتوانێت وازی لێ بهێنێت. بەم باسی مەلەکەیەش تەفسیری زۆرێك لە فەرموودەکانی کردووە، هەروەها تەفسیری زۆر ئایەتی قورئانیشی پێکردووە، کە زۆر لە ئایەتەکانی باسی بەهەشت و جەهەننەمی بەهۆیەوە تەفسیر کردووە کە لە رووکەشدا وا دەردەکەوێت ناودژێتیەکان(التناقض) لە نێواندا ببێت. مەلەکە بوونی هەر سیفەتێکیش لای مرۆڤ بەو مانایەیە کە نەتوانێت وازی لێبهێنێت ئەگەرچی مەبەستیشی بێت وازی لێبهێنێت، وەکو سیفەتی خوێندەواری کە ناتوانین ئیدی نەخوێندەوار بین ئەگەرچی بشمانەوێت نەخوێندەوار بین. ئیمان کە بووە مەلەکە لای مرۆڤ ئیتر جارێکی دیکە ناتوانێت بێ ئیمان بێت وەکو فەرموودەکە دەفەرمووێت تەنانەت بیشیخەنە نێو ئاگرەوە وازی لێناهێنێت. بەڵام زۆرێك لە زانایانی فەرموودەناسی لەو باوەڕەدان کە (صحابە) بریتیە لەو کەسە باڵغەی کە جارێك پێغەمبەری خودای (د.خ) بینی بێت و موسوڵمان بوو بێت! کە سوبحانی قەناعەتی بەم بۆچوونە نیە، چۆن دەکرێت تەنها جارێك بینینی پێغەمبەری خودا (د.خ) مەلەکەی ئیمانی بەو مانایەی کە باسم کرد لەو کەسەدا دروست کرد بێت! کە دەشێت بڵێم دووبارە ئەمەش دەچێتەوە نێو

زانستی زمانەوانیەوە و پەیوەندی بە فەلسەفەی رەنەوە هەیە، بەتایبەتی لای فەیلەسوفی گەورەی ئۆتریشی –نەمساوی– (دیسوسیر)، کە جیاوازی دەکات لە نێوان (لغە) و (کەلام)دا{٩٤}، بۆ کەلام حەتمەن مەلەکە پێویستە، (لغە) بریتیە لەوەی کە دەتوانیت مانای وشەکان لە فەرهەنگ (قاموس)دا دەربهێنیت، بەلاّم (کەلام) بەوجۆرە نیە. بۆ نموونە دەکرێت وشەیەك لە فەرهەنگدا چەند مانایەکی ببێت یاخود بەپێچەوانەوە دەکرێت بۆ یەك مانا چەند وشەیەك بەکار هاتبێت، کەلام بریتیە لەوەی کە یەکێك لەو وشانە بەکار بهێنیت. کاتێك دەڵێم هاوڕێکەم زیرەکە، عاقڵە، دانایە، و...هتد، هەمووی یەك مانایە و لەوانەشە هەر کام لەو تەعبیرانە بەکار بهێنرێت ئەوە (لغە)یە کە دەکاتە کۆی هەموو تەعبیرەکان، بەلاّم کاتێك تەنها یەك دانەیان هەڵدەبژێریت ئەو کاتە دەبێتە (کەلام)، کەلام بێجگە لەوەش کە یەکێك لە وشە و تەعبیرە مومکینەکانی زمانی تێدا بەکار دەهێنرێت، پشتیش دەبەستێت بە زمانی هاوبەشی پێشووتری نێوان خۆت و بەرامبەر –مخاطب– بۆ نموونە من و تۆ شتی هاوبەش لە نێوانماندا هەیە و جار هەیە تەنها سەری وشەیەك دەڵێم لێم تێدەگەیت، چونکە زۆر مامەڵەمان بەیەکەوە هەیە بەلاّم کەسێکی دیکە تازە بووبێتە هاوڕێمان یان گوێگری ئێمە لێمان تێناگات، واتە جفرە و نهێنیەکی پێشتر لە کەلامدا دروست دەبێت کە گوێگر و وتەبێژ بەیەکەوە دەزانن ئەوە لە کوێوە دەوترێت ئەگەرچی مومکین نیە بیگەیەنیت بە گوێگرێك –مخاطب– کە هیچ پەیوەندیەك و مامەڵەیەکی پێشین لەنێوان ئەو و وتەبێژدا نەبێت، جگە لە ئەوەی دەووترێت، بۆ نمونە کاتێك ئەم رستەیە دەوترێت(ئەسپەکەم فرۆشت) واتە ئەو ئەسپەی پێشتر من و تۆ ئاگامان لێیەتی، لێرەوە بۆ ئەوەی کەلام دروست ببێت هەر دەبێت ژیانی هاوبەشی پێشتر ببێت، یاخود ئاگاداربوونێکی پێشین بۆ ئەو بابەتە بوو بێت. بۆیە مومکین نیە کەسێك یەکجار پێغەمبەری خودای (د.خ) بینی بێت و یەکسەر لە کەلامی حەزرەت تێگەیشتبێت، راستە لە عەرەبی تێدەگات وەکو (لغە)، تێدەگات لەوەی کاتێك پێغەمبەری خودا دەفەرمووێت (ابن آدم) واتە لە وشەکان تێدەگات بەلاّم لە کەلامەکە تێناگات. لێرەوە هەست دەکەیت مامۆستا ناصر زۆر ورد بووە بۆ ئەم بابەتە و زۆر بە وردیش بۆی چووە، لە بابەتی مەلەکەوە بۆ ئەمە رۆشتووە، هەر بۆیەش مومکین نیە کەسێك بەیەکجار بینینی پێغەمبەری خودا ببێتە (صحابە){٩٥}.

## سوبحانی و زانستەکانی قورئان:

(علوم القرآن)یش یەکێکە لەو زانستانەی کە وەکو فیلمێکی دۆکیۆمێنتی وان، قورئان چۆن دابەزیوە و پێغەمبەری خودا (د.خ) چۆن گەیاندوویەتی و هاوەڵانی چۆن وەریانگرتووە و مامەڵەیان لەگەڵدا کردووە و کاریگەری چۆن بووە و فلان ئایەت لەکوێدا دابەزیوە و کام سورەت لە مەککە و کامەشیان لە مەدینە دابەزیوە و...هتد، دەگرێتەوە، کە وامان لێدەکەن بچینەوە سەردەمی دابەزینی وەحی و خزمەتی پێغەمبەری خودا (د.خ) کە ئیمامی (سیوطی) دەفەرموێت زیاد لەشەش هەزار زانستە.

لێرەشدا مامۆستا ناصر تێڕوانینی تایبەتی خۆی هەیە بەرامبەر ئەم زانستە قورئانیانە، کە هەندێك لەو تێڕوانینانە لای خەڵکی دیکەش هەن. بۆ نموونە دەربارەی (ناسخ و منسوخ) واتە نەسخ بوونەوەی حوکمێکی پێشین بە حوکمێکی دواتر لەبەر هۆکارێك، هەرچەندە سوبحانی و زۆرێکی دیکەی وەکو موعتەزیلە و برێك لە ئەهلی سوننە و جەماعە و تەنانەت (محمد غزالی) و (صوبحی صالح) و زۆرێك لە بیریارە نوێکانی سەردەمی نوێش پێیان وایە کە (نەسخ) بوونی نیە، بەڵام بە بۆچوونی من بەهێزی مامۆستا ناصر لە رەسەن بوون و ئیستدلال هێنانەوەکەیایەتی کە پیشانی دەدات ئایەتە مەنسوخەکانیش دەکرێت جارێکی دیکە رۆڵی خۆیان ببیننەوە، چونکە قورئان مۆزەخانەیەك نیە شتی کۆنی تێدا پارێزراو بێت و بڕابێتەوە! کە ئەم تەعبیرە تەعبیری (محمد غزالی)یە. لێرەدا مامۆستا ناصر دەفەرموێت جارێ پێش هەموو شتێك نەسخ لە (تصدیقات)دا نیە، کە زانستی لۆژیك دابەش دەبێت بەسەر (تصدیق) و (تصور)دا، تصور بریتیە لە حوکمدانە پاڵ (تصور)ەکان، واتە (تصدیق) پێویستی بە (تصور)یشە، بەڵام مەرج نیە هەموو وێنایەك تەصدیقی تێدا بێت، بۆیە (تصدیق) شتێکی گەورەترە، بۆیە سوبحانی دەفەرموێت لە (تصدیقات)دا نەسخ نیە، وەك ئەوەی کە خودا بفەرموێت: ئەمە زەویە و سبەینێ بڵێت ئەمە زەوی نیە! کە ئەوە درۆ دەردەچێت، بەڵکو نەسخ تەنها لە ئینشائیاتدا هەیە، گەر بە زمانێکی سادەتر بڵێم لە رستەی خەبەریدا نەسخ نیە، کە زۆر لە زاناکان لەم بابەتەدا تێکەوتوون بەوەی کە هاتوون لە رستە خەبەریەکانیشدا نەسخیان کردووە، بەڵام سوبحانی دەڵێت نەخێر، ئەمە لە ئینشائیاتدایە، چونکە لە ئینشائیاتدا درۆ دروست

نابێت کە من بڵێم فلان کەس! لە کاتژمێر ئەوەندەدا وەرە بۆ ماڵی ئێمە بۆ ئیشێکی دیاریکراو، بەلام دوای ئەوە کاتێکی دیکە دەستنیشان دەکەین و دەڵێم بڕۆرەوە، لێرەدا هیچ دژایەتیەك نیە لە نێوان ئەم (وەرە) و (بڕۆرەوە)یەدا نیە، چونکە ئەوە لە ئینشائیات —دانانی—دایە. ئەگەر لە (تصدیقات)دا بوایە کە بۆ نموونە ئەوە فلان کەسە و بم وتایە ئەوە فلانە کەس نیە هەڵە دەردەچوو، لێرەوە کەواتە نەسخ لە ئینشائیات دایە و لە ئینشائیاتیشدا بە گوێرەی پێویستیە، کە سوبحانی خۆی نموونە بە منداڵێك دەهێنێتەوە کە کاتێك ئەم منداڵە لە دایك دەبێت پێویستی بەجۆرێك لە خۆراکە پێی بدرێت کە شیری دایکیەتی، پاشان لەگەڵ گەشەی منداڵەکەدا جۆری خۆراکەکەشی دەگۆڕێت، بۆیە شیرەکە نەسخ دەبێتەوە بە خۆراکێکی دیکە. واتە بەو مانایە نیە کە ئەوەی پێشوو هیچ دەورێکی نەبوو بێت یان رۆڵی نامێنێت. واتە نەسخ لای سوبحانی سەرەڕای ئەوەی کە دەبێت لە ئینشائیاتدا بکرێت ئەوا دەبێت بەپێی پێویستیش بێت. کە ئەم وتەیە زۆر هەڵدەگرێت و خۆی چەند نەوار و کاسێتێکی لەسەر ئەم بابەتە هەیە{٩٦}.

بەشێکی دیکە لە داهێنانەکانی لە (علوم القرآن)دا بریتیە لە بابەتی (اسباب النزول) کە لەمەشدا ئیختیلاف هەیە لە نێوان زانایاندا، یەکێك دەڵێت سی دانەیان راستن و یەکێکی دیکەش دەڵێت هیچیان راست نین و ...هتد، بەلام سوبحانی دێت میتۆدێکی نوێ دەدۆزێتەوە بۆ کەشفی (اسباب النزول) دەفەرموێت هۆکاری هاتنەخوارەوە لە خودی ئایەتەکەدا روونە و بەیانکراوە، کە ئەمە میتۆدێکە پێش ئەو کەس بۆی نەچووە، واتە کەشفکردنی هۆکاری دابەزینەکە بەخودی ئایەتەکە. بۆ نموونە لە ئایەتی نۆی سورەتی (الجمعة)دا ﴿... و ترکوك قائما قل ما عندالله خیر...﴾ کە دەفەرموێت هەر خودی ئایەتەکە خۆی هۆی دابەزینەکەشمان بۆ بەیان دەکات، واتە حاڵەتێکی لەو شێوەیە بووە، کاتێك پێغەمبەری خودا (د.خ) وتاری جومعەی داوە موسڵمانە ئامادەکانیش بازرگانێکیان بینیوە و چوون بەلای ئەو و پێغەمبەریان بەجێهێڵاوە چونکە ساڵی گرانی بووە، کەوا بوو بابەتەکە لە ئایەتەکەدا دەردەکەوێت، واتە ئەو هۆکاری دابەزینانە(اسباب النزول) لای سوبحانی باشتر و پەسەندترن کە لە خودی ئایەتەکاندا روونن و دەتوانیت بیاندۆزیتەوە{٩٧}.

دواجاریش بینا لەسەر ئەو رێسایەی کە ئەو هەمیشە ئیشی لەسەر کردوە کە لە قورئاندا شتێك نیە بە بەیان نەکراوی هێڵرابێتەوە.

یەکێکی دیکە لەو شتانەی سەبارەت بە (علوم القرآن) لای سوبحانی بوونی هەیە بریتیە لە ناوەحی بوونی زانستە قورئانیەکان، بەڵکو بوونی ئەو زانستانە لای ئەو بۆ پیشاندانی حاڵەتەکانی وەحیە، پەیوەندی بە ئامادەبوون و نا ئامادەبوونەوە هەیە لەو سەردەمەدا. بۆ نموونە ئێمە ئەو هەموو (علوم القرآن)ە دەخوێنین بۆ ئەوەی بۆمان دەربکەوێت کام سورەت و ئایەتانە مەککی بوون و کامانەش مەدەنی بوون، بەلاّم کابرایەکی نەخوێندەواری عەرەب کە لەو کاتەدا ژیاوە ئەگەر لە مەدینە یاخود لە مەککەدا بوو بێت هەر لەو کاتەدا ئاگاداری ئەوە بووە کە لە کوێدا دابەزیوە. لەبەر ئەوە ئێمە هەرچەندە بلیمەت بین --کە ئەمە بۆ زانستی فەرموودەش بە هەمان شێوەیە لای سوبحانی– ئەوا هێشتا هێندەی ئەعرابیەکی ئەو سەردەمەی لێنازانین، کە لە بنەڕەتیشدا هەر خوێندەواری و رۆشنبیریشی نەبووە، هی وایان بووە ئێخەی پێغەمبەری خودای گرتووە و ئەوەندە توند گوشیویەتی هەتا شان و لاملی سور بووەتەوە. واتە (علوم القرآن) بۆ ئەوەیە ئێمە بەرێتەوە ئەو زەمەنە، بەلاّم ئەو کەسەی لەو زەمەنەدا ژیاوە ئەگەرچی لە رووی ئیمانیشەوە لە ئێمە لاوازتر بوو بێت، لەبنەڕەتدا دەکرێت مونافیقیش بوو بێت و ئیمانیشی بە قورئان نەبوو بێت هێشتا دەکرێت لە ئێمە زیاتر لێی بزانێت چونکە پەیوەندی بە حالاّتی ئیمانیەوە نیە، بەڵکو حاڵەتی دەرەکین. هەروەها زانستی فەرموودەش ئێمە بۆیە دەیخوێنین هەتا بۆمان دەربکەوێت ئایا ئەم وتەیە وتەی پێغەمبەرە و ئەو فەرموویەتی، بەلاّم کابرایەکی دەشتەکی لەو کاتەدا بگرە راستەوخۆ لە زاری پێغەمبەرەوە بیستوویەتی{٩٨}.

## سوبحانی و زانستە مرۆڤایەتیەکان:

ئێستا بێینە سەر باسکردنی ئەو شتانەی کە بەدیاریکراوی سوبحانی قسەی لەسەر کردوون یاخود ویستوویەتی سیستەمەکانیان کەشف بکات و دەکرێت بکرێنە بناغەی زانستە مرۆڤایەتیەکان لەم سەردەمەدا. کە باشترینیان بابەتی پەروەردەیە و من لە شوێنێکی دیکەدا ئاماژەم پێداوە کە دەکرێت سوبحانی بە فەیلەسوفی پەروەردە ناوببرێت، بە تایبەتیش چەمکی تەزکیە لای ئەو، کە لەمەشدا سوودی لە بۆچوونی سیستەمی فیکری و فەلسەفی یۆنانی بینیوە کە دواتر لە لایەن فەیلەسوفە موسوڵمانەکانەوە تەوزیف کراوەتەوە، ئەوەی کە هیچکام لە چاکەکانی ئێمە بایی ئەوە نین ئێمە بخەنە بەهەشتەوە. کە ئەمە رێسایەکە و لە زۆرێک بابەت و کاسێتیدا

کاری لەسەر کردووە، بەلاّم ئەم چاکانە (بالقوة) لەنێو ئێمەدا هەن و دەبێت بگوێزرێتەوە بۆ (بالفعل)، واتە لە تواناوە بۆ بەکردەیی بوونیان. ئەو نموونەی گوێزێکی بچوک دەهێنێتەوە کە وەکو تۆوێك نموونەی دارگوێزێکی گەورەی لەنێودا شاراوەیە —بۆ نموونە لە نەوەدەکاندا دارگوێزێك لە شاری توسرکان لە ئێران صەدوشەست هەزار گوێزی گرتبوو!— بەلاّم دەبێت ئەم وزەیە ببزوێنرێت، ئەمەشە چەمکی (تزکیە) لای سوبحانی، گەشەپێدانی توانا لەهێزدا بووەکان (بالقوة)و جولاّندنیان روەو کردار(بالفعل). ئەم گوێزە خۆی بەتەنهایی بەس نیە بۆ ئەوەی ببێتە ئەو درەختە گەورەیە، بەلّکو پێویستی بە زەمینە بۆسازکردن هەیە. واتە کەمترین کار دەکەوێتە سەرخودی خۆی بەلاّم دەبێت بیکات. ئێمەیش بۆ ئەوەی (تەزکیەی نەفس)ی خۆمان بکەین و گەشە بکەین تەنها ئیرادەی خۆمان بەس نیە، بەلّکو لەم نێوانەدا لەوانەیە ئیرادە بچووکترین بەشی هەیە، ئەو پاداشتەی لە بەهەشتدا دەماندرێتیّ صەد بەرامبەری ئەو بزوت و جولاّنەی ئێمەیە کە لە دونیادا ئەنجامماندان داون، ئەو دەستکەوتەی لەصەدوشەست هەزار گوێزدا بۆ دارگوێزێك دەستی جوتیارێك دەکەوێت، سەری سوڕ دەمێنێت کە ئەو هەموو بەرەی هەیە، هەمووی دەستکەوتی ئەو کردەوەیە نیە کە کردوویەتی، تۆوێکی بچووك چۆن ئەو هەموو بەرەی تێدایە! کەواتە مەشیئەتی ئیلاهی لەم بابەتەدا بوونی هەیە{٩٩}.

لێرەوە ئەگەر سیستەمی فیکری مۆدێرنە بەوجۆرە دروست بوویێت کە هۆکار حەتمەن دەرەنجام بە دووی خۆیدا بهێنێت، حەتمەن دەرمان چارەسەر بەشوێن خۆیدا بهێنێت کە زانستی پزیشکی نویّ لەسەر ئەوە بونیات نراوە، ئەوا سوبحانی قەناعەتی وەهایە ئەوە بەتەنها بەس نیە، بەلّکو ئەوە لایەنە بچوکەکەیەتی، واتە ئەگەر لە مۆدێرنەدا راستەهێلّێك بوونی ببێت لە هۆوە بۆ دەرەنجام ئەوا لای ئەو ئەم راستەهێلّە دەبێتە سێگۆشەیەك و دەبێت مەشیئەتی ئیلاهیشی لە پشتەوە بێت، کە ئەم بابەتە زۆرتر لە باسی شەفاعەتدا رۆشن دەبێتەوە. لێرەوە بەبڕوای سوبحانی سیستەمی پەروەردە بەشێکی لای ئێمەیە بەوەی وزە و تواناکانی خۆمان دەبزوێنین بەرەو گەشەکردن و بەکردار بوونیان، بەشێکیشی ئەوەی کە لەدەست ئێمەدا نیە و (تەوەککول)ە لەسەر خودا دوای ئەوەی کە ئیشی خۆمانمان لەو بەشەدا کە پەیوەندی بە ئێمەوە هەیە کردووە{١٠٠}. ئەمەش بڕبڕەی فەلسەفەی پەروەردەیە

لای مامۆستا ناصری سوبحانی کە ئەگەر زیاتر لەسەری بڕۆین ئەوا زۆر درێژە دەکێشێت بۆیە لێرەدا هێندە بەسە.

دێینەوە سەر سیستەمی سیاسی لای مامۆستا ناصر کە هەروەکو سیستەمەکانی دیکە لای ئەو لە نموونەی سیستەمی فەتوا و سیستەمی ئابووری...هتد، بینای ئەم سیستەمەشی لەسەر جیهانبینی ئیسلامی دارشتووە، لە ریسای (...الا له الخلق والامر...)ەوە دێت باسی سیستەمە سیاسیەکە دەکات. دوای ئەوەی زەوی دروست بووە و ئەمرەکەشی ئاوەدان بوونەوەیە و ئەم ئەمری عیمارەتەش دراوەتە دەست مرۆڤ و مرۆڤیش خۆی بۆ خۆی هەم خەلقی هەیە بەوەی کە دروست بووە و لە پاڵ ئەمەشدا دەبێت ئەمرێکیشی بێت کە بزانێت چۆن ئەرکی خۆی جێبەجێ دەکات، لێرەشدایە بۆ ئەوەی ئەمری زەوی جێبەجێ بکات دەبێت ببێتە خەلیفەی خودا لەسەر زەویدا، هەروەها خودی مرۆڤیش کە دروستکراوە ئەمرێکی خۆیشی هەیە بۆ ئەوەی ئەمری گونجاوی خۆی لەگەڵ خیلقەتیدا جێبەجێ بکات{١٠١}، بۆیە لێرەدایە کە شەریعەت دێتە ناوەوە و سیستەمی سیاسی ئیسلامی لەم پنتەوە دەست پێدەکات بۆ پیشاندانی ئەو ئەرکە شەرعیە لای مرۆڤ، دیارە مامۆستا ناصری سوبحانی شارەزاییەکی زۆری لە سیستەمە سیاسیەکانی دیکەدا هەبووە و خوێندنەوە و بەدواچوونێکی زۆری بووە، ئەگەرچی هەموو خوێندکارەکانی پێچەوانەی ئەمە بڵێن، چونکە سوبحانی زۆرباش لە یاسا شارەزا بووە، زۆرباش لە سیستەمە سیاسی و سیستەمە فیکریەکانی دیکە شارەزا بووە، ئینجا دووایی هاتووە ئەمەی وروژاندووە -ئەمەش وەکو زانستی هیرمەنیوتیکا (تەئویل)، وروژاندنی مەعریفەیەکی نوێ بەبێ بوونی مەعریفەیەکی پێشین مومکین نیە چونکە مەعریفە شوناسێکی بە کۆمەڵی هەیە- کە مامۆستا ناصریش پێغەمبەر نەبووە، حەتمەن مەعریفەی وەرگرتووە، تەنانەت رەخنەی گەورە لە سیستەمە فیکری و سیاسیەکان دەگرێت، وەك لە دابەشبوونی هێزەکاندا، هێزی یاسادانان و هێزی داد و هێزی جێبەجێکردن.. سوبحانی رەخنەی لەم بابەتە هەیە لەباسی سیستەمە سیاسیەکەیدا کە بە بۆچوونی من رەخنەیەکی زۆر بەجێ و وردیشە. ئەمەش زۆرتر لەو رەخنانەیدا دەردەکەوێت کە لە دەستووری ئێرانی گرتووە. دەڵێت ئێوە وتووتانە هێزی یاسا دانانمان(تەشریعی) هەیە لەگەڵ دوو هێزەکەی تردا، لەکاتێکدا ئێمە لە ئیسلامدا دەسەڵاتی تەشریعیمان نیە چونکە شەرع خودا دایدەنێت بەڵکو

لەجێی ئەوەدا دەسەلاتی (روونکردنەوە-تبین)یمان هەیە، واتە پێچەوانەی هەموو یاساناسەکان ئەو دێت تیۆریایەکی نوێ لەو بوارەدا دەهێنێتە ناوەوە. واتە لە کۆمەڵگەیەکی ئایینیدا یاخود دیموکراسی- ئایینیدا، کە ئەم دووانەش هیچ نادژێتیەك (تناقض) لەنێوانیاندا نیە و هەروەك لە شوێنی دیکەشدا ئاماژەم پێکردووە کە دەکرێت پێکەوە کۆ بکرێنەوە، کە هێزەکان بریتین لەهێزی تەبیین - واتە کەشفی ئەوەی کە خودا چی پێ خۆشە لەم بابەتەدا نەك تەشریع بکەیت- لەگەڵ هێزی دادوەری و جێبەجێکردن کە ئەمە خاڵێکی زۆر وردە مامۆستا ناصر توانیویەتی کەشفی بکات. کە سوبحانی یەکێك لە رەخنەگرە زۆرباشەکانی دەستووری ئێرانی بووە، دید و بۆچوونەکانی سەبارەت بەدەستوور و دەستوور نووسین لە ولاتە رۆژهەلاتیەکاندا، دەبێت بەهەند بگیرێن، بەداخەوە ئەو نووسینانەی لەسەرەتای دارشتنی دەستووری ئێرانیدا لە رۆژنامەکانی (کیهان) و (اطلاعات) و...هتد، بلاوی کردوونەتەوە لەبەردەستماندا نین، ئەگەر بکرایە دەستمان بکەوتنایە زۆرباش بوو بۆ زیاتر روون بوونەوەی بۆچوونەکانی لەم بوارەدا{١٠٣}.

هەروەها یەکێکی دیکە لەو شتانە بریتیە لەو خیلافەی لە نێوان زانایاندا هەیە کەئایا (شورا) واجیبە یان واجیب نیە، ئەو بە یەقینەوە دەیسەلمێنێت کە شورا واجیبە و ئەو بابەتە یەکلایی دەکاتەوە، پاشانیش شورا دابەش دەکات بۆ شورای تەخەصوصی و شورای سیاسی و شورای خەڵکی (الناس)، تەنانەت هەندێك برگەی ونی نێو مێژووی ئیسلامی پێدەدۆزرێتەوە، کە من لە بابەتێکی دیکەی سەربەخۆدا باسی ئەوەم کردووە، لەو شوێنانەی نێو مێژووی ئیسلامیدا کەوا دەردەکەوێت (شورا) نەبوو بێت لەنێو هاوەلاندا، ئەو دەیسەلمێنێت کە بووە ، چونکە واجیبە و مومکینیش نیە هەموو کۆمەڵی موسوڵمانان لە ئەمری خودا دەربچن، کە دەکرێت تاکە کەسێك ببێت لەو ئەمرە دەربچێت، بەلام ناکرێت هەموویان لەو ئەمرە دەربچن، کەواتە لەو کاتەدا شورایەك بووە بەلام مێژوو نەیگێراوەتەوە. ئەوەندە سورە لەسەر ئەوەی کە شورا واجیبە، ئەمەش دەبێت بەیەکێکی دیکە لە خاڵە گرنگەکانی فیکری سوبحانی بنووسرێت. هەروەها بەلای ئەوەوە دەبێت ئەندامانی شورا موجتەهید بن، موجتەهیدیش بەلای سوبحانیەوە بەو مانایە نیە کە پێشتر وتراوە شارەزا بێت لە (علوم الآلة)، بەڵکو تەنانەت بەتەنها شارەزابوونی لە شەرعیش نایکاتە موجتەهید بەڵکو دەبێت تایبەتمەند و شارەزاش بێت لە یەکێك لە بوارەکانی وەکو یاسا،

ئـابووری، کۆمەڵناسـی، دەروونناسـی؛ و...هتـد دا؛ ئینجـا بـە موجتەهیـد دێتـە هەژمـاردەن {١٠٦}.

خاڵێکی دیکە لەم بابەتەدا بریتیە لە (اطاعة أولی الأمر) کـە ئەمـەش لـە جوانترین داهێنانـەکانی سـوبحانیە و یەکێکیـشە لـەو بابەتانـەی کـە زۆر گرفتـی بـۆ ئـەو دروسـتکردووە لـە ئێرانـدا و تەنانـەت یـەکێك بـووە لـەو شـتانەی کە بـووە مایـەی شەهیدکردنی.

ئەری جاریَ لـە بنەڕەتـدا (اولی الأمـر) کـێن؟ ئەمـەش دەرەنجامی نووسینی کتێبی (الولایة و الامامة) بوو کە نوسخەی بۆ سەرۆك کۆمـاری ئـەو کاتـەی ئێران و زۆربـەی مـەلا و زانـا ورۆشـنبیر و ئاخونـدەکانی ئـەهلی تەشـەیوعی نـاردبوو و زۆربەشیان مـەدحیان کردبـوو، کـە یـەکێك لـەو کەسانەی بینیویـەتی و دوای ئـەوە نامـەی بۆ سوبحانی نووسیوە (عبدالکریم سروش) بووە {١٠٧}.

سوبحانی لەو کتێبەدا و لە باسی سیستەمە سیاسیەکەشیدا دەفەرمووێت بـەر لـە هەموو شـتێك گوێڕایـەڵی (أولی الأمـر) واجیـب نیـە ئەگـەر هـاتوو پێـچەوانەی شـەرع جوڵاوەوە و مەرجیش نیە لە هەموو شتێکدا گوێڕاڵیان بکرێت، تەنانەت جیاوازی ئـەو (عطف)ەش دەکات کە لە ئایەتی ﴿أطیعوا الله و أطیعوا الرسول و أولی الأمـر مـنكم﴾ دەبیبـنین کـە عـەتفی (أولی الأمـر) کـراوە بـەبێ دووبارەبوونـەوەی (اطیعـوا)، کـە پیشاندەری ئەوەیە (اطاعـة)ی خـودا و پێغەمبـەری خـودا ئیلزامیـە، بـەلام ئیتاعـەی (أولی الأمر) ئیلزامـی نیـە، بـەڵکو مەرجـدارە کـە لـە کتێبی (الولایـة و الامامـة)دا بـە فراوانی و بەهەردوو زمانی فارسی و عەرەبیش باسی ئەم بابەتەی کردووە کە گیـانی خۆیشی لە پێناو بابەتەدا دانا، بۆیە ئەمە یەکێکە لەو خاڵانـەی کـە گـەلی کوردستان دەبێت شانازی پێوە بکات، ئاخر کـێ لـە رۆشـنبیر و لێکۆڵـەرەکانی ئێمـە ئامادەیـە لـەپێناو لێکۆڵینـەوە و بەدواچـوونێکی خۆیـدا بـۆ کەشـفی هەقیقـەتێك گیـانی خـۆی لەدەسـت بـدات! بەڕاسـتی ئەمـە گەورەییـە بـۆ مامۆسـتایەکی ئـایینی کـورد وەکـو ناصـری سـوبحانی، بێگومـان قـسەکردن لەسـەر سیـستەمی سیاسـی لای ناصـری سـوبحانی قـسەی زۆر هەڵـدەگرێت و خوێندنەوەیـەکی گـەورە و فراوانـی پێویـستە، بەلام لێرەدا هەر ئەوەندە مەبەستمە ئاماژە بەهەندێك خاڵی زەق و گرنگ بدەم بۆیـە زۆر بـەکورتی و پوختی بەسەریدا رادەبوورم.

یه‌كێكی دیكه له‌و شتانه بریتییه له‌وه‌ی سیاسه‌ت ته‌نها تایبه‌ت نیه به سیاسه‌تكاره‌كانه‌وه له فیكری سیاسی ناصری سوبحانید، كه ئه‌مه خاڵێكه كه‌متر خه‌ڵكی دیكه ئاماژه‌یان پێكردووه یان ده‌ركیان نه‌كردووه. ده‌شێت بڵێین هۆشیاری سیاسی له ڕێسای «الامر بالمعروف و النهی عن المنكر»ه‌وه ده‌ست پێده‌كات، وه‌ك له ته‌فسیری سوبحانیدا بۆ ئه‌و ئایه‌ته ده‌رده‌كه‌وێت كه هه‌ر ده‌بێت كۆمه‌ڵێك بن له‌نێو كۆمه‌ڵگه‌دا فه‌رمان به‌چاكه و نه‌هی له خراپه بكه‌ن، ده‌بێت هه‌ڵه‌كانی نێو كۆمه‌ڵگه ڕاست بكه‌نه‌وه، ده‌ستی ده‌سه‌ڵات بگرن نه‌هێڵن سنووره‌كانی خۆی تێپه‌ڕێنێت و مافی خه‌ڵكی بخوات: هوشیار بن له‌نێو كۆمه‌ڵگه‌دا بینا له‌سه‌ر ڕیسای «...ولتكن منكم امه یدعون الی الخیر و یأمرون بالمعروف و یتهون من المنكر و اولئك هم المفلحون» كه زۆربه‌ی موفه‌سیره‌كان ئه‌و (من)یان له ته‌عبیری (ولتكن منكم امة) دا به (من البعضیه) لێكداوه‌ته‌وه و ئه‌ژماریان كردووه، به‌لأم لای سوبحانی بریتی نیه له (من البعضیه) به‌و مانایه‌ی له‌نێو ئێوه‌دا كۆمه‌ڵێك ببن وا بكه‌ن، به‌ڵكو ئه‌و (من)ه بریتیه له (من البیانیه) واته ئێوه ببن به (امة)یه‌ك هه‌مووتان به‌و كاره هه‌ڵسن{١١٠}، ئه‌مه‌شه ئه‌و ئیدیعایه‌ی من ده‌یكه‌م كه ده‌مه‌وێت دیموكراسی لای كۆمه‌ڵگه بێت نه لای ده‌سه‌ڵات، لێره‌شدایه كه سوبحانی كۆمه‌ڵی تێپه‌ڕاندووه و چووه به‌ره‌و كۆمه‌ڵگه، واته هه‌موو كۆمه‌ڵگه وای لێبێت ئه‌مر به مه‌عروف و نه‌هی له مونكه‌ر بكات. ئه‌و هوشیاریه‌یان تێدا دروست ببێت كه تاكه زامنی دروست نه‌بوونی سته‌مكاریش بریتییه له‌وه‌ی هه‌موو گه‌ل ئه‌و هه‌سته‌یان تێدا بێت، دوباره ئه‌م هه‌مه‌كیه‌ش (كلی) گشتێكی (فی الجملة)یه نه‌ك (بالجملة) —كه دواتر لای كاك ئه‌حمه‌د باس له‌م زاراوه‌یه ده‌كه‌م كه له باسی دیاله‌كتیكی ئیسلامیدا به‌م دوو چه‌مكه ڕه‌خنه‌ی له هیگڵ گرتووه. كه ده‌ووترێت (بالجملة) واته یه‌كه یه‌كه‌ی كۆمه‌ڵگه ئه‌و هوشیاریه‌ی ببێت، بۆیه لێره‌دا كه ده‌ڵێین كۆمه‌ڵگه به‌مانای (بالجملة) نیه كه شێته‌كانی كۆمه‌ڵگه‌ش ئه‌و هۆشیاریه‌یان هه‌بێت، به‌ڵكو به مانای (في الجملة)یه كه دۆخی باو به‌وجۆره‌یه. بۆیه ئه‌و (من)ه له ته‌عبیری «...ولتكن منكم امة...»دا (من)ێكی (فی الجملة)یه. لێره‌دا ده‌توانم ئه‌وه‌ش بڵێم كه مامۆستا ناصر بنه‌مای زۆرێك له فیكره‌كانی خۆی له سیسته‌مه سیاسیه‌كه‌یدا له كاك ئه‌حمه‌ده‌وه وه‌رگرتووه، به‌لأم له ته‌وزیف كردنه‌وه‌یاندا سوبحانی ئوسوڵیانه‌تر مامه‌ڵه‌ی كردووه و زیاتر هه‌وڵی داوه له قورئاندا كه‌شفی ئه‌م بابه‌تانه بكات. كاتێك كاك ئه‌حمه‌د دێت

(شوری) لەبەرامبەر ئیمامەی ئەهلی تەشەیوعدا دادەنێت{١١٢} هەر هەمان فیکرە کە مامۆستا ناصر لە سیستەمی سیاسیدا تەوزیفی کردووە، بەلاّم ئەوەی موفتیزادە وەکو ئەوەی لای سوبحانی بەلّگەدار و سیستەماتیزەکراو نیە. لە زۆربەی شتەکانی دیکەشدا بەوجۆرەیە کە سوبحانی هاتووە فیکرەکانی کاك ئەحمەدی گەورە کردووە و فراوانتر و (مستدل)تر پیشانی داون.

هەروەها سیستەمی ئابووریش لای سوبحانی تایبەتمەندی خۆی هەیە و گەلێك شتی جوانیشی لەو بوارەدا وروژاندووە. یەکێك لە تایبەتمەندیەکانی دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە بەشێکە لەو کۆمەڵە بابەت و کاسێتانەی کە لە سەرەتاوە تۆمارکراون، ئەو قۆناغەی کە هێشتا سوبحانی بەتەواوی لە قۆناغی مەعریفەی دەرەوە ئاییینیەوە نەیگواستۆتەوە بۆ نێو مەعریفەی ئاینی و قورئان، کاتێك گوێ لە کاسێتەکانی باسی سیستەمی ئابووری دەگریت هەست دەکەیت مەعریفەی دەرەوە ئایینی زۆر ئامادەیی هەیە، تەنانەت ئەو سیستەمە ئابووری و سیاسیانەی لەوێ باسیان دەکات لە نموونەی لیبرالیزم و سۆشیالیزم و سۆشیالیزمی پلەبەند (سۆشیال دیموکرات) و هەروەها نازیەت و فاشیەت و... لەمانەوە بۆت دەردەکەوێت کە مامۆستا ناصر ئەهلی خوێندنەوە و بەدواداچوون بووە لەدەرەوەی ئاییندا. ئاخر سوبحانی لەو قۆناغەدا کە بەتەواوی لەنێو قورئاندایە شەرحی وشەکانتی قورئان بە کوردی و فارسی ناکات بەڵکو لە خودی سیستەمە قورئانیەکەدا ماناکانیان روون دەکاتەوە، یان لانی کەم وشەیەکی لە (راغبی ئەصفەهانی)یەوە دەهێنێت و دوایی لە قورئاندا ئیستیدلالیان بۆ دەکات، بەلاّم لە سیستەمی ئابووریەکەیدا هەست دەکەیت ماناکان بە کوردی و فارسی دەکات{١١٣}، واتە هێشتا ئەو شۆڕشە گەورەیەی بەسەردا نەهاتووە کە لە دوای نووسینی کتێبی (الولاية و الامامة)وە روویدا. لەگەڵ ئەوەشدا هەمان بونیادی فیکری دواتر لە ساڵی پێش گیرانیدا دوبارەی کردۆتەوە، بۆ نموونە لە تەفسیرەکانیدا کە باسی زەکات دەکات هەمان فیکرە کە لە سیستەمی ئابووریدا باسی کردووە. هەروەها لە شەرحی (الاربعين النووی)دا کە باسی زەکات دەکات دووبارە هەر هەمان فیکرە کە لە سیستەمی ئابووریەکەیدا باسی کردووە{١١٤}، لێرەشدا بوونی هەیە. ئێستا باسی ئەوە ناکەم کە بنەماکانی فیکری ئابووری لای ناصری سوبحانی چین کە لە کاسێتەکانیدا باسی کردوون، بەلاّم دەمەوێت ئاماژە بەچەند خاڵێك بکەم کە دەکرێت لەکۆی باسی سیستەمە ئابووریەکەوە دەربهێنرێت،

دەتوانین بڵێین سوبحانی لێرەدا بەپێچەوانەی زۆربەی مەزهەبەکان مامەڵەی کردووە، کە فیکرەیەکی هێناوە رەنگە لای (المذهب الظاهر)ی (ئیبن حەزم) بوونی هەبێت کە دەتوانم بڵێم لە نێوان ئەم مەزهەبە و فیکری سوبحانیدا نزیکیەکی زۆرباش هەیە، ئەمەش بانگەشەیەکە دەکرێت بە بەڵگەوە قسەی زیاتری لەسەر بکەین بەلأم لێرەدا بواری ئەوە نیە، ئەوەش بڵێم (ظاهری) لێرەدا بەو مانایە نیە کە تەنها رووکەشی وشەکان ببینیت، بەڵکو بە مانای (تاك مانایی)ەکەی کە باسمان کرد، بۆ نموونە (المذهب ظاهری) دەڵێت ئەم ئایەتە ئەوە ماناکەیەتی، ئەم فەرموودەیە ئەوە ماناکەیەتی ئیتر هەرچیەك باس نەکرابێت ئەوا بۆشاییەك هەیە لەو شتەدا و بریتیە لە ناوچەی (العفو)، خودای گەورە بواری هێشتۆتەوە بۆ تۆی موسوڵمان، هەر لەبەر ئەوەش ناونراوە (الظاهری).

یەکێك لە خاڵەکان لە سیستەمی ئابووری سوبحانیدا بریتیە لە یەکخستنەوەی سیستەمی زەکات لەگەڵ سیستەمی ئابووری ئیسلامیدا، ئەوەندەی من بەدوادا چوونم بووبێت فیکری ئیسلامی لە سەدەی بیستدا زەکات بەبەشێك لە سیستەمی ئابووری ئیسلامی دادەنێت، تەنانەت لە کتێبی (فقه الزکاة)ی (یوسف القرضاوی)یشدا بەوجۆرەیە کە بە رای (ابو اعلای مودودی) باشترین کتێبێکە لەسەدەی بیستدا لەسەر زەکات نووسرا بێت. بەلأم ناصری سوبحانی لەباسی سیستەمی ئابووریدا توانیویەتی بیسەلمێنێت کە زەکات و سیستەمی ئابووری یەك شتە، زەکات لە بازنەی (العفو)ی ماڵی موسوڵمانان وەردەگیرێت (هەرچی لە ئاستی ژیانی ئەوان زیاترە). دەبینیت لەمەزهەبەکاندا جنسەکانی زەکات دیاری دەکرێت.. ئەو شتانەش کە زەکاتیان لێدەدرێت بەپێی پشت بە فەرموودەکان و هەم ئەو توێژ و صینفانەش کە زەکاتیان پێ دەبەخشرێت، بەلأم دواجار بەهۆی ئەو رێسایەی کە مامۆستا ناصر لەگەڵ زانستی فەرمووددا مامەڵەی پێدەکات، بەوەی کە ئەوەی لە فەرموودەکاندا هاتووە (تمثیل)ە، بۆ نموونە ئەو شتانەی پێغەمبەری خودا دیاریکردوون زۆربەیان ئێستا لە هیچکام لە زۆربەی وڵاتە موسڵمانەکاندا نیە، بۆیە ئەو دێت رێسایەکی گشتی دیاری دەکات، کە بریتیە لە بڕی زیادە لە ئاستی بژێوی گۆڕاو بەپێی ساڵەکان و ئیتر ﴿یؤخذ من اغنیائهم و یرد الی فقرائهم﴾ لە دەوڵەمەندەکان وەردەگیرێت ﴿لکی لایکون دولة بین الاغنیاء منکم﴾ {١١٥}هەتا ماڵ و سامان تەنها لە دەست کۆمەڵێکی کەمدا قۆرخ نەکرێت، واتە هەموو ساڵێك

چی زیاتر بوو لە ئاستی ژیان لەو سالەدا ئەوە دەچێتە نێو بازنەی (العفو) و دەبێت ببەخشرێت *یسألونك ماذا ینفقون قل العفو- {١١٦} هەرچیەك لە ئاستی ژیانی دەولەمەندەكان زیاترە لێیان وەردەگیرێت و دەدرێتە هەژارەكان. لێرەشدایە كە پێناسەی (الانفال) دەكات. كە (الانفال) واتە (الفضل) زیادە، نە ئەو مانایەی كە باس دەكرێت، بۆیە دوبارە (الانفال)یش دەچێتەوە نێو بازنەی (العفو)، ئەو (الفضل)ەش تەنانەت لە فەرموودەكانی سەحیحی موسلیم و بوخاریدا هاتووە كە سەحابیەك دەفەرموێت(.. هەتا وامان بینی كە ئێمە هیچ حەقێكمان نیە لە (الفضل)ی مالی خۆمان، كە من لە ژمارە سێی گۆڤاری (هەژان)یشدا لەسەر ئەم بابەتەم نووسیوە{١١٧}. ئەمە كرۆكی فیكری ئابووری (مامۆستا ناصری سوبحانی)یە{١١٨}، لێرەشدایە بوونی مالكیەت و جیاوازی چینایەتی كە نابێت بگاتە ئاستێك كە (الفضل) لە ژیانی كۆمەلێشدا دروست بێت و بێتە پێشەوە، بۆیە بەردەوام مال دابەشدەكرێتەوە لەنێو سیستەمی ئابووری ئیسلامیدا، واتە فیكرەكە بریتیە لەوەی هەر شتێك لە ئاستی بژێوی ژیان زیاتر بوو -كە ئەمەش بەپێی گەشەكردنی كۆمەلگەكان دەگۆرێت- دەبێت بدرێتە كەسانێك كە لە خوار ئەو ئاستی ژیانەوەن لەنێو كۆمەلگەدا. بەمەش هەم بواری پێشكەوتنی كۆمەلگە دەرەخسێت، هەروەها ناشهێلرێت جیاوازی چینایەتی لە نێوان چینەكانی كۆمەلگەدا ئەوەندە زۆر ببێت كە كومەلێكیان ناچار بن وجودی مرۆڤایەتی خۆیان بفرۆشن لەبەر ئەوەی كە بژین! واتە رێگە نەدرێت كۆمەلێك بتوانن ئەوانی دیكە بكرن و سیستەمی بەندایەتی دروست ببێت، هەر بەمەشە دەتوانرێت رێگیری بكرێت لە ستەمكاری و بەبۆچوونی ئێمە هەر ئەمەشە بریتیە لە جێبەجێكردنی دادپەروەری، بۆ نموونە لە كۆمەلگەی ئێمەدا دەبینیت هەموو هەلە ئابووریەكان لە دەست كۆمەلێكی كەمدایە، ئیتر ئەگەر كەسێك كارمەندێكی بچووك بوو یان لە شوێنێكی خوارتردا بوو دەبێت دەست بەسنگەوە بگرێت بۆ ئەوانی دیكە، ئەمەش بەندایەتیە، بەلام ئەگەر ئەو نەیتوانی ئەوەندە زیاتری ببێت لە ئەم ئیتر ناتوانیت بیكرێت، بۆ نموونە لە رۆژئاوادا -ئەوروپا و ئەمریكا- كارگەی وا هەیە شەست حەفتا هەزار كرێكاری هەیە و گەر لەكاتی هەلبژاردنەكاندا دەنگ بە حیزبەكەی ئەو نەدات لەسەر كار دەری دەكەن! دەی كاریش لەوێ واتە ژیان، بەلام ئەگەر ئەو ئەوەندە زۆرتری نەبووایە نەیدەتوانی ئیستیغلالی بكات. بزانە سوبحانی چەند كەسێكی گەورە بووە كە ئەم نوكتە زۆر

وردانەی کەشف کردووە، کە ئەم فیکرەش زۆر نزیکە لە فیکری سۆشیال دیموکراتەوە، بەڵام ئەوەی سۆشیال دیموکرات ئەو ڕێکخستنە ورد و دەقیقەی نیە کە لای سوبحانی هەیەتی. کە دەبوو بزوتنەوە ئیسلامیەکان تەبەنی ئەم فیکرەیان بکردایە.

## سوبحانی و زانستە کۆمەڵایەتیەکان:

سەبارەت بە زانستە کۆمەڵایەتیەکانیش دەتوانین بڵێین سوبحانی باش مزری دکتۆر عەلی شەریعەتی خویندۆتەوە، هەم لە دروستبوونی شارستانیەتدا و هەم لە پێکهاتەکانی نێو کۆمەڵگەشدا، بەبۆچوونی عەلی شەریعەتی کە ئەوین لە (تۆینبی)ەوە وەریگرتووە، هیچ شارستانیەتێك بەبێ هیجرەت دروست نەبوو ، کە فەلسەفەی هیجرەت و موهاجیر بوون لە قورئاندا لای شەریعەتی بریتیە لەم،، بۆ ئەوەی شارستانیەتێکی تازە دروست ببێت هەر دەبێت هیجرەت روو بدات هەر بۆیەش لە مەککەدا شارستانیەت دروست نەبوو هەتا موسوڵمانەکان لە مەککەوە هیجرەتیان کرد بۆ مەدینە، کە عەلی شەریعەتی لە زۆرێك لە کتێبەکانیدا اسی کردووە. بەڵام مامۆستا ناصر بە زیرەکی و بلیمەتی خۆی هاتووە لە قورئاندا سەیری کردووە کە شارستانیەتیەکان دروشت نابن تەنها بەبوونی هیجرەت و یدی ئەو تیۆریایە ناتەواوە، دەبێت کۆمەڵێکی دیکەش ببن ئەو شوێنەیان ناسی بێن کە هیجرەتی بۆ دەکرێت، بەمەش جێگیری و مانەوەی ئەوان و هزری نوێی ئەمان پێکەوە کۆ ببنەوە و شارستانیەتێکی نوێ دروست ببێت. واتە دەبێت کۆچکردووەکان پشتگیری بکرێن لە لایەن پشتیوانەکانەوە کە هەر خۆیان نیشتەجێی ئو شوێنەن، بۆیەش لە قورئاندا جەخت کراوەتەوە لەسەر (المهاجرین) و (الانصار)، کە تەنها باسی مەدینە نیە بەڵکو شتێکی بان مێژوویيە بۆ هەموو سەردەمەکان وایە، ئەمەش داهێنانێکی زۆر گەورەیە بۆ کوردێکی دەرچووی حوجرە{١١٩}.

## سوبحانی و مەنهەجیەتی گفتوگۆکانی:

یەکێکی دیکە لەو شتانەی دەمەوێت لەسەر سوبحانی باسی بکەم بریتیە لە مەنهەجیەتی مامۆستا ناصر لە هەموو ئەو گفتوگۆیانەدا کە لەگەڵ ڕۆشنبیرانی باڵە سیاسیەکانی دیکەدا کردوویەتی لە کوردستان و لە ئێراندا و هەم لەگەڵ توێژی

ئاخوند و مەلاکان و فیکری تەصەوف و تەنانەت لەگەڵ باڵی قیتالیش کردوویەتی هەست دەکەیت لەو گفتوگۆیانەدا ئادابی( البحث و المناظرة)ی زۆر تەوزیف کردووە، ئەو زانستەی کە ئەمڕۆ ناخوێنرێت و هەر باویشی نەماوە، بەڵام لە کاتی گفتوگۆکانیدا بەکاری هێناوە، کە بەردەوام جێگۆڕکێی کردووە لە (معترض)ەوە بۆ (مستدل){١٢٠} و بەپێچەوانەشەوە بەبێ ئەوەی قسەش بەبەرامبەرەکەی ببڕێت، کە دەکرێت ئەمە بکرێت بە بناغەیەك کە جارێکی دیکە ئێمە شێوازی گفتوگۆکردن لە ئەوەوە فێر ببینەوە و دوور بکەوینەوە لەو شێوازەی ئەمڕۆ باوە، کە هەموویشی شەڕە جنێوە و ناویشی نراوە گفتوگۆ! ! بۆیە دەشێت شێوازی ناصری سوبحانی لە گفتوگۆکانیدا بکرێتەوە بناغەی گفتوگۆی مەدەنیانە، کە بۆ سادەترین شت دەلیلی هێناوە و ئامادە نەبووە بچووکترین رێز لەبەرامبەرەکەی نەگرێت، هەرگیز مامەڵەکردنی زانستیانە و مەنهەجیەتی خۆی بۆ بەرامبەرەکەی تێکنەداوە

## سوبحانی و مێژوو:

هەروەها مامەڵەی سوبحانی لەگەڵ مێژووشدا بەجۆرێکە کە دەکرێت بکرێتە بناغەی فەلسەفەی مێژوو، کە ئەوانەی مێژوویان خوێندۆتەوە و دیراسەی مێژووی ئایینیان کردووە وەکو (عماد الدين خليل) کە دکتۆراشی لەو بوارەدا هەیە و هەوڵەکانی جێی نرخاندنە، بەڵام هێندەی سوبحانی لەو بابەتەدا ورد نەبوون و کەشفی هەندێك بابەتیان نەکردووە. یەکێك لەو شتانەی دەکرێت بیکەینە بناغەی فەلسەفەی مێژوو لای ناصری سوبحانی بریتیە لەبەستنەوەی گۆڕانە مێژووییەکان بە سیستەمی ئەخلاقیەوە، بیری (مارکس) ئێستا کەمترین بەرگریکاری هەیە لەفەلسەفەی مێژوودا، بەڵام راکانی مەکئەنتایر زۆرترین بەرگریکاری هەیە، کە خوێندنەوەی شارستانیەتە لە سەر بنەمای ئەخلاق، لێرەوە بە بۆچوونی من سوبحانیش باش توانیوویەتی گۆڕانە مێژوویی و شارستانیەتەکان ببەستێتەوە بە فیکری ئایینیەوە و بەمەش تەفسیری هەموو قورئان دەکات: کە سورەتی (الفاتحة) بە دەقی هەموو قورئان دادەنێت و دوای ئەو سورەتەش سورەتی (البقرة)ش باسی ئەوە دەکات کە وەرگەڕانی مێژوویی بەڕێوەیە، هەر بۆیە باسی وەرچەرخانی رووگە (قیبلة) دەکرێت تێیدا، وەرگەڕانێکی مێژوویی کە ئیتر ئیمامەت بە زاراوەی ئەو، کە ئیمامەت بەلای ناصری سوبحانیەوە تەنها ئیمامەتی نوێژ نیە، تەنانەت کەسێکیش

ناتوانێت ئیمامەتی نوێژ بکات ئەگەر شتی دیکەی نەکردبێت و هومەکانی مەدنیانە نەبوو بێتن و...هتد، کە ئەمەش یەکێکە لە فەتواکانی، لە شارستانیەتێکەوە دەگوازرێتەوە بۆ شارستانیەوتی نویێ، وەرگەڕانی رووگە لە (بیت المقدس)ەوە بۆ (بیت الحرام) وەك ئایەتەکە دەفەرموویت ﴿...فنولينك قبلة ترضاها...﴾ ئیتر رووگە وەردەگێرین بۆیە ﴿...فولي وجهك من مسجد الاقصى الى مسجد الحرام...﴾ ئەمە لێرەدا وەرگەڕانی مێژووییە و لێرەشدایە هزری مێژووناسی و فەلسەفەی مێژ و لای مامۆستا ناصر دەست پێدەکات. سورەتی (آل عمران)یش کە دوای ئەوە دێت باسی هۆکارەکانی ئەم وەرگەڕانە مێژووییە دەکات، بۆ ئەم وەرگەڕانە ببێت؟! بۆ دەبێت پێشەوایی شارستانیەت لە (یهود) و (نەصارا)وە بدرێتە دەستی کۆمەڵێکی دیکە؟! بۆیە لەم سورەتەدا باسی هۆکارەکانی ئەم وەرگەڕانە دەکرێت، هۆکارەکانیش بریتیە لە هۆکارە خودیەکان (الاسباب الذاتية) واتە ئینحیرافی عەقیدی، کەوابوو هۆکاری وەرگێڕانی مێژوویی بریتیە لە ئایین لای مامۆستا ناصر. کەبەهێزی ئەم تیۆریایەش لەوەدایە کە هۆکارەکە بە تەنها ئایین نیە، تەنها هەر ئەوە نیە کە دانی عەقیدیان بوو بێت، چونکە ئەمە جێکەوتی لەسەر شتی دیکە هەیە و شتی تریش جێکەوتی لەسەر ئەم هەیە، بۆیە لە سورەتی (النساء)دا باسی هۆکاری دیکە دەکرێت کە بریتیە لە بوونی ستەمکاری لەنێو کۆمەڵگەدا، بە تەنها ستەمکاری سیاسی نا بەڵکو ستەمکاری لە جەوهەری کۆمەڵگەدا کە بریتیە لە چەوساندنەوەی دوو توێژ لە نێو کۆمەڵگەدا کە ئەویش توێژی (ژن) لەگەڵ (منداڵ)ن و. واتە هۆکارەکە تەنها ئینحرافی ئایینی نیە بەڵکو دروستبوونی ستەمکاریە لە جەوهەری کۆمەڵگەدا کە ئەمە بابەتێکی دوور و درێژ بوو کاتی خۆی لە رۆژنامەی یەکگرتوودا لەسەرم نووسی، کە هەموو لادانێك لە ئایین حەتمەن ستەمکاری بەرامبەر دوو ویژی لاوازی نێو کۆمەڵگە دروست دەکات (کە بریتین لە ئافرەت و منداڵ). ئێستا دەبینیت لە رۆژئاوادا کاتێك کە ئینحرافی عەقیدی تێیدا رووی داوە ستەمکاری سیاسی کەمتر دیارە، لە رووی سیاسیەوە لیبراڵیەت و چەمکی ماف دەرکەوتووە، بەڵام ستەمکاری لە جەوهەری کۆمەڵگەدا بوونی هەیە، بۆیە دوو چەوساوەترین چینی نێو ئەو کۆمەڵگایانە بریتیە لە منداڵ و ئافرەت، کە ژن بووەتە ئامێرێك بەدەستی پیاوەوە، ئیتر مەرج نیە تەنها لە رووی جەستەوە زوڵمی لێبکات، ئیستیغلال دەکرێت، بەڵکو منداڵیش (کە سێکس لەگەڵ منداڵدا دەرەنجامی ئەوەیە) بۆیە سورەتی (النساء) کە

دوای سورەتی (آل عمران) دێت باسی هوکارە دەرەکیەکانی ئەو لێسەندنەوەی خیلافەتە دەکات لەو شارستانیەتە و دانی بەدەست کۆمەڵێکی دیکەوە. واتە ئێوەش ئەی موسوڵمانان ئەگەر ژن و منداڵ بچەوسێننەوە ئەوا وەکو یەهود و نەصارا خودا خەلافەتتان لێدەسێنێتەوە و دەیداتە دەست کۆمەڵێکی دیکە کە (یحبوهم و یحبونه){١٢٢} ئەوان خودایان خۆش دەوێت و خوداش ئەوانی خۆش دەوێت. واتە خۆشەویستی خودا و مەخلوقاتی خودا لەنێو کۆمەڵگەیەکی ستەمکاردا جێی نابێتەوە. ئەمە تیۆریایەکی خوێندنەوەی مێژووە کە ناصری سوبحانی بەبێ ئەوەی زۆر ئاگاداری فەلسەفەی مێژوو بێت توانیوویەتی هەر بە توانای مەخیلە و زیرەکی خۆی و ئەو تەرکیزەی لەسەر قورئان هەیبووە توانیوویەتی ئەمە دەربهێنێت{١٢٣}.

یەکێکی دیکە لەو داهێنانانەی دەکرێت لە فیکری مێژوویی سوبحانیدا ئاماژەی بۆ بکەین بریتیە لە حیکمەتی نووسینەوەی قورئان بەو ریزبەندیەی ئێستایەوە، کە ئەمە دەبەستێتەوە بە فیکری مێژووییەوە، بۆچی قورئان ریزبەندیەکەی لەنێو (مصحف)دا هەمان ریزبەندی کاتی دابەزینی وەحی نیە؟! بۆیە لێرەدا سوبحانی دەفەرموێت ریزبەندی دابەزینی پێویستی (حاجە) سەردەمی پێغەمبەری خودا (د.خ) بووە و پێویستی نبووەت بووە، وەك ئەوەی دەفەرموێت هەموو ئایینێك لەسەردەمی دامەزراندا جۆرە ئەحکامێکی تایبەت بە خۆی هەیە کە جیاوازە لە حوکمەکانی سەردەمەکانی داهاتوو. دابەزینی قورئان بەریزبەندی نزولی خۆی پێویستیەکی دامەزراندنی ئایینی خودا بووە لەو سەردەمەدا، بەلام بوونی ریزبەندی ئێستای سوورەتەکانی نێو قورئان پێویستیەکی بان زەمانیە بۆ هەموو سەردەمەکان، بەو مانایەی سەردەمی پێغەمبەری خودا وای دەویست کە بەو ریزبەندیە ئایەتەکان دابەزن، بەلام ئێستا هەموو مرۆڤایەتی و دیدی قورئان بۆ هەموو شوێنکاتەکان داخوازی ئەوەیە بەو شێوەیەی ئێستا بێت، واتە پێویستی و رەوتی مێژووییە کەوا دەخوازێت یەکەمجار پاش سورەتی(الفاتحة) سورەتی (البقرة) بێت و ئینجا بەدوویدا (آل عمران) و ...هتد، ئەوانی دیکە بێن.

گرنگی ئەم ریزبەندیە بۆ هەموو سەردەم و مێژوویەکە، سوورەتی (الفاتحة)ش مەتنی هەموو قورئانە بۆیە لەسەرەتاوەیە، کەواتە تێگەیشتن لە ریزبەندی هەموو سورەتەکانی قورئان تێگەیشتنە لە گرنگی مێژوویی مێژوو و هەروەها پێویستی ئەو

شتانەش بۆ مێژوو، واتە ئەو شتانەی لە سوورەتی (البقرة)دا باسکراون زۆر گرنگن بۆ هەموو مرۆڤایەتی بۆیە لەو سورەتەدا باسکراون. ئەمەش دوبارە بەستنەوەی ئەو ریزبەندیەی قورئانە بە تیۆریای مێژوویی و فەلسەفەی مێژووەوە {١٢٤}. یەکێکی دیکە لە خاڵە گرنگەکانی فیکری مێژوویی لای مامۆستا ناصر بریتیە لەوەی هامیشە قورئان دەکاتە دەلیل بەسەر رووداوە مێژووییەکانەوە بەڵکو بەپێش زەمەنی نەبووەتیشەوە. وەك ئاماژەم پێدا لە بابەتی شورادا دوای ئەوەی کە دەیسەلمێنێت شورا واجیبە و کۆمەڵی یەکەمی موسوڵمانیش مومکین نیە هەموویان لەو ئەمرە دەربچن، بۆ نموونە لە جەنگی هەڵگەڕاوەکاندا (حروب الردە) ئەوانەی دوای وەفاتی پێغەمبەری خودا (د.خ) هەڵگەڕانەوە و زەکاتیان نەدا و نوێژیان نەدەکرد، حەزرەتی ئەبوبەکر فەرمووی ئەگەر جل و بەرگی خێزانەکانی پێغەمبەریشم ببینیبێت بەدەست دوژمنانەوە —کە ئەوە بۆ جوڵاندنی حەماسەتی سەحابەکانە بووە بۆیە بەو جۆرە دەفەرمووێت، بەتایبەتی بۆ ئەخلاقیاتی پاڵەوانانەی ئەو کاتە کە نۆرمی ئەخلاقی سەردەمی کۆن بووە— ئەوا ئەو جەنگەیان لەگەڵ دەکەم، لێرەدا کتێبەکانی مێژوو وا نیشان دەدەن کە ئەبوبەکر ئەو جەنگەی بە دیکتاتۆری سەپاندووە بەسەریاندا، بەڵام مامۆستا ناصر دەفەرمووێت لەبەر ئەوەی شورا واجیبە و سەحابەکانیش بەگشتی لە واجیب لایان نەداوە، ئەمەش دەکاتە دەلیل لەسەر ئەوەی لێرەدا رووداوێکی مێژوویی رووی داوە کە بریتیە لەوەی کە سەحابەکان شورایان ئەنجامداوە، ئەگەرچی مێژووش نەیگێڕابێتەوە، هەروەها لە باسی فریشتەکاندا ئەو ئایەتەی کە دەفەرمووێت: ﴿...قالوا اتجعل فیها من یفسد فیها و یفسك الدماء و نحن نسبح بحمدك و نقدس لك...﴾ {١٢٦} لە رووکەشدا وا دەردەکەوێت کاتێك خودای گەورە فەرمووی من خەلیفەیەك لەسەر زەوی دادەنێم یەکسەر ئەوان وتیان کەسێك دادەنێیت کە خوێن بڕێژێت و ...هتد، لێرەشدا هەست دەکەیت شتێك ونە! مامۆستا ناصر خودی ئەم ئایەتە دەکاتە دەلیل لەسەر ئەوەی کە خودای گەورە باسی کردووە کە من خەلیفەیەك دادەنێم ئەمە سیفەتەکانیەتی، ئیرادەی دەدەمێ و موقتەزی ئەم ئیرادەیەشی ئەوەیە خوێن بڕێژێت و خراپە بکات و ...هتد، ئینجا ئەوان وتوویانە کەسێك دادەنێیت ئەوە بکات و خوێن بڕێژێت؟! کە ئەمە لە رووی مێژووییەوە باس نەکراوە بەڵام قورئان دەکاتە دەلیل لەسەر ئەو رووداوە ئەمەش خاڵێکی زۆر گرنگە لەکاتێکدا کە فیکری مێژوویی لە ئیسلامدا کەمترین شتی لەسەر

نووسراوە{١٢٧} وەكو زانستەكانی فەرموودە نیە یان وەكو (علوم القرآن) نیە كە هەموو رەهەندەكانی نووسرا بێتەوە، بۆیە دەكرێت ئەمە بكرێتە بناغەیەك بۆ خوێندنەوەی مێژوو، بەتایبەتی مێژووی سەردەمی پێغەمبەری خودا، نە تەنها ئایەتە تەوسیفیەكانی قورئان بەڵكو ئایەتە نۆرماتیڤەكانی قورئانیش، واتە ئەو ئایەتانەش كە ئەحكامیان تێدایە، بۆ نموونە شورا واجیب بوون حوكمێكە و سوبحانی دەیكاتە دەلیل لەسەر رووداوێكی مێژوویی دەكارێت لەسەر فیكری مێژوویی لای مامۆستا ناصر زێتر بكەین بەلآم لێرەدا هەر ئەوەندە بوار هەیە، بەلآم خاڵێكی دیكە لە فیكری مێژوویی ناصری سوبحانیدا ئەوەیە كە ئەو دەڵێت قورئان (قصە) ناگێڕێتەوە و كتێبێكی (قصە)یی نیە، (قصە)ش بریتیە لەوەی ورد ورد شتەكانی نێو ئەو بابەتە باس بكەیت، بەڵكو قورئان (قصص) دەگێڕێتەوە، (قصص)یش هەڵبژاردەیە، واتە ئەو شتانەی كە رێسای مێژوویی تێدایە، ئیعتیباری تێدایە، لێرەشدا دوبارە مامۆستا ناصر لە رووداوی مێژووییەوە دەگوازێتەوە بۆ رێسای مێژوویی، كە ئەوەش بابەتێكی گەورەیە لە فیكری مێژووییدا لای مامۆستا ناصری سوبحانی{١٢٨}.

## سوبحانی و كۆمەڵگە:

هەروەها مامۆستا ناصر یەكێكە لەو بیریارانەی باش توانیویەتی كلێشەی نموونەیی كۆمەڵگەی موسوڵمان بۆ هەموو سەردەمەكان پیشان بدات، كە بابەتی كۆمەڵگە لای سوبحانی زۆر ئامادەیی هەیە، بەڵكو لای ئەو باسی كۆمەڵگە و دیاریكردنی توێژەكانی كۆمەڵگە و بواری ریفۆرمی كۆمەڵایەتی و گۆڕینی كۆمەڵگە و تەنانەت جۆری بیناسازی نێو كۆمەڵگە ئامادەییەكی گەورەی هەیە بە تایبەتی لە تەفسیركردنی هەر سێ سوورەتی (التوبة، النور، الاحزاب){١٢٩}دا. كە لە تەفسیری سورەتی (التوبة)دا دەفەرمووێت خودای گەورە هەموو توێژەكانی كۆمەڵگەی ئیسلامی بۆ پێغەمبەرەكەی باس كردووە كە لەنێو كۆمەڵگەدا دەكرێت چەند گروپ بن، كە ئەمە بناغەیەكی زۆرباشە بۆ زانستی كۆمەڵایەتی ئیسلامی كە دەكرێت قسەی زیاتری لەسەر بكرێت و سوودی لێ ببینین، بۆ نموونە (منافقین) دابەش دەكات بەسەر نۆ گروپدا، (مونافیق)یش ئەو كەسەیە لە نێو خودی كۆمەڵگەدا دژایەتی كۆمەڵگە دەكات، هەیانە تەواو خۆی یەكلایی كردووەتەوە بۆ دژایەتی كردنی كۆمەڵگە. هەیانە راڕاو ناجێگیرە، هەشیانە گروپێكیان دروستكردووە و لە

مزگەوتێکدا دانیشتوون –کە ئەوە هەمیشە هەیە. بەمجۆرە دەیانکات بە نۆ پۆلـەوە. ئینجا (مؤمن)ەکانیش لەولاوە و ئینجا کافرەکانیش لـە دەرەوەی کۆمەڵگـەوە، کـە ئەم پۆلبەندیـەی سوورەتی (التوبـة) پـێش ئـەو کەسـێکی دیکـە بـەوجۆرە کەشـفی نـەکردووە کــە دەکرێــت بناغــەی دابەشــکردنی هەندەســەی کۆمەڵایــەتی پیــشان بدات{١٣٠}.

هەروەها لە سورەتی (الاحـزاب)دا هەندەسـەی جنـسی کۆمەڵگـە پیـشان دەدات: سورەتی (الاحزاب)دا هەندەسەی جنسی کۆمەڵگە پیشان دەدات، ئەوەی کە (فاطمە مەرنیـسی) باسـی کـردووە و لەسـاڵی دوو هــەزار و پێنجـدا خــەڵاتی نێودەوڵـەتی هۆڵەنــدیان پێــدرا لەگــەڵ عەبدولکـــەریم ســروش و (صــادق جـلال العظــم) کــە کۆمەڵناسێکی مەراکیشیە و باسی دابەشـکردنی هەندەسـەی رەگـەزی نێـو کۆمەڵگـە دەکات، کە مامۆستا ناصر شـتی فاتیمـە مەرنیـسی نەخوێندۆتـەوە چـونکە ئەوکاتـە فاتیمـە ئــەو ناوبانگــەی ئێــستای نــەبوو کــە لــە دوای نەوەدەکانــەوە کتێبــەکانی بڵاوبوونەتەوە و ئێمە ئاگاداری هەین، بەتایبەتی لەو کتێبەیدا کە باسـی هەندەسـەی جنـسی کۆمەڵگــە دەکــات و بــەو میتــۆدە کۆمەڵگــە رۆژهەڵاتیــەکان دەخوێنێتــەوە. مامۆستا ناصریش لە تەفسیری سورەتی (الاحزاب)دا رێك ئەو دابەشبوونە جنـسیەی نێو کۆمەڵگە زۆر بە وردەکـاری و وەکـو زانایـەکی سۆسیۆلۆژیـست پیـشان دەدات و زۆرباش تەوزیفی ئەو بابەتە دەکات، تەنانـەت لەسـەر ئاسـتی تاکەکەسیش کـە ئـەو کەسەی دەیەوێت گۆڕانێکی ریـشەیی لـە کۆمەڵگـەدا بکـات دەبێـت مامەڵـەی لەگـەڵ خێزانەکانیدا چۆن بێـت، یـان ئـەو کەسانەی(دڵیـان نەخۆشـی تێدایـە){١٣١}و بـە هاوسـەرەکانی خۆیـان رازی نـابن و لەسـەرە رێگاکانـدا دەوەسـتن و دەبنـە مایـەی دەرکـەوتنی گوتـاری لۆقـەکردن کـە (رێبـوار سیوەیلی) لـە گۆڤـاری رەهەنـد و لـە هەفتەنامەی هاوڵاتیشدا بەفراوانی لەسەری نووسیوە کە ئـەوە جـۆرە نەخۆشـیەکە و لـە قورئانیـشدا بـە ﴿...في قلـوبهم مـرض...﴾ نـاوی هێنـراوە کـە زۆر هەرەشـەیان لێدەکات ئەگـەر واز نـەهێنن خــودا ئیعلانــی شــەڕیان لــە تەکدا دەکـات، چـونکە پێغەمبەری خودا وەحی بۆ دەهات، بۆیە رێك ناوی دەبردن ئەگەر وازیـان نەهێنایـە، تەنانەت لەناو خێزانەکانیشدا تەوزیفی ئەم بابەتەی کردووە کە مرۆڤ چەند دەتوانێـت نامــەحرەم ببینێــت و پەیوەنــدی خێزانــەکان چـۆنە، خـۆ ناکرێـت بـە تــەواوەتی کۆمەڵگەی ژن و پیاو لەیەکتر جیا بکرێتەوە! بەڵام نـەخۆش نەکـەون لـەو بـوارەدا،

چۆن مەجلیسەکان ببنەوە بەیەك نە ئەوەی جیا ببنەوە لەیەکتر، ئاخر بەپێچەوانەی ئەوەوە کە دەوترێت هەمیشە فەلسەفەی دابەشکردنی جنسەکان لە ئیسلامدا لەسەر بناغەی زەمەنە نە لەسەر بناغەی مەکان، واتە ئەوە نیە شوێنی ژن و پیاو لەیەکتر جیا بێت، کە ئەمە فیکری مامۆستا ناصریشە، هەمیشە هەولدەدرێت مەکان یەکبخرێتەوە، لە مزگەوتدا ژن و پیاو ببن، لەو شوێنانەدا کە جەژنی تێدا دەکرێت ژن و پیاو پێکەوە ببن، میوان لەسەر هەمان سفرە بە ژن و پیاوەوە لەگەڵ خاوەن ماڵەکەدا نان دەخۆن، بەڵام لە هەموو ئەوانەدا بە حیجابەوە کە چاودێری ئەو هەستە بایۆلۆژیە بکرێت کە وروژاندنی سێکسی روو نەدات(کە حەتمەن لەکۆتاییدا لۆقەکردنی لێدەکەوێتەوە) برادەرێك پرسیاری ئازادی نێوان دوو رەگەزی لێکردم، وتم من باوەڕم بە ئازادی نێوان دوو رەگەز هەیە، بەڵکو دەبێت رێك بخرێت و (تنظیم) بکرێت، کە ئەمەم مەبەست بوو کە ئێستا باسمکرد، بەڵام دەبێت رێکبخرێت، وتی باشە ئەگەر رێکخرا ئەوا ئەو کاتە نامێنێت، پێم وت:نا... ئەگەر رێکخستنی تێدا نەبێت ئەوا بە دڵنیاییەوە لە لەشفرۆشیەوە دەرەنجامەکەی دەردەچێت، حەتمەن لەمەدا ئافرەتیش قوربانیە وەك لە فیکری مێژوویی سوبحانیشدا ئاماژەمان پێدا، کۆمەڵێك ئافرەت دروست دەبن کە لەشفرۆشی بکەن، کەمتر پیاو (مەگەر ئینحراف جنسی رووی دابێت لە کۆمەڵگەدا) ئەگەر نا دوو توێژ دەبنە قوربانی (منداڵ) و (ئافرەت) کە ئێستا لە زۆرێك لە وڵاتاندا سێکس لەگەڵ منداڵدا دەکرێت کە خوێندومانەتەوە و بیستوومانە.

لێرەوە بەکورتی سوورەتی (الاحزاب) باسی دابەشکردنی هەندەسەی جنسی کۆمەڵگەیە کە هەوڵدانە بۆ یەکخستنەوەی دوو رەگەز لە رووی مەکانیەوە بەڵام بەنەهێشتنی نەخۆشیە سێکسیە کۆمەڵایەتیەکان، تەنانەت بۆیە لێرەدا باسی ئەوەی تێدایە کە پێغەمبەری خودا (د.خ) (زەینەب) مارە دەکات کە وەکو بوکێك حساب کراوە بەوەی خێزانی (زەید) بوو، بەڵام (زەید)یش کوڕی ئەو نەبوو، ئەمەش بناغەی دابەشکردنی هەندەسەی دوو رەگەزی نێو کۆمەڵگەیە و جارێکی دیکە دابەشی دەکاتەوە کە زۆر گران بووە، بەبۆچوونی من گرانترین قۆناغی کۆمەڵگەی ئیسلامی و دامەزراندنی کۆمەڵگەی ئایینی لەسەر پێغەمبەری خودا (د.خ) ئەم قۆناغە بووە کە تا ماوەیەك هەر شاردوویەتیەوە نەیوێراوە باسی بکات لەبەر ئەوەی نەوەکو لێی

قبولّ نەکرێت، بەراستی زۆر قورس بووە و زۆری چەشتووە بەداخەوە کە ئەمڕۆ بەپێچەوانەوە لەسەر ئەو زاتە دێتە هەژماردن{١٣٢}.

هەر لێرەشدایە کە مامۆستا ناصر سیستەمی زەواج لەو سورەتەدا لە خزمەتی ئەم هزرەدا تەوزیف دەکات، بێگومان سوبحانی بەم تەعبیرانەی من بەیانی ناکات، بەلاّم دەرەنجامەکە بەوجۆرە دەکەوێتەوە، بۆ نموونە بۆچی واجیبە ئافرەت لەکاتی شوکردنیدا دوو شاهیدی ببێت و (ولی الامر)ی لەوێ بێت لەگەلّ ژن و پیاوەکەش؟ لەبەر ئەوەی ئەم سیستەمە هەندەسیە وێران نەکرێت و لەنێونەبرێت، لەبەر ئەوە نیە کە ئێستا دەووترێت گوایە ئافرەت کەسایەتی کاملّ نیە و پێویستی بەکەسێکە بە ناویەوە قسە بکات! بەلّکو لەبەر ئەوەیە دەکرێت دوو پیاو ئافرەتێکی نەدار و هەژار ئیستیغلال بکەن لە رووی سێکسیەوە –کە ئێستا سێکسی گروپی هەیە!– بەلاّم ئەگەر کەسێك بوو وەکو مێرد و دوو شاهیدی دیکەش هەبوون لەگەلّ (ولی الامر)ێکیش رێدەگرێت لەوەی نەوەك ئەمە ئیستیغلال کردن بێت. قسەکە لەوەدایە کە ئەمە بۆ ئاشکراکردنە، تەنانەت پێغەمبەری خودا (د.خ) زۆر هانی هاوەلاّنی داوە کە زەواج بەئاشکرا بکەن بۆ ئەوەی نەهێلرێت ئەو هەندەسە جنسیە تێك بدرێت و کۆمەلّگە بەرەو ئینحراف بڕوات{١٣٣}.

لە سورەتی (النور)یشدا دابەشکردنی کۆمەلّگە بوونی هەیە لەسەر بنەمای خێزانەکان چۆن بژین. تەنانەت هەندەسەی ناوەوەی خێزان چۆن بێت، هەر لە خودی ئایەتەکانەوە دەردەکەوێت کە لە هەندێك کاتدا مندالّەکان لە ژووری دایك و باوکدا نەبن، واتە هەر کامیان ژووری سەربەخۆی خۆیان ببێت، تەنانەت ئەو مندالاّنەش کە هێشتا فامیان نەکردووە لەچەند کاتێکی دیاریکراودا رێگەی دەدرێت بچنە ژووری دایك و باوکەوە، کە ئەمە هونەری بیناسازی ئیسلامیمان پیشان دەدات کە بە چ شێوازێك بێت، بەلاّم زۆر بەداخەوە شارستانیەتی ئیسلامی لە دوای دارمانەوە ئیتر نەیتوانی بەوجۆرە بڕواتە پێشیّ، بەلّکو تەنها یەك ژوور هەبووە بۆ هەموو ئەندامانی خێزانەکە و تەنانەت بۆ ئاژەلّەکانیشیان، لێرەدا مامۆستا ناصر دەفەرموێت بەبۆچوونی من لە نەداریدا نەبووە بەلّکو لە جێبەجێنەکردنی ئەو شێوازە بووە کە سەرەتاکەی لە قورئاندا بەیان کراوە. بۆیە هەرچیەك پەیوەندی بەرێکخستنی ئەم هەندەسە خێزانیەوە هەبێت لە رووی شوێنکاتەوە لەو سورەتەدا باسکراوە و هەروەها هەر شتێکیش تێکدەری ئەم دابەشکردنە هەندەسیە بێت

لەسەر ئاستی خێزانەکان بەهەمان شێوە باسکراوە لە سورەتی (النور)دا {١٣٤}، هەروەها هەر ئینحرافێکیش کە لە ئەنجامی جێبەجێ نەکردنی ئەمەدا بکارێت روو بدات باسیکراوە. بۆ نموونە لەنێو کۆمەڵگەی کوردیدا کە کۆمەڵگەیەکی پاکە هەست دەکەیت هەندێك جار برێك ئینحراف جنسی رووی داوە کە بەبۆچوونی من لە رەچاونەکردنی ئەم بابەتەدا روویداوە، پاشان چاکسازی کۆمەڵایەتی کە دوای رەچاوکردنی ئەمانە دروست دەبێت. فیکری چاکسازی لای سوبحانی بە پێچەوانەی هەموو فەقیهەکانەوە فیکرێکی زۆر عقوباتی و سزادەر نیە، فیکرێکە لەگەڵ شرۆحی شەریعەتی ئیسلامیدا زۆرباش دەگونجێت، کە شەرعی ئیسلامی لەنێو هەر پێنج شەریعەتە یاساییەکی دونیادا بەرەحمترین شەرعیانە، هەم لەشەرعی ئەنگلۆ سەکسۆنی، هەم لەشەرعی لاتینی، هەم لەشەرعی رۆمانی و چینیش، شەریعەتی ئیسلامی لەهەموویان بەزەییترە. بۆیە فیکری (مامۆستا ناصر) لە چاکسازیدا لەگەڵ هەموویاندا باشتر دەگونجێت. هەموو ئینحرافێك کە لە کۆمەڵگەدا دروست دەبێت فەقیهەکان زۆر توند مامەڵەیان لەگەڵدا کردووە، بۆ نموونە کوشتنی هەڵگەڕاوە (مرتد) کە بنەماکەی لەسەر ئایین دامەزراوە، بەلاَم مامۆستا ناصر بەپێچەوانەی هەموویانەوە زۆر نەرم مامەڵەی کردووە، بۆ نموونە هەموو فەقیهەکان لەسەر ئەوە کۆکن کە ئەگەر کەسێك خێزانی هەبوو بەلاَم زینای کرد دەبێت بکوژرێت، بەلاَم سوبحانی لە تەفسیری سورەتی (المائدة)دا لە ئایەتی پەنجا و چواردا دەفەرموێت: نا... لەبەر زینا کەس ناکوژرێت، ئەم فەتوایەش لە حەزرەتی عەلیەوە وەردەگرێت. واتە کەسێك کە ژنی هەیە لەبەر ئەوە ناکوژرێتەوە کە زینای کردووە، لەکاتێکدا حوکمی زینا دیاریکراوە کە بریتیە لە جەڵدلێدان، بەڵکو لەبەر دوو هۆکاری دیکەیە، یان دەبێت کەسێکی کوشت بێت یان فەسادی کردبێت، کە زینا بەشێکی کەمە لە فەساد و حوکمەکەشی لێدانی جەڵدە، فەساد بریتیە لە تێکدانی کۆمەڵگە ﴿...من قتل نفسا بغير نفس او فسادا في الارض كأنما قتل الناس جميعا...﴾ بۆیە کوشتنەوەی کەسێکی خێزاندار کە زینای کردووە لەبەرکردنی زینا نیە بەڵکو لەبەر ئەوەیە کە ئەم کەسە پێویستی بەم زینایە نیە و دروستکردنی فەسادە لەنێو کۆمەڵگەدا، وەك دەووترێت ئیسرائیل باندی ئافرەتانی لەشفرۆش دەنێرێت بۆ ولاَتە ئیسلامیەکان بۆ دروستکردنی ئینحرافات لەو کۆمەڵگانەدا، یاخود لە تورکیادا باندی گەورە گەورە دەرکەوتوون کە خەریکی لەشفرۆشین، لەبەر ئەوە بوونی ئەم سزایە

لەبەر تێکنەچوونی سیستەمی گشتی(النظام العام) و ڕێساکانی نێو کۆمەڵگەیە، نە لەبەر ئەوەی زینا نەمێنێت ئەگەرنا لە کۆمەڵگەی ئیسلامیشدا ئەگەری ڕوودانی زینا هەیە. بۆیە سوبحانی دەفەرموێت ئەگەر دەرکەوت باند و شەبەکەن و هاتوون کۆمەڵگەی ئیسلامی تێکبدەن ئەو کاتە سزاکەیان بەسەردا جێبەجێ دەکرێت کە کوشتنە. بەڵام ئەگەر ئامانجێکی لەو شێوەیەی لە پشتەوە نەبوو و تەنها هەڵەیەکی تاکەکەسی بوو ئەوا تەنها لە حوکمی زینادا دەبێت و جەڵدی لێدەدرێت. واتە سیستەمی فیکری مامۆستا ناصر لە ئەحکامدا سیستەمێکی سزادەر نیە، ئەگەر (أسماء الله) لای ئەو دوو بەش بن، جەلالی و ئیکرامی، ئەوا تەشریع لای سوبحانی زۆرتر لەبەشە ئیکرامیەکەیدایە نە لە بەشە جەلالیەکەیدا، سزادان نیە بەڵکو ڕاستکردنەوە و چاککردنەوەی کۆمەڵگەیە. کە ئەمەش لەگەڵ فیکری عقوباتی سەردەمی نوێدا دەگونجێت{١٣٥}،.

## سوبحانی سیستەمی ئایینی و عەقاید:

دەشێت بڵێم سوبحانی زۆرتر لە زانستەکانی عەقاید و سیستەمی ئایینیەوە بووە کە موعجەب بووە بەرامبەر بە فیکری ئیسلامی نوێ، بەتایبەتیش فیکری (ابو اعلاء مودودی) و دواتر (سەیید قوتب) و هەروەها (حسن بنا) و...هتد، بۆتە ئەندامێکی بزوتنەوەی کۆمەڵی برایان لەو کاتەدا، دەتوانم بڵێم زۆرێك لە داهێنانەکانی سوبحانی دەچنە نێو بازنەی جیهانبینی ئایینی و زانستەکانی عەقایدەوە کە زۆرباش بۆ بابەتەکانی زانستی تەوحید چووە، بۆ نموونە هەر لەو گفتوگۆیەدا کە لەگەڵ کەسێکی بە حیساب ئەهلی تەسەوفدا ئەنجامی داوە کە ئەو زۆر بەرگری لە (وەسیلە) دەکات و هەوڵی هێنانەوەی بەڵگەی زۆر دەدات لەم بوارەدا، بەڵام مامۆستا ناصر بە دەلیلی قورئانی دەیسەلمێنێت کە وەسیلە بریتیە لە کاری چاکە (الاعمال الصالحە) کە ئەمە شتێکە زۆر وتراوە بەڵام کەسێك نەبووە وەکو سوبحانی بە لۆژیکی قورئان ئەوە بسەلمێنێت، بۆ نموونە ئەوانەی ئەمجۆرە بیرکردنەوەیان هەیە بەڵگە بە ئایەتی ﴿..یبتغون الی ربهم الوسیلة ایهم أقرب...﴾{١٣٦} دەهێننەوە، دەی مامۆستا ناصر هەر خودی ئەم ئایەتە دەکاتە بەڵگەی نەبوونی وەسیلە بەو مانایەی کە ئەوان لێی تێگەیشتوون، واتە دروستبوونی سێیەمێك لە نێوان بەندە و خودادا، مامۆستا ناصر هەر خودی ئەو ئایەتە دەکاتە دەلیل دژی ئەو

فیکرەیە، کە بەلای منەوە لێرەدا بە لۆژیکێکی زۆر جوان و بەهێز هێناویەتی، خورافاتی ئایینی پێ ڕاست دەکاتەوە و باشیش پێکاویەتی، بۆیە ئێمەی کورد ماف خۆمانە زۆر شانازی بکەین بە مەلایەکی کوردی گەورەی وەکو سوبحانیەوە کە ئەوەندە مامەڵەیەکی جوان و ناسکی لەگەڵ فیکری ئاییندا هەبووە.

جا دەفەرموویت ئەوەی لە ئایەتەکەدا هاتووە بریتیە لە گرتنی وەسیلە بەنزیکترینیانەوە لە خوداوە ﴿...ایهم أقرب...﴾ کە لە نێو موسوڵمانانیشدا نزیکترین کەسێك لە خوداوە پێغەمبەری خودایە (د.خ)، کەوا بوو ئەگەر ئێمە پێغەمبەری خودا یان هەر شێخێك و ئەولیایەکی خودامان کردە وەسیلە ئەی خودی پێغەمبەری خودا کە خۆی لە هەموو کەس نزیکترە کێ بکاتە وەسیلە!... کەواتە ئەو وەسیلەیە لێرەدا بەمانای کردەوەی چاکە هاتووە و وەسیلەی پێغەمبەری خوداش لای خودا کارە چاکەکانیەتی، بزانە چەند ورد بووە لە کەشفی ئەم بابەتەدا. شتێکی دیکە لەو شتانەی کە بەندە زۆر پێی موعجەبم لە فیکری ئایینی مامۆستا ناصردا بریتیە لەچارەکردنی گرفتی بەرزەخ کە ناودژێتیەك بووە لە نێو فیرقە ئیسلامیەکاندا و عەقائیدی ئیسلامیدا و کەس بۆی چارە نەکراوە.

مامۆستا ناصر بە حوکمی ئەوەی باش شارەزا بووە لە زانستی عیرفان و ئەدەبیاتی ئێرانی و هەروەها لەبەشە هیندیەکەشیەوە لای (ئیقبال لاهوری) کە زۆر باش سوودی لە فیکری (ئیقبال لاهوری) بینیووە بۆ ڕوونکردنەوەی بابەتی بەرزەخ و دواییش ئیستیدلال بۆ کردنی لە قورئاندا —کاتێك من دەڵێم سوبحانی فلان شتی لە ئەم یان لە ئەو وەرگرتووە مەبەستم لەوەیە کە وردبوونەوەی بابەتەکە لای ئەوانەوە بووە بەڵام دواتر خۆی قووڵتر پیشانی داون و لە قورئاندا ئیستیدلالی بۆ کردوون.

ئیقبال لاهوری قەناعەتی وایە کە ڕۆحی مرۆڤ تەنانەت لە بەهەشتیشدا دەجووڵێت و بەردەوامە لە چەرەکەتکردندا، سوبحانی ئەم فیکرەیە لە لاهوریەوە دەهێنێت بابەتی بەرزەخی پێ ڕوون دەکاتەوە. جارێ دەفەرموویت جیاوازی هەیە لە نێوان ڕۆح و نەفسدا. ڕۆح بریتیە لەو بەشە ئیلاهیەی کە هێشتا تێکەڵ بە خاك نەبووە، کە هاتە نێو خاکەوە ئیتر هەندێك لە خەصڵەت و سیفەتەکانی خاك وەردەگرێت، بۆیە لە ڕۆح دەکەوێت و دەبێتە نەفس. ڕۆح خەصڵەتی خاك وەردەگرێت هەر وەك چۆن ئاسن کاتێك دەخرێتە نێو کورەوە خەصڵەتی ئاگر وەردەگرێت و سوور دەبێتەوە خۆ ئاسنەکە نابێتە ئاگر، بۆیە ئەم ڕۆحەش خەصڵەتی خاك وەردەگرێت، کەواتە

نەفس دەکاتە رۆح لەگەڵ ئەو خەصڵەتانەی خاك كە لكاون بە رۆحەوە، بۆیە لە جیهانی بەرزەخیشدا هەر نەفسە دەجولێت نە رۆح، ئەو ئازارانەی لەو جیهانەدا دەچێژرێت ئەوە نەفسە و بەهۆی خەصڵەتەکانی خاکەوە دەیچێژێت نە رۆح. کە ئەمە ناودرێتیەکە لە فەلسەفە و زانستی کەلامی ئیسلامیدا کە کەسێك پێش ئەو نەیکردووە.

یەکێکی دیکە لەو شتانە بریتیە لە سیفەتی مەلەکەبوونی ئیمان، ئەو کەسەی کە بوو بە ئیماندار ئیتر ناتوانێت بێ ئیمان بێت، ئەو کەسەی بوو بە ئیماندار حەتمەن دەچێتە بەهەشت و ئیدی ناچێتە جەهەننەم کە ئەمە بابەتێکە رەنگە زۆرێك لە مەلاکان لە دژی ئەم فیکرەیەی سوبحانی راست ببنەوە کە چۆن بەوجۆرەیە! لەکاتێکدا ئەوەتا لە قورئاندا هاتووە کە ﴿... و ان منکم الا واردها...﴾{١٣٧} هیچ یەکێك نیە لە ئێوە کە جەهەننەمی پێ پیشان نەدرێت، بەلام سوبحانی دەفەرمووێت وشەی (وارد) واتە چوونە کەنار، سەرێك دەکێشێت بەلایدا ئەگەر نا ﴿...کل نفس بما کسبت رهینە...﴾ هەر کەسێك یان بەهەشتی یا جەهەننەمیە ئیدی ئەوە نیە هێندەی گوناهەکانی لە جەهەننەمدا دەبێت و دوایی دەخرێتە بەهەشتەوە!... کە ئەمەش یەکێکە لە ئیستیدلالە زۆر بەهێزەکانی ناصری سوبحانی کە لە زۆرێك لە نەوارەکانیدا باسی کردووە. کە ئەمە بابەتێکی زۆر گرنگە چونکە زۆر شت هەیە ئەگەر وا نەبێت ماناکانی قورئان تێکدەچێت، کە ئەمە مەخیلەی مامۆستا ناصر پیشان دەدات کە چەندە بلیمەت و زیرەك بووە، بە رای من هەرگیز مومکین نیە لەسەردەمی مۆدێرنەدا کەسێك بەو بلیمەتیە هەلبکەوێت ئەگەر رۆشنبیری پێش مۆدێرنە نەبووایە و لەوێوە نەهاتبایە. هەر بەمەشە کێشەیەکی وەکو لە نێوان بەهەشت و جەهەننەم بوونی (أصحاب الاعراف) چارەسەر دەکات کە وتراوە دوای تەواوبوونی قیامەتیش هێشتا ئەوان لە نێوانی بەهەشت و جەهەننەمدا ماونەتەوە! بەلام سوبحانی دەفەرمووێت نا... ئەوانە فریشتەن و لەدەستەی فریشتەکانی بەهەشت و جەهەننەمن کە لە قورئاندا هاتووە.

هەروەها یەکێکی تر لە خاڵە گرنگەکانی بواری زانستی عەقاید و تەوحیدناسی لای سوبحانی بریتیە لە بابەتی کاریگەری مردوو لەسەر زیندووەکان و ژیانی دونیا. کە زۆر جوان وەلامی ئەم بابەتەشی داوەتەوە و دەکرێت مرۆڤی دیندار و یەکتاپەرست زۆرباش سوودی لێ ببینێت لە راستکردنەوەی گەلێك خورافاتی

نائیینی و بۆچوونی ناڕاست کە بەناوی ئایینەوە چوونەتە ناو زەینی خەڵکیەوە.
سوبحانی بە ئیستیدلالی قورئانی و فەرموودەیی زۆرباش دەیسەلمێنێت کە مردووەکان هیچ کاریگەریەکیان لەسەر ژیانی زیندووەکان نیە. چەندین ئایەت دەهێنێتەوە بۆ ئەم بابەتە، وەك ئایەتی ﴿...انك لاتسمع من في القبور..﴾ {١٣٨} کە ئەمە وەکو تەشبیهێکە بەو مرۆڤانەی کە باوەڕیان پێت نیە، کە لە تەشبیهیشدا دەبێت رووی لێکچوواندنەکە لە لێچوو —مشبە بە— دا بەهێزتر بێت لە لەوچوو —مشبە—کە، واتە تۆ ناتوانیت بەم بێ بڕوایانە ببیستێنی هەر وەکو چۆن مردووەکان ناتوانن هیچ لە تۆوە ببیستن، کەواتە کافرەکان تەشبیە کراون بە مردوو، بەو مانایەی کە مردوو هەر زۆر نابیستێ. بەمجۆرە چەندین ئایەت دەهێنێتەوە لەسەر ئەوەی کە مردووەکان هیچ کاریگەری وئاگایەکیان بەسەر ژیانی دونیاوە نیە و بۆچوونێکی لەوجۆرە لە خورافەیەك زیاتر نیە! {١٣٩}.

کۆتا وتەم دەربارەی سوبحانی لەسەر ئەو بۆچوونەی زۆربەی هاوڕێکانی کە پێیان وایە تەنها سەرچاوەی مامۆستا ناصر بریتی بووە لە قورئان. بەلام بەپێی زانستی هێرمەنیوتیك —علم التأويل— و هەر بەخودی دراسەکردنی قورئان و ژیانی مامۆستاش دەردەکەوێت کە کەسێك مومکین نیە بتوانێت بەتەنها مەعریفە دابهێنێت، وەکو پێشتریش ئاماژەم پێدا، مەعریفە شوناسێکی بەکۆمەڵی هەیە و مەعریفەی ئایینیش جیاوازە لەخودی ئاین، هەروەك لەباسی قۆناغەکانی ژیان و رۆشنبیری سوبحانیدا دەرکەوت. بۆیە کەسێك ناتوانێت بە تەنهایی مەعریفە دابهێنێت جگە لەوەی لە کۆمەڵگەوە ئەو مەعریفەیەی وەرگرتبێت، بەلام ئەمە وەکو پێشەکی و سەرچاوەیەك مەرج نیە راستەوخۆ دەرەنجامەکانی لەو مەعریفە پێشینەوە گرتبێت، بەڵکو وەك باسمان کرد زۆر شتی نوێی لە قورئان و زانستە ئایینیەکاندا کەشفکردووە کە پێش ئەو بوونیان نەبووە وئەمەش بلیمەتی سوبحانیمان پیشان دەدات کە چۆن توانیویەتی بۆ ئەو بابەتانە بچێت! ئەگەر وەکو زانستی هێرمەنیوتیکا بە دڵنیاییەوە دەڵێم کە بابەتە وروژێنراوەکانی لای سوبحانی ریشەیان هەیە لە کلتور مەعریفەی پێش مۆدێرنە و هەروەها لە رۆشنبیری نوێشدا. بەلام ئەو توانیویەتی ئیستیدلالی پێش مۆدێرنانە بکات هەروەکو چۆن لە باسی نوورسیدا وتمان ئەگەرچی سەعید نوورسی لەسەردەمی نوێدا ژیاوە، بەلام

توانیویەتی رۆحی عیرفانی پێش مۆدێرنەش بپارێزێت، بۆیە گرنگی سوبحانیش لەم خاڵەدایە.

بۆ نموونە فەقیهەکان ئێستا لە زانستە مرۆییەکانەوە دەچنەوە بۆ فەتوا، بەلاّم مامۆستا ناصر کلتوری نەشێواندووە، بەڵکو کلتوری بەکار هێناوە لە فەتواکانیدا و لە هەمان کاتیشدا بۆشاییەکانی سەردەمی نوێشی کەشفکردووە، نەهاتووە لە کلتور و سەردەمی نوێدا یەکێکیان بەسەر ئەوی دیکەدا زاڵ بکات و بیسەپێنێت، بۆشاییەکانی سەردەمی نوێی بینیووە و لەکلتوریش سوودی وەرگرتووە و بەکاری هێناوە، مەبەستیشم لە کلتور سەرچاوەی یەکەمی ئایینە کە وەحیە —نە ئەوەی کە هەندێك کەس دەیلێن— و هەروەها مەعریفەی ئایینیش بەگشتی. بۆیە دواجار وەکو زانستی تەئویل لانیکەم وەك وروژاندنی بابەتەکانیش بێت ئەوا سوبحانی سوودی لە سەرچاوەی دیکە بینیووە، هێندەی بەراوردم لە نێوان مامۆستا ناصر و کاك ئەحمەددا کردبێت بۆم دەرکەوتووە زۆربەی ئەو شتانەی کە بوونەتە سیستەمێك لای سوبحانی، چ بابەتە ئایینیەکان بێت یان بابەتەکانی زانستە مرۆڤایەتیەکان و زانستە ئەزموونیەکان بێت کە ئیستیدلالی قورئانی بۆ کردوون، لای کاك ئەحمەدیش هەن بەلاّم بەمیتۆدی و بەکورتی، بەحوکمی جیاوازی تەمەنیشیان بێت هەست بەم کاریگەریەی فیکری موفتیزادە دەکەیت بەسەر سوبحانیەوە. راستە مەدرەسەی قورئانی مامۆستا ناصر لە پاوەدا جیاواز بووە لە مەکتەبی قورئانی کاك ئەحمەد بەلاّم هەر لە خودی فیکرەکەیاندا هەست بە لێکچوون و نزیکیەك دەکرێت. تەنانەت خودی کاك ئەحمەدیش دانی بەوەدا ناوە ئەوەی کە سوبحانی لە هەندێك بابەتدا پێکاویەتی کە ئەو نەیپێکاوە! {١٤٠}.

هەروەها دەتوانم بڵێم یەکێکی دیکە لەسەرچاوەکانی بریتی بووە لە رۆشنبیری و کلتوری دەوڵەمەندی ئێرانی، بەتایبەتی رۆشنبیرە ئایینیەکانی وەکو (مطهری) و (عەلی شەریعەتی) و (عبدالکریم سروش) و (طالقانی)و...هتد، یەکێکی دیکە لە سەرچاوەکانی بریتی بووە لە رۆشنبیرە ئایینیەکانی ولاّتە ئیسلامیەکانی دیکە وەکو (ئەبو ئەعلای مەودودی) و (ئیمام بەننا) و (سەعید نوورسی) کورد و (جەمالەدینی ئەفغانی) و (محمد عبدە) و... هتد، کە بۆ وروژاندنی بابەتەکان خوێندنەوە و بەدواداچوونی بۆ فیکر و بەرهەمەکانی ئەو کەسایەتیانە هەبووە، بەبۆچوونی من لە قورئانناسیدا سوودی لە تاڵەقانی بینیووە، هەروەها لەجیاکردنەوەی شەریعەت

لەگەڵ جیهانبینی ئیسلامیدا و لە ناسینی ئەحکام و ئایینی نورماتیڤدا سوودی لە (دکتۆر عەبدولکەریم سروش) بینیووە بەتایبەتی کتێبی (دانش و ارزش)ی کە لە زۆرێك لە کاسێت و نەوارەکانیدا راستەوخۆ یان ناراستەوخۆ ئاماژەی پێکردووە. تەنانەت خوێندنەوەکانی لەوە و پێشتری هێندە قووڵ لە نەستیدا چەسپیوون، کاتێك باسی ئەوە دەکات کە مرۆڤی ئیماندار ناچێتە دۆزەخ و حەتمەن هەر کەسێك ئیمانی هەبوو دەچێتە بەهەشت، یەکێك لە هاورێکانی پێی دەڵێت خۆ خەواریجەکانیش وا دەڵێن، سوبحانیش دەڵێت بە راست وا دەڵێن! ! ئەمەش مانای ئەوەیە کە زۆر سوودی لەبیروبۆچوونی فیرقە جیاوازەکانی نێو کلتوری ئیسلامی بینیووە. بۆیە مامۆستا ناصر ئەو کاتەی یەکلایی بووەتەوە بۆ دیراساتی قورئانی زۆر سوودی لەم پاشخانە مەعریفیەی وەرگرتووە. بۆ نموونە زۆرجار ئیستیدلال بەشیعرەکانی ئیقبال دەکات کە مومکین نیە ئاگاداری شیعرەکانی بوو بێت بەڵام ئاگای لە فیکری فەلسەفی ئەو نەبووبێت! !. تەنانەت سودی لە کتێبی (مێژووی ئێران)ی دوکتۆر (مطهری) بینیووە و زۆر بۆچوونی ئەوی لەبابەتەکانیدا تەوزیف کردۆتەوە، بەمجۆرە هەست دەکەیت سوود بینین لە فیکر و بەرهەمەکانی زۆرێك لە مەرجەع و کەسایەتی و بیریارە ناسراوەکانی ئێران لە نموونەی (مطهری) و (طباطبایی) و (عبدالکریم سروش) و...هتد، لە دیوی نادیاری فیکر و بابەتەکانی سوبحانیدا بوونی هەیە، بەڵکو قسەشی لەسەریان هەیە. ئاخر سوود بینین تەنها بریتی نیە لەوەی قسە و بۆچوونی بەرامبەرەکان بگوازێتەوە، بەڵکو پێچەوانەی ئەویشە، ئەوەی کە (خاتەمی) دەڵێت ئێمە بە رۆژئاواوە دەژین، چونکە چ ئەوانەمان بەگوێی رۆژئاوا دەکەن و چ ئەوانەشمان کە دەمانەوێت جیا بین لە ئەو دواجار پێوەرەکە بۆ هەر دوو لا رۆژئاوایە، بۆیە مومکین نیە ورووژاندنی رۆشنبیری یاخود مەعریفە کەسێك بۆ خۆی دایبهێنێت، بەڵام دەکرێت دەرەنجامەکان نوێ بن و حوکمی لەسەریان ببێت.

بەکورتی سوبحانی سوودی لە فیکری ئەهلی تەشەیوع و ئیعتیزالیش بینیووە و راستیشی کردوونەتەوە، بۆ نموونە ئەو رەخنەیەی کە ئەهلی تەشەیوع لە (اصحاب)ی دەگرن، بە بۆچوونی من سوبحانی بە ئیستیدلالێکی قورئانی زۆرباش وەلامی داونەتەوە، بەڵام خۆ ورووژاندنی بابەتەکە لەلایەن ئەوانەوە بووە کە وایکردووە ئەم بدوێت لەسەری. لەم بابەتەدا بەڵگە بەو ئایەتە دەهێنێتەوە کە باسی

(بیعة الرضوان) دەکات ﴿...الذین یبایعونك تحت الشجرة...﴾{١٤١} کە خودا دەفەرمووێت رازیم لە ئەوانە —رضی الله عنهم— دەی ئەوانە حەزرەتی عومەر و ئەبوبەکریشی تێدا بووە، تەنانەت ئەوانەشیان کە ئامادە نەبوون لەوێ پێغەمبەری خودا لەبری ئەوان دەستی داناوە. باشە کاتێك خودا یەکە یەکە لە کەسەکان رازیە ئیتر چۆن دەڵێیت ئەوەیان موونافیقە یان فلان و فیسار سیفەتی دەدەیتە پاڵ؟!
بۆیە دەبینیت هەر بە قورئان وەلامی داونەتەوە و هەروەها وەلامی وروژاندنی بابەتی ئیمامەتیشی داونەتەوە بەتایبەتی لە کتێبی (الولایة و الامامة)دا وەك پێشتریش ئاماژەمان پێدا، بەڵام دواجار لە هەموو ئەمانەدا بابەتەکان ئەوان وروژاندویانە ئەگەرچی دەرەنجامەکانی مامۆستا ناصر شتێکی دیکە بوو بن!.

## پەراوێزەکان:

١-

عبدالكريم زيدان، الوجيز اصول الفقة، نشر احسان، تهران الطبعة الاولى، ص٨.

٢- ناصری سوبحانی، زنجیرە کاسێتی نیزامی ئیقتیصادی ئیسلامی، کاسێتی چوارەم.

٣- عومەر عەبدولعەزیز، ژیاننامەی شەهید ناصری سوبحانی، دەستنووس.

٤- هەمان سەرچاوەی پێشوو.

٥- هەمان سەرچاوەی پێشوو.

٦- بديع الزمان سيعيد النورسى، سيرة ذاتية، اعداد وترجمة: احسان قاسم الصالحى، دار سوزلر للنشر، استانبول، الطبعة الاولى، ١٩٩٨، ص٥٢٦.

٧- سەرچاوەی پەراوێزی ژمارە (٢).

٨- زنجیرەی نیزامی سیاسی ئیسلامی، بە تایبەت کاسێتەکانی ژمارە (٤-٥).

٩- زنجیرە کاسێتەکانی ئوصول الفقه، بەتایبەت کاسێتی ژمارە (٦).

١٠- هەمان سەرچاوەی پێشوو هەمان سەرچاوە.

١١-ناصری سوبحانی، کتێبی (الفتاوی)، دەستنووس.

١٢- لە چاوپێکەوتنێکی راستەوخۆدا هاوڕێی نۆ ساڵی پێش زیندانی مامۆستا عومەر عەبدولعەزیز بۆی گێڕامەوە.

١٣- هەمان سەرچاوەی پێشوو

١٤- مصطفى ملكيان، راهى بەرهايى، نشر نگاه معاصر، تهران، ١٣٨٠، ص ٣٥.

١٥- عبدالرحمن حسن حبنكة الميدانى، ضوابط المعرفة واصول الاستدلال والمناظرة، دار القلم، دمشق، الطبعة الخامسة، ١٩٩٨، ص٢٧٠.

١٦- الامام تاج الدين عبدالوهاب ابن السبكى، جمع الجوامع، نشر: كتابفروشى محمدى سقز، ص٢٣.

١٧- على صادق اسماعيل، الشيخ ناصر السبحانى و منهجة فى التفسير بحث مقدم الى كلية الشريعة والدراسات الاسلامية، ٢٠٠٤، ص٢١.

١٨- زنجیرەی کاسێتی (علوم الحديث) بە زمانی کوردی.

١٩- ناصری سوبحانی، زنجیرە کاسێتی تەفسیری سورەتی (البقرة).

٢٠- نگڵ دێیەکی ناسراوە بە قورئانە دەستنووسەکەیەوە، کە لە نێوان شاری سنە و مەریواندایە.

٢١- سه‌رچاوه‌ی په‌راوێزی ژماره (١٩).
٢٢- مامۆستا عومه‌ر عه‌بدولعه‌زیز له‌سه‌ر زاری سوبحانیه‌وه گێڕایه‌وه.
٢٣- هه‌مان سه‌رچاوه‌ی پێشوو.
٢٤- هاوڕێی سوبحانی مامۆستا عومه‌ر عه‌بدولعه‌زیز بۆی گێڕامه‌وه.
٢٥- ناصر سبحانی، بینش اسلامی، ده‌ستنووس ٢٥ل.
٢٦-کتێبی (المصطلحات الاربعة)ی بیریاری ناودار ئه‌بوئه‌علای ئه‌لمه‌ودودی.
٢٧- سه‌رچاوه‌ی په‌راوێزی ژماره (٣).
٢٨- هه‌مان سه‌رچاوه.
٢٩- هه‌مان سه‌رچاوه.
٣٠- ته‌حسین حه‌مه غه‌ریب، ژیان به ئایینه‌وه جوانه، گۆڤاری هه‌ژان ژماره (١٤-١٥) ل٢٥٠.
٣١- ناصری سبحانی، کتێبی (الولایة والامامة)، ده‌ستنووس.
٣٢- سه‌رچاوه‌ی په‌راوێزی ژماره (١٢).
٣٣- هه‌مان سه‌رچاوه.
٣٤- هه‌مان سه‌رچاوه.
٣٥- هه‌مان سه‌رچاوه.
٣٦- سه‌رچاوه‌ی په‌راوێزی ژماره (٨).
٣٧- سه‌راچاوه‌ی په‌راوێزی ژماره (١٢).
٣٨- هه‌مان سه‌رچاوه.
٣٩- سه‌رچاوه‌ی په‌راوێزی ژماره (٣).
٤٠- ناصری سوبحانی کاسێتی ته‌فسیری سوره‌تی (العادیات).
٤١- ناصری سوبحانی کاسێته‌کانی ته‌فسیری سوره‌تی (الانفال، الحج)
٤٢- (وه‌سیه‌تنامه) وه (گیانی وه‌سیه‌تنمامه)ل٤.
٤٣- ناصر سوبحانی، کاسێته‌کانی (شرح اربعین نووی).
٤٤- سه‌رچاوه‌ی په‌راوێزی ژماره (٢).
٤٥- بۆ نموونه بڕوانه فه‌تاواکانی (د.یوسف القرضاوی) چوار به‌رگ.
٤٦- سه‌رچاوه‌ی په‌راوێزی ژماره (١٢).
٤٧- سه‌رچاوه‌ی په‌راوێزی ژماره (٣).
٤٨- قورئانی پیرۆز سوره‌تی (الشعراء) ئایه‌تی (١٧).

٤٩- تەحسین حەمە سعید، داهێنان لە ساتی کۆتاییدا، گۆڤاری هەژان ژمارە (١٦) ل١٢٨.

٥٠- ناصری سوبحانی، کورتکراوەی مەقاصیدی ئیمامی شاطبی، دەستنووس.

٥١- ناصری سوبحانی، دوو کاسێتی القتال.

٥٢- ناصری سوبحانی زنجیرە کاسێتی (اسماء الله).

٥٣- بە بۆچوونی من هزری کەسێکی وەك فاروق ردفیق نوێنەری ئەم تەرزەیە.

٥٤- عبدالکریم سروش و دیگران، سنت سیکولاریزم، مؤسسەی فرهنگی صراط، تهران چاپ دوم، بهار ١٢٧٢،ص١٢٩.

٥٥- سەرچاوەی پەراوێزی ژمارە (١٢).

٥٦- هەمان سەرچاوە.

٥٧- هەمان سەرچاوە.

٥٨- هەمان سەرچاوە.

٥٩- ناصر سوبحانی، کاسێتەکانی شەرحی (جمع الجوامع) کاسێتی سێیەم.

٦٠- ناصر سوبحانی، زنجیرە کاسێتەکانی بەندایەتی.

٦١- تەحسین حەمە غەریب (ئیسلامی گەردوونی، ئیسلامی ئەنسرۆپۆلۆجی، ئیسلامی فیلۆلۆجی) گۆڤاری هەژان ژمارە (١).

٦٢- ناصر سوبحانی، دوو کاسێتی (القتال)..

٦٣- گفتوگۆی سوبحانی لەگەڵ مەلا ئەحمەد ناوێکدا.

٦٤- ناصر سوبحانی، تەفسیری سورەتی (الفاتحة).

٦٥- سەرچاوەی پەراوێزی ژمارە (١٢)ل٣.

٦٦- ناصر سوبحانی، (المفاهیم) دەستنووس.

٦٧- سەرچاوەی پەراوێزی ژمارە (١٢)ز

٦٨- هەمان سەرچاوە.

٦٩- (descriptive and prescriptive).

٧٠- زنجیرە کاسێتەکانی (التوحید) کاسێتی ژمارە (٨).

٧١- عبدالله تحوض عبدالله، سید قطب، الادیب الناقد، الطبعة الاولى، مکتبة المنار – الزرقاء.

٧٣- ناصری سوبحانی، زنجیرە کاسێتی تەفسیری سورەتی (الحج).

٧٤- ناصری سوبحانی، شرح أربعین نووی، باسی شایەت و ئیمان و تەفسیری سورەتی (النبأ).

٧٥- محمد عابد الجابرى، الدين والدولة وتطبيق الشريعة، مركز دراسات الوحدة العربية، بدون تأريخ.
٧٦- ناصرى سوبحانى، زنجیرە کاسێتی (شرح شذور الذهب)، بەشى (أفعال و فعلى مضارع.
٧٧- سەرچاوەی پەراوێزی ژمارە (٧٣).
٧٨- سەرچاوەی پەراوێزی ژمارە (٧٤).
٧٩- ناصرى سوبحانى تەفسیری سورەتی (لقمان).
٨٠- سەرچاوەی پەراوێزی ژمارە (٣٠).
٨١- ئەحمەدی موفتیزادە، دوو کاسێتی (ئیسرا و میعراج)، ژمارە (٢).
٨٢- قورئانی پیرۆز، سورەتی (ال عمران)، ئایەتی (٥٩).
٨٣- قورئانی پیرۆز، سورەتی (ال عمران)، ئایەتی (٧).
٨٤- الدكتور عصام العطية، القانون الدولى العام، وزارة التعليم العالى والبحث العلمى، كلية القانون الطبعة الخامسة، ص ٣٥٠، الدكتور منذر الشاوى، مذاهب القانون مركز البحوث القانونية، وزارة العدل، بغداد ١٩٨٦.
٨٥- ناصرى سوبحانى، تەفسیری سورەتی (الاعراف) کاسێتی دووەم.
٨٦- دوو کاسێتی زانستەکانی فەرموودە، دەستنووسێکی سوبحانی کە بۆ زانایانی ئەنسکلۆپیدیای (سوننەت)ی نووسیوە.لە کەنداو، دەستنووس، ل١٠.
٨٧- ناصرى سوبحانى، تەفسیری سورەتی (عبس)، دوو کاسێت.
٨٨- دوو کاسێتی فەرموودە.
٨٩- تەفسیری سورەتی (عبس).
٩٠- ناصرى سوبحانى، تەفسیری سورەتی (ال عمران) ئایەتی (١٨٧).
٩١- ناصرى سوبحانى، زنجیرە کاسێتەکانی (اصول الفقه)، بەشی کیتاب لە سەرچاوەکانی شەریعەت.
٩٢- مەبەست ئایەتی تەغیری خەلقی خودایە لە قورئانی پیرۆزدا، سورەتی (النساء) ئایەتی (١١٩).
٩٣- سەرچاوەی پەراوێزی ژمارە (٨٧).
٩٤- دی سوسیر، علم اللغة العام، ت: د.یوئیل یوسف عزیز، بغداد ١٩٨٦.
٩٥- دوو کاسێتی زانستەکانی فەرموودە.
٩٦- زنجیرە کاسێتی الناسخ والمنسوخ، کاسێتی یەکەم.
٩٧- سەرچاوەی پەراوێزی ژمارە (٩١).

٩٨– هەمان سەرچاوە.
٩٩– زنجیرە کاسێتەکانی بەندایەتی، کاسێتی (١–٢).
١٠٠– ناصری سوبحانی، کتێبی (الفتاوی)، دەستنووس، ل٩ بەدواوە.
١٠١– ناصری سوبحانی، زنجیرە کاسێتەکانی بەندایەتی، کاسێتی (١–٢).
١٠٢–– ناصری سوبحانی، زنجیرە کاسێتەکانی نیزامی سیاسی (٦–٧).
١٠٣– هاوڕێی سوبحانی عومەر عەبدولعەزیز، ژیاننامەی شەهید ناصری سوبحانی، دەستنووس.
١٠٤– تەحسین حەمە غەریب، گۆڤاری دوانگە، ژمارە (٢٦).
١٠٥–- سەرچاوەی پەراوێزی ژمارە (١).
١٠٦– سەرچاوەی پەراوێزی ژمارە (١٠٢).
١٠٧– سەرچاوەی پەراوێزی ژمارە (١٠٤).
١٠٨– قورئانی پیرۆز، سورەتی (النساء)، ئایەتی (٥٩).
١٠٩– قورئانی پیرۆز، سورەتی (ال عمران)، ئایەتی (١٠٤).
١١٠– تەفسیری سورەتی (ال عمران)، زنجیرە کاسێتەکانی نیزامی سیاسی.
١١١– ئەحمەدی موفتیزادە، حکومەتی ئیسلامی.
١١٢– هەمان سەرچاوە.
١١٣– ناصری سوبحانی، کتێبی (الولایة والامامة)، دەستنووس
١١٤– قورئانی پیرۆز سورەتی (الحشر)، ئایەتی (٧).
١١٥– ناصری سوبحانی، شرح الاربعین النوویە، بابەتی زەکات.
١١٦– قورئانی پیرۆز، سورەتی (البقرة) ئایەتی (٢١٥).
١١٧– ئازاد مودەڕیس ، هەژان ژمارە (٣)، هەڵکۆڵینێك لە قورئانەوە.
١١٨– ناصری سوبحانی، زنجیرە کاسێتەکانی نیزامی ئیقتیصادی ئیسلامی، کاسێتی (٣–٤–٥).
١١٩– دوو کاسێتی (القتال).
١٢٠– سەرچاوەی پەراوێزی ژمارە (١٥).
١٢١– قورئانی پیرۆز، سورەتی (البقرة)، ئایەتی (٤٤).
١٢٢– قورئانی پیرۆز، سورەتی (المائدة)، ئایەتی (٥٤).
١٢٣– ناصری سوبحانی، پێشەکی تەفسیری قورئانی پیرۆز، بە زمانی فارسی دەستنووس.
١٢٤– هەمان سەرچاوە.

١٢٥- سەرچاوەی پەراوێزی ژمارە (٩١) باسی کیتاب.
١٢٦- سەرچاوەی پەراوێزی ژمارە (١٢٣).
١٢٧- ناصری سوبحانی، تەفسیری سورەتی (القصص).
١٢٨- ناصری سوبحانی، تەفسیری سورەتەکانی (الاحزاب، التوبە، النور).
١٢٩- ناصری سوبحانی تەفسیری سورەتی (التوبة).
١٣٠- ناصری سوبحانی تەفسیری سورەتی (الاحزاب).
١٣١- قورئانی پیرۆز، سورەتی (الاحزاب) ئایەتی (٦٠ ).
١٣٢- ناصری سوبحانی، تەفسیری سورەتی (الاحزاب) بابەتی (زەید و زەینەب).
١٣٣- ناصری سوبحانی سێ کاسێتی (الزواج).
١٣٤- ناصری سوبحانی، کاسێتەکانی (اسماء الله).
١٣٥- د. علي حسين الخلف/ ا.سلطان عبدالقادر الشاوي المبادء العامة في قانون العقوبات، وزارة التعليم العالي والبحث العلمي/ جامعة بغداد، بغداد١٩٨٢ ص٢٤
١٣٦_قورئانی پیرۆز،سورەتی الاسراء، ئایەتی(٥٧)
١٣٧_قورئانی پیرۆز، سورەتی(مریم)، ئایەتی٧١
١٣٨-قورئانی پیرۆز،سورەتی(فاطر)ئایەتی(٢٢)١٣٩-سەرچاوەی پەراوێزی ژمارە(٧٠)-
١٤٠سەرچاوەی پەراوێزی ژمارە(١٢)
١٤١-قورئانیپیرۆز، سورەتی (الفتح)، ئایەتی(١٨).

# بەشی سێیەم
# ئەحمەدی موفتیزادە و
# دواهەناسەکانی فەلسەفەی ئیسلامی

ئەگەر توانیبێتمان لە دووبەشی رابردوودا تەنها شتێکی کەمیش بێت لەسەر هەردوو کەسایەتی مەزنی (سەعید نوورسی) و (مامۆستا ناصر) بنووسین کە بە بۆچوونی من دوواین (عاریف و فەقیهی) شارستانیەتی ئیسلامی بوون، بەراستی رەنگە نەمتوانیبێت ئەوەی پێویستە لە بارەی ئەو کەسایەتیە مەزنانەوە بینووسم، کە فرە رەهەندی و فراوانی فیکر و مەعریفەی ئەوان زۆر لەوە زیاتر هەڵدەگرێت لە بارەیانەوە بنووسرێت، بەڵام ئەوەندەی توانیبێتم هەوڵمداوە تێگەیشتنی خۆم بۆ ئەو کەسایەتیانە لە ماوەی پانزە ساڵ ئەزموونی ژیانم لەگەڵ بەرهەم و بابەتەکانیاندا پیشان بدەم، کە هەر لە پۆلی یەکەمی ناوەندیەوە هەتا ئێستا لە خزمەت بابەتەکانی (مامۆستا نوورسی)دا ژیاوم، دوای کیمیابارانی هەڵەبجە و چوونمان بۆ ئێران چوومە خزمەت بابەتەکانی (مامۆستا ناصر) و زیاتر بە بەرهەم و بابەتەکانی ئەویش ئاشنا بووم.

هەروەها لەم بەشەدا دەمەوێت لەسەر فیکری (کاک ئەحمەد) بنووسم ئەوەندەی کە من خوێندبێتمەوە و ئاگاداری فیکری ئەوبم، رەنگە خەڵکی دیکە زۆر شتی لەسەر نووسیبێت، هەیە لە رێگەی شیعرەکانیەوە ناسیویانە، هەیە لە رێگەی سیاسەتەوە و ئەو ململانێ سیاسیانەی کە (کاک ئەحمەد) لە قۆناغەکانی تەمەنیدا تێیدا ژیاوە هەر لە سەرەتای بوونی لەناو حیزبی دیموکرات لە پێش ساڵی چل و سێی هەتاوی و تا دواتر کە یەکلایی بۆتەوە بۆ بانگەوازی ئیسلامی و ئەو سەردەمەی کە ئیتر پێی

وابووە دەبێت لە (تەزکیە)وە بڕوانەوە بۆ (تەعلیم) - کە لە بەشەکانی پێشتردا ئاماژەمان بۆ کردووە، بۆیە هەرکەسێك لە رەهەندێکەوە هەوڵی پیشاندان و ناساندنی (موفتیزادە)ی داوە، وەك (دکتۆر سروش) کە لە جورئەت و ئازایەتیەوە (خومەینی) و (حەزرەتی عەلی) خوێندۆتەوە، مەعریفەی مرۆڤی سەربەرز مەعریفەیەکی گەورەیە، ئایینی مرۆڤی سەربەرز ئایینێکی سەربەرزانەیە، جا (کاك ئەحمەد) بە حوکمی ئەوەی باکی نەبووە و پیاوێکی سەربەرز بووە، پیاوێك بووە ترسی نەبووە لە هەستیارترین بابەتدا قسەی خۆی کردووە، تەنانەت دوای ئینقیلاب و گەڕانەوەی خومەینی، لەکاتی گەڕانەوەی رابەری ئێرانی لە کۆبوونەوە جەماوەریەکەی تاران، دوای تەواوبوونی قسەکانی (خومەینی) ئەویش قسەی کردووە. هەروەها دوای نووسینی دەستووری ئێرانی بەرامبەر هەموویان رەخنەی گرتووە. تەنانەت لەو دانیشتنەدا کە لە تاراندا سازکراوە و زۆرێك لە بیریاران و لێپرسراوانی ئێرانی لە وەزارەتی ئیرشاد گوێیان لێی بووە تەعبیرێك کە ئاماژەی پێدەکات و ئێستاش لە گوێمدا زرنگەی دێت بریتیە لەوەی کە پێیان دەفەرموێت (دەستتان بشکێت بۆ خۆتان و یاسایەکی بنەڕەتی — قانون اساسی— کە نووسیوتانە){١} بڕواناکەم پیاوێکی وەکو ئەو نەبوایە کەسێکی دیکە بیوێرایە بەم جۆرە قسە بکات، پیاوێك کە هەمیشە وەکو هەژارەکانی (سنە) چاکەتێك و شەروالێکی کوردی لەبەربووە{٢} بۆیە هەروەکو چۆن (عەبدولکەریم سروش) لە رێی بوێریەوە باسی خومەینی دەکات، هەروەها (عەباس مەحمود عەقاد)یش بیریارێکی گەورەی میسریە بە هەمان شێوە وەسفی (حەزرەتی عەلی) دەکات، دەکرێت ئێمەش بوێری بکەینە دەستکەلای خۆمان و وەسفی (کاك ئەحمەدی موفتیزادە)ی پێبکەین، کە ئەمە ئەو خەسڵەتەیە لای (موفتیزادە) کە پەیوەندیەکی رۆحی بۆ من لەگەڵ ئەودا دروست کردووە و لە زۆر هەڵوێستی خۆدا جورئەتی پێبەخشیوم، هی واهەیە لە رەهەندی کۆمەڵایەتیەوە (کاك ئەحمەد)ی خوێندۆتەوە، کە دەشێت بڵێین لە دیارترین سەرکردەکانی بزوتنەوە ئیسلامیەکان و فیکری ئیسلامیە لە سەردەمی نوێدا کە بە بۆچوونی من لە هەموویان زۆرتر توێژی هەژاری خۆشویستووە، تەنانەت لەو پۆلبەندیەدا کە بۆ جوانی و جوانناسی دەکات، جوانی دەرەکی و جوانی قەلبی کە من بینیومە لە شوێنی دیکەدا بۆ نموونە لە فیکری چەپ و مارکسیدا یارمەتیدانی هەژاران دەبێتە بەشێك لە ئەدەبیات و ناوی

دەنرێت (ریالیزم)، بەڵام ئەوەی کە هەر خودی ئیحساس لەگەڵ هەژاراندا جوانی بێت مەقامێکە لای (موفتیزادە) زۆر بە زەقی هەستم پێکردووە — ئەمەش وەکو رەخنەگرێك و خوێنەرێکی بەردەوامی بواری ئەدەبیات و ئەدەبیاتناسی دەیڵێم— کە ئەو مەقامە ئەوەندە بەرزبۆتەوە لای (کاك ئەحمەد) نەك هەر یارمەتیدانی هەژاران واجیبە، وەکو ئەوەی لە زانستی ئەخلاق و فیقهدا دەوترێت، نەك هەر ئیحسان و خەیرە بەڵکو جوانناسیە، بەشێکە لە هەستی جوانی ئەو، لە یەکێك لەو کاسێتانەیدا کە باسی هەستی جوانبینی و جوانناسی دەکات هەست دەکەیت ژیان لەگەڵ هەژاراندا بە بەشێکە لە جوانی دەبینێت{٣}.

رەهەندێکی دیکەی کەسایەتی (کاك ئەحمەد) کە کەمتر لە رووکەشدا دەردەکەوێت و رەهەندێکی زۆر قووڵە لای موفتی زادە: بریتیە لە چرکەساتە فەلسەفیەکانی (کاك ئەحمەدی موفتیزادە) کە هەرگیز لەبیر ناچن، ئەگەر دوایین فەیلەسوفی ناو مێژووی ئیسلامی بریتی بێت لە (مەلا صەدرا) کە تیۆریای (حیکمەتی باڵا)ی نوسیووە، ئەوەی ناودەبرێت بە (حیکمەتی باڵا —الحکمة المتعالیة—)، بە بۆچوونی من (کاك ئەحمەد) لەو چرکەساتە فەلسەفیانەیدا یاخود لەو کاسێتانەیدا کە باسی فەلسەفە و بابەتە فەلسەفیەکان دەکات یاخود ئەو بابەتانەی کە لە هەندێك باسی تایبەتدا ئاماژەی پێکردوون هەست دەکەیت لە بۆچوونە فەلسەفیەکانیدا زۆر قووڵ رۆیشتووە، دەکرێت ئەمە بابەتی چەندین کتێب لەسەر نووسین بێت، ئەوە دەهێنێت هەزاران پەڕەی لەسەر بنووسین ، رەنگە بەهۆی نەمانی هەستی فەلسەفی لەلای رۆشنبیرانی ئایینی ئێمە زۆر هەست بەم بابەتە نەکرێت. بۆ نموونە من کاتێك گوێم لە یەکەم کاسێتی (کاك ئەحمەد) بوو مامۆستای فیهقی ئیسلامی بووم لە حوجرە، کە باسی (مومکین و واجب و ممتنع)ی دەکرد لە زانستی کەلامی ئیسلامیدا شۆکەیەکی لا دروست کردم و قووڵتر بردمیە ئەو دیوەوە، ئەمە بێجگە لەوەی کە (کاك ئەحمەد) لە هەندێك شوێندا رەخنە لە فەیلەسوفەکان دەگرێت، ئەوانەی کە بەرهەمی کرداری لە تیۆریە فەلسەفیەکانیاندا نیە، ئەمەش وای لە (کاك ئەحمەد) کردووە کە بیەوێت دووبارە بینایەکی فەلسەفی دابرێژێتەوە کە بەرهەمی کرداری ببێت، بۆیە دەکرێت ئەو جۆرە مامەڵەیەی (کاك ئەحمەد) ناوبنێین فەلسەفەی کرداری یاخود (فەلسەفەی نۆرماتیف){٤} کە لە شوێنی دیکەشدا باسمان لێکردوە، کە هەنوکە ئەم فەلسەفەیە کەمترین ئامادەیی

هەیە؛ چونکە فەلسەفەی کۆن فەلسەفەی میتافیزیکیە، لەگەڵ ئەوەشدا کە قەریحەی (موفتیزادە) قەریحەیەکی فەلسەفی میتافیزیکیانەیە، واتە لە (کل)ەوە دێتەوە بۆ (جزء)، ئیمبریقیا نیە لە (جزء)ەوە بڕوات بۆ (کل)، بۆیە دەبینیت کە باس لە (کلیات)ی بوون دەکات لە نموونەی (خود) و (مرۆڤ) و (خەلق) و...هتد، بەلام لە هەمان کاتیشدا هەست دەکەیت جوان توانیویتی کۆکردنەوەیەك بکات لە نێوان فیکر و فەلسەفەی ئیسلامی و خوێندنەوەی ئەو بۆ (قورئان) لەگەڵ سۆسیۆلۆجیادا{٥}.

دەتوانین بڵێین سوودی لە (د.عەلی شەریعەتی) بینیوە لەو بوارەدا، بەلام ئەمە لەروو کۆمەلایەتیەکەیەوە کە دواتر ئەو خۆی بۆ خۆی فەلسەفەی بۆ زیاد کردووە، لێرەوە بە کورتی ئەگەر کەسانی دیکە هەریەکە و لە رەهەندێکەوە هەوڵی ناساندنی (کاك ئەحمەد)یان دابێت، ئەوا من بۆ خۆم لە رێگەی فەلسەفەی (کاك ئەحمەد)ەوە کاك ئەحمەدم ناسیوە و هەر لێرەشەوە دەتوانم لەسەری بنووسم، کە دەکرێت ئەمە دەروازەیەکی باش بێت تا لێیەوە قسە لەسەر شتەکانی دیکەشی بکەین.

## قۆناغەکانی ژیانی کاك ئەحمەد:

بە بۆچوونی من ئەم دیووە فەلسەفیەی (موفتیزادە) لەو قۆناغەی ژیانیدا کە دەبێتە مامۆستای زانکۆ روونتر دەردەکەوێت، چەند ئاگادار بووە بە مەکتەبە فەلسەفیەکان، بۆ نموونە مەکتەبی وجودی لای (سارتەر) کە ئەوەندەی من خوێندبێتمەوە لای زۆرێك لە بیریارانی ئیسلامی بێجگە لە زەمکردنی شتێکیان پێنەبووە دەربارەی، ئەوە نەبێت کەسێکی وەکو (ئەحمەدی موفتیزادە) لە حەفتاکاندا بە جۆرێکی زۆر سەرنجراکێش مەدحی وجودیەت دەکات، کە ئەمە رۆحیەتێکی ئاینیە زەمی بەرامبەرەکەت نەکەیت لە دوورەوە، بەڵکو بیناسیت و خاڵە ئیجابیەکانی وەربگریت، بۆیە (کاك ئەحمەد) هاتووە خاڵە ئیجابیەکانی (وجودیەت)ی کردۆتە دەستکەلای خۆی یاخود خاڵە ئۆنتۆلۆژی و گرنگەکانی (مارکسیەت)ی کردۆتە دەستکەلای خۆی، تەنانەت خاڵە گرنگ و بەهێزەکانی فەلسەفەی یۆنانی کۆنی لەلای (سوکرات وئەفلاتون) و.. هتد، بە هەمان شێوە کردۆتە دەستکەلای خۆی. بە داخەوە کە (کاك ئەحمەد) لە ساڵەکانی کۆتایی تەمەنیدا- یادی بەخێر و گۆڕەکەی پڕ لە نوور بێت - زۆرترینی لە زینداندا بووە بۆیە زۆر ئاگاداری ئەو تەوژمە فیکری و وەرگەڕانە رۆشنبیریە فراوانەی ئێران نەبووە

کە لە دوای ئینقیلابەوە روویدا، بۆیە نەیتوانیوە لەنزیکەوە راستەوخۆ خوێندنەوەی بۆ مەکتەبە فەلسەفیە نوێکان هەبێت بە زمانی خۆیان، بەلام لەگەڵ ئەوەشدا دەتوانم بلێم (کاک ئەحمەد) هێندەی بواری هەبووە زۆرباش ئەو مەکتەبە فەلسەفیانەی ناسیووە کە لەو کاتانەدا بوونیان هەبووە و هەروەها زۆرباش دراسەی فەلسەفەی کۆنی ئیسلامی کردووە، ئیتر چ فەلسەفەی فیرقەکان بێت کە دوایی دەرکەوتوون یاخود ئەو فەلسەفەیە بێت کە فەیلەسوفەکانی وەکو (ئیبن روشد) و(فارابی)..تەبەنییان کردووە، هەموو ئەمانە لای (موفتیزادە) بە ئەندازەی ئەوە دەبێت کە بشێت ناوی بنێین دوایین فەیلەسوفی شارستانیەتی ئیسلامی، هەرچەندە وتراوە لای ئەهلی تەشەیوع کە (طباطبائی) دوایین فەیلەسوفە لە مێژووی ئیسلامیدا بەلام بە بۆچوونی من (کاک ئەحمەد) کەوتۆتە دوای ئەوەوە، تەنانەت زۆر شت هەیە کە بەسەر فەلسەفەی (طباطبائی)دا تێپەڕ بووە دواتر لای (کاک ئەحمەد) وردتر و قوولتر پیشاندراون، بۆ نموونە لە بەرامبەر فەلسەفەی ریالیزمەوە لای (طباطبائی) — کە دیارە ریالیزم بەو مانایە نا کە لای مارکسیەت هەیە— (کاک ئەحمەد) دێت فەلسەفەیەکی گەردوونی و گەورەتر لەوە پێشنیار دەکات، کە ئەوەندە قووڵ (مارکس و هیگڵ)ی خوێندۆتەوە هەست دەکەیت قوولتر باسەکانی (تضاد دیالکتیکی) و ئەو بابەتانەی تێپەڕاندووە کە لە کتێبە نوسراوە باوەکانی ئەم بوارەدا هاتوون، تەنانەت ئەوەندە قووڵ (هیگڵ)ی ناسیوە توانیوێتی ئەو نەقسانە پیشان بدات کە (هیگڵ) بەسەر مەعریفەدا هێناونی{٦}، بە تایبەتی لەو بابەتەیدا کە دەربارەی (دیالەکتێکی ئیسلامی)یە و لە ژمارەی (٦)ی (هەژان)یشدا بلاوکراوەتەوە، زۆر بە قوولی رەخنەی (هیگڵ)ی کردووە کە بە بۆچوونی من دەکرێت بلێین یەکێکە لەو رەخنە زۆر وردانەیە لە فەلسەفەی تازە و لە رۆشنگەری نوێ کراوە، کە هەر بە خوێندنەوەی خۆیشی ئەمەی کردووە، بۆ نموونە هەر بەو دوو زاراوەیەی کە لای مەنتقیەکان و زانایانی کەلام و فەیلەسوفەکان و زانایانی (أصول) لە شارستانیەتی ئیسلامیدا بەکار براوە کە بریتین لە هەردوو زاراوەی (کلی فی الجملة) و (کلی بالجملة){٧}، دێت رەخنەی (هیگڵ) دەکات، ئەو (هیگل)ەی کە دەبێتە دەستکەلای (مارکس) کە دوایی بە تیۆریای گۆرانی کۆمەلایەتی و بە خوداکردنی مێژوو دەست پێدەکات، هەر لێرەدا ئەو هەڵەیە پیشان دەدات کە ئەوان ئیقتیباسێکیان لە شارستانیەتی ئیسلامیەوە کردووە، بەلام بە هەڵە ئەو

وەرگرتنەیان ئەنجامداوە، بەبێ ئەوەی بتوانن بە تەواوەتی وەکو خۆی وەربیگرن، لە کتێبە عەقایدیە تەقلیدیەکاندا و لای مەزهەبی (ئەشعەری)ش بەم جۆردیە، لێرەدا (کاک ئەحمەد) دەڵێت: (هیگڵ) هاتووە ئەم قسەیەی هەر بە رووکەشی وەرگرتووە بەو مانایەی هەموو شتێك دەگۆڕێت! لە کاتێکدا فەلسەفەی ئیسلامی دەڵێت (بوون لە گۆڕاندایە) کە ریشەی لە فەلسەفەی یۆنانیشدا هەیە کە یەکێك لە فەیلەسوفە یۆنانیەکان وتوویەتی دووجار پێیەکانت ناخەیتە ناو رووبارێکەوە، بەلام لەبەرئەوەی فەلسەفەی ئیسلامی هەمیشە توانیویەتی تەعلیقی هەبێت لەسەر فەلسەفەی یۆنانی، بۆیە (کاک ئەحمەد) دەڵێت (هیگڵ) ئەم تەعلیقانەی نەبینیوە، لێرەوە راستە وەکو رێسایەك لە فەلسەفەی ئیسلامیدا هەیە کە (بوون لە گۆڕاندایە – العالم یتغیر–) بەلام ئەم گۆڕانە گۆڕانێکی (فی الجملة)یە نەك (بالجملة)، (فی الجملة)یە بەو مانایەی کە (زۆرینەی بە شێوەیەکی گشتی لە گۆڕاندایە) نەك بەو مانایەی کە یەکەیەکەی شتەکان دەگۆڕێن، بۆیە گۆڕانێك نیە (بالجملة) وەکو ئەوەی (مارکس) و (هیگڵ) وتوویانە بەو مانایەی هیچ شتێکی جێگیر بوونی نەبێت! کە ئەمە ئەگەر هەستێکی فەلسەفی قووڵ نەبێت لای (موفتیزادە) نەیدەتوانی ئەوە کەشف بکات{٨}.یەکێك لە هاورێکانی بۆی گێرامەوە وتی: لە شەهید (فاروقی فرصاد)م بیستووە کە باسیکردووە جارێك هەندێك لە مامۆستاکانی زانکۆی تاران هاتوون گفتوگۆیەکی فەلسەفی قووڵیان لەگەڵ (کاک ئەحمەد)دا کردووە، دواتر (مامۆستا فاروق) هیچ تێنەگەیشتووە و لە (کاک ئەحمەد)ی پرسیووە ئەوە چۆن وا دەڵێیت؟ (موفتیزادە)ش وەك شێوازی باوی خۆی لەگەڵ هاورێکانی و قوتابیەکانیدا بە تەعبیرێکی کوردی شیرینی جوان – کە بیکەیتەوە بە عەرەبی رەنگە بەلای سەلەفیەکانەوە زۆر ئایینی نەبێت، وەك هەندێکجار فەرموویەتی (وەگیانی ئێوە) لەو جۆرە تەعبیرانە – پێی وتووە ئاخر گێلە گیان بە دەست خۆم نیە بۆم دێت، دەی ئەو هەستە فەلسەفیە بە ئاسان دروست نابێت، بۆیە بە بۆچوونی من (کاک ئەحمەد) زۆرباش سوودی لەو قۆناغەی ژیانی بینیوە کە مامۆستا بووە لە زانکۆ و باش رۆشنبیری نوێی خوێندۆتەوە، ئەمەش پێچەوانە نایەتەوە لەگەڵ ئەوەدا کە پێشتر وتوومانە قەریحەی هەر یەکێك لە کەسایەتیەکانی ( سەعید نوورسی) و (ناصری سوبحانی) و (کاک ئەحمەد) قەریحەیەکی پێش مۆدێرنیزمە و قەریحەیەکی نەریتیانەیە، رەخنەگری مۆدێرنیزمن بە فیکری پێش مۆدێرنەوە، بەڵکو دواپین

(عارف) و (فەیقە) و (فەیلەسوف)ی سەردەمی پێشوون کە لە سەردەمی نوێدا ژیاون، چونکە ئێمە وتمان یەکێك لە خاڵە هاوبەشەکانی نێوان ئەو سێ کەسایەتیە بریتیە لە قۆناغەکانی پێگەیشتنی رۆشنبیری هەریەکێکیان، کە سێ قۆناغە: قۆناغێکیان بریتیە لە ژیانیان لەناو حوجرەدا و خوێندنێکی نەریتی ئەو سەردەمە و وەرگرتنی تینوانەی مەعریفەی حوجرە تا ئەوکاتەی بوونەتە مەلا، بێگومان (کاك ئەحمەد) یەکێکە لەو کەسانەی کە باش توانیویێتی بەسەر مەزهەبگەراییدا زاڵ بێت بە بۆچوونی من، تەنانەت لە یەکێك لە ئامۆژگاریەکانیدا بۆ (موحەمەد ژیان)ی کوڕی دەڵێت: ئەگەر ئەوانەی پێشتر لە زینداندا لەگەڵماندا بوون خەڵکی عارەق خۆر و بێ دین بوون ئەوا ئێستا موسڵمانن، دەی من ئێستا بیردەکەمەوە زۆرێك لەو کەسانەی لەگەڵ (موحەمەد ژیان)دابوون لە زینداندا شیعەبوون، کەم مەلای دیکە هەیە بتوانێت بەو ئاسانیە ئەو زاراوەیە بلێت، کە ئەو فەرموویەتی برای ئاییینی تۆن، زۆر دوور نەکەومەوە وەك وتم قۆناغی یەکەمی خوێندنی (کاك ئەحمەد)یش بریتی بووە لە تەواوکردنی حوجرە و بوونی بە فەقێ و وەکو کوڕە مەلایەك کە باوکی موفتی بووە لە شاری سنە و ژیانێکی زۆر باشیان هەبووە بەڵام ماڵەباوانی بەجێهێشتووە لەبەر ئەوەی کە نەیویستووە ژیانێکی موترەفانە بژی{٩}؛ کاتێك لە دەعوەتێکدا بینویەتی کە باوکی دەعوەتی سەرۆکی پۆلیسەکانی شاری سنەی کردووە، هەستی کردووە کە ئێستا هەژارەکانی شاری سنە ئەمەیان نیە، ئیدی نەیتوانیوە لەو جۆرە ژیانەدا بژی، بۆیە سەری خۆی هەڵگرتووە و هاتووە بۆ کوردستانی عێراق، کە دوای ئەوەی خوێندنی فەقێیەتی تەواوکردووە و خەڵکی ئێرە دەگێڕنەوە کە چەند فەقێیەکی سەرکەوتوو بووە و پاشان گەڕاوەتەوە بۆ ئێران و باوکی تاقیکردۆتەوە تا بزانێت چەند زانستی پێیە، کە نارەحەترین کتێب کە کتێبی (جمع الجوامع)ە لای مامۆستایانی کوردستان و ناچاری دەکات کە وانەیەکی لێ بلێتەوە بە فەقێکانی باوکی، پاش گوێ لێبوون، باوکی زۆر سەری سوڕماوە لەوەی ئەو هەموو عیلمەی چۆن کۆکردۆتەوە{١٠}، بۆیە مەلایەکی زۆرباش و سەرکەوتوو بووە، کە لە یەکێك لە گفتوگۆکانیدا هاوڕێیەکی پێیدەڵێت: مەلا فلان کەس وادەڵێت ئەویش دەڵێت: دەی منیش (مەلام)، (مەبەستی لە مەلا بوونی خۆیەتی (کاك ئەحمەد)ە کە لە باشترین مەلاکان بووە).

قۆناغی دووەم: قۆناغێکی دیکەی ژیانی بریتی بووە لە ژیانی سیاسی ئەو و بوونی لەناو حیزبی دیموکرات و بابەتی نەتەوایەتی و کۆکردنەوەی (دین) و (نەتەوە) پێکەوە، کە کەم لە نەتەوەییەکان بەو جۆرە بوون، پاشان لە دوای ساڵی چل و سێی هەتاوی بە دواوە قۆناغی سێیەم لە ژیانی دەست پێ دەکات ئەو دەمەی کە یەکلایی دەبێتەوە بۆ گەیاندنی ئایینی خودا و زیندووکردنەوەی فیکری ئایینی و بوژاندنەوەی بابەتە ئایینیەکان لە کوردستانی ئێران – کە دەکرێت دواتر زۆرتر لەسەر ئەمە قسە بکەین– جا هەر وەك وتم ئەمە پێچەوانە نایەتەوە لەگەڵ ئەوەدا کە بڵێین زۆر شارەزابووە لە فیکر و مەعریفەی سەردەمی خۆی، کە بە بۆچوونی من هەریەك لە (کاك ئەحمەد) و (مامۆستا ناصر)یش زۆر سوودیان لە بیریارانی شیعە بینیوە لەوانەش وەکو (عەلی شەریعەتی) و (مطهری) و (تاڵەقانی) و (طباطبائی) و.. بەتایبەتی (کاك ئەحمەد) کە زۆر سوودی لە (عەلی شەریعەتی) بینیوە، زۆرجار خۆی شتێکی هەبووە بەڵام چۆن تەعبیری لێبکات (شەریعەتی) هاوکاری بووە لەو بابەتەدا{١٣}، لەگەڵ ئەوەشدا هیچی لە ئەوان کەمتر نەبووە، بەڵکو زۆر لەوان پێشتر بووە، هەروەك باسمانکرد (کاك ئەحمەد) زۆر سوودی لە ژیانی زانکۆیی خۆی بینیوە بە تایبەتی لە وتنەوەی وانەی (فیقه)، کە هەندێك بۆچوونی فیقهی هەبووە بە هەناسەیەکی فەلسەفیانەوە، ئاخر (فیقه) بە درێژیدا کەوتووە، واتە رێسا ئوسولیەکان دەهێنێت و دواتر بە مامەڵەکردن لەگەڵ رێسا ئوسولیەکاندا فیقه لەدایك دەبێت، بەتەنها مامەڵەکردنی (کاك ئەحمەد) لەگەڵ فیقهدا لەبواری پانیدا بووە، کە بە فیکر و هەستێکی فەلسەفیەوە مامەڵەی لەگەڵدا کردووە، لە پێشدا بنەما فیکری و فەلسەفیەکەی لارۆشن بۆتەوە ئینجا دەرەنجامە فیقهیەکەی گرتووە، بۆ نموونە من لەبیرم دێت لە یەکێك لە نووسینەکانی (کاك ئەحمەد)دا خوێندمەوە کە باسی نایەکسانی نێوان ژن و پیاو دەکات، کە بە بۆچوونی من ئەمە یەکێکە لە بونیەی فیکری فیقهی کۆن کە ئەمڕۆ لە هەندێك شوێندا تەئویلی بۆ دەهێنینەوە بەڵام تەماشا دەکەیت لە شوێنێکی دیکە رێگەت پێ دەگرێتەوە و ناتوانیت چارەیەکی ریشەیی بکەیت، بۆ نموونە لە بابەتی جیاوازی خوێنی ژن و پیاو یان لە باسی میرات و نەفەقەدا و..هتد، بێگومان مەبەستم ئەوە نیە کە لە شارستانیەتی ئیسلامیدا کەسێك نەبووە چارەی ئەم گرفتەی لابووبێت، بەڵام هەستدەکەم (کاك ئەحمەد) زۆر قووڵ چارەسەری ئەم بابەتانەی کردووە و بە هەناسەیەکی فەلسەفیەوە تێی

روانیون، بۆ نموونە ژن لە ماڵەوەیە و پیاو کاسپی دەکات، دەی خۆ ئەم ژنە لە ماڵەوە ماندوو دەبێت، جل شۆرینە، خواردن ئامادەکردنە، بەخێوکردنی منداڵە و...هتد، کە زیاتر مەبەستم کۆمەڵگەی نەریتی خۆمانە هەتا ئێستاش، بەڵام ئافرەتەکە تەڵاق دراوە وەکو ئەوە وایە یەک ڕۆژ ئیشی نەکردبێت لەو ماڵەدا! لێرەدا (کاک ئەحمەد) دێت مامەڵەی شەریکایەتی جەستەیی (شراكة الابدان) کە یەکێکە لە بابەکانی فیقە دەیکاتە دەستکەلای خۆی و دەفەرمووێت ژن هەر کە چوویە ماڵی مێردی بڵێت: مێردەکەم من و تۆ شەریکین ئیدی لەهەموو شتێکدا دەبنە شەریك و پێش میرات دابەشکردن نیوەی خۆی دەبات، جا هەر بەم قەریحە فەلسەفیەوە مامەڵەی لەگەڵ زۆربەی شتەکاندا کردووە لە دەرەنجامدا واکەوتۆتەوە کە زۆرتر وتەکانی وتەی میتۆدین، هەر ئەوەی کە ئاماژەم پێکرد، ئەو هاتووە (شرکة الأبدان) کە بابەتێکە لەبابەتەکانی فیقە کردویەتیە دەستکەلای خۆی چارەی گرفتی ئافرەتی پێدەکات، (شرکة الأبدان)یش بریتیە لەوەی کە چەند کەسێك بە یەکەوە لە شوێنێکدا ئیش دەکەن، بۆ نموونە کاتی نان خواردن یەکێکیان دەڕواتەوە ماڵەوە خواردن ئامادە دەکات، لەوکاتەدا ئەوانی دیکە هەر پارەیەکیان دەستکەوت ئەویش شەریکە لەگەڵیاندا، لێرەدا سەیرکە چ یەکسانیەکی قووڵ لەنێوان ژن و پیاودا دروست دەکات، واتە ئەو ڕۆحە فەلسەفیە قووڵە چیە کەوا دەکات لەم پیاوە تەنانەت بتوانێت فیقهیش بەو قووڵیە بخوێنێتەوە!

بە ڕای من جگە لە جیاوازبوون لە شێوازی مامەڵەکردنی (موفتیزادە) و قەریحەی فەلسەفیانەی خاڵێکی دیکەی جیاکەرەوەی ئەو لەگەڵ هەردوو کەسایەتی (نوورسی) و (سوبحانی) بریتیە لە – ڕێسایی بوونی بابەتەکانی– واتە لەگەڵ ئەوەدا قسەکانی (کاک ئەحمەد) زۆربەیان ڕێسا و میتۆدن، هەروەکو باسمان کرد (مامۆستا ناصر) زۆرێك لە بۆچوونەکانی کاك ئەحمەدی هێناوە کردوونی بە سیستەمێکی گەورە، جا ئەم قەریحە فەلسەفیەی (موفتی زادە) وایکردووە کە شتەکانی ئەو میتۆدی بن(المواضیع المنهجیة والقواعدیة) دواتر (مامۆستا ناصر) سوودی لێبینیوون و لە قورئاندا بۆیان گەڕاوە، هەروەك لە باسی (سوبحانی)دا باسمان کرد، هەروەها سەرەڕای میتۆدی بوونی بۆچوونەکانی یەکێکی دیکە لە تایبەتمەندی فیکری (کاك ئەحمەد) بریتیە لە ڕۆشن بوون (الوضوح)، واتە کە سەیری (مامۆستا ناصر) دەکەیت هەست دەکەیت بابەتی جیاجیای هەیە و لەهەر بابەتێکیشدا سیستەمی

خۆی دیاریکردووە و روونە، بەڵام ئەوەی هەموو سیستەمەکانی کۆبکەیتەوە لە شتێکدا ناتوانیت ئەوە بکەیت، کە من زیاد لە پێنج ساڵ لەگەڵ بۆچوونەکانی (سوبحانی)دا ژیام، هەستمکرد ئەو رۆشنیەی کە کۆی سیستەمی فیکری (کاك ئەحمەد) پیشانی دەدات لای (مامۆستا ناصر) بەو جۆرە نیە، بابەتەکانی (سوبحانی) کۆمەڵێك سیستەم و دوورگەی جیاجیان لەیەکتری، بەڵام دەکرێت بڵێین (کاك ئەحمەد) کۆی شتەکانیشی بۆ خۆی سیستەمێکە کە لە زۆرێك لە نووسینەکانیدا دەگەڕێتەوە سەر ئەو خشتانەی (جدول)انەی کە دایناون، واتە فیکری زۆر روونە، بە تایبەتی لە کتێبی (لە بارەی کوردستانەوە)دا{١٥} زۆر هەست بە روونی فیکری ئەو دەکەیت کە لەم رووەوە زۆر لە عەقڵیەتە تەجزیئیەکەی مۆدێرن دەکات کە لە جەدوەلەکانیدا پەیوەندی نێوان شتەکان لەگەڵ یەکتردا پیشان دەدات، ئەم رۆشنیەش یەکێك لە تایبەتمەندیەکانی فیکری (کاك ئەحمەد)ە، ئەگەر چی (کاك ئەحمەد) گەڕیدەیەك بووە لە نێوان (زەین) و (قەلب)دا، لەو نێوانەدا بەردەوام لە هاتووچۆدا بووە، جارجار لایداوەتە لای (قەلب) و جارجاریش بەودیودا رۆیشتووە بۆ لای مەملەکەتی (زەین){١٦}، کە بە بۆچوونی من هەتا کۆتایی ژیانی و تەنانەت لە شیعرەکانیشیدا لەم رێبواریە دەربازی نەبووە، بۆ نموونە (مەولانا) چۆتە مەملەکەتی عیشق و ئیدی تا کۆتایی نەهاتە دەرەوە، یان کاك ناصر ئەو دەمەی چووە ژێر سێبەری قورئانەوە، — فی ظلال القران— بەدیدێك و تەفسیرێکی فیقهیانەوە ئیدی تا ئەوکاتەی گرتیان و شەهیدیان کرد نەگەڕایەوە لەو میتۆدەی گرتبوویەبەر.

یەکێك لەو شتانەی کە ئێستا گرفتی بۆ قوتابیەکانی کاك ئەحمەدیش دروست کردووە ئەم رێبوار بوونەیەتی (دواتر لە دیووە فەلسەفیەکەیەوە زۆرتر قسەی لەسەر دەکەم) ئایا بەلای (قەلب)ەکەی کاك ئەحمەددا بڕۆن یان بەلای زەینەکەی لەوەو پێشیدا و ئەو کارە سیاسیانەی کە کردوویەتی بە بۆچوونی من (موفتیزادە) تا ئەو رۆژەش سەرینایەوە — بەرەحمەت بێت— خۆی یەکلایی نەکردەوە بەلای هیچکامێکیاندا تەنانەت لەو شوێنەدا کە باسی ژیانی شیعری خۆی دەکات، پۆلبەندی دەکات بەسەر سێ جۆر دا: شیعرێك کە دڵ زۆری بۆ هێناوە و وتوویەتی، شیعرێکیش کە دەیەوێت ئامۆژگاری بکات (ئەمە زەینە) شیعرێکی دیکەش لە کاتێکدا کە رۆژنامەیەکی خوێندۆتەوەو یان شیعری شاعیرێکی بینیوە و هەستی

کردووە لاوازە، کە کاک ئەحمەد بە حوکمی زیرەکی و بلیمەتی خۆی ئەو هەستە وردەی هەبووە، بۆ نموونە کاتێك کتێبێکی خوێندۆتەوە، چونکە مەنهەجیەت و میتۆدی فیکری خۆی لا روون بووە توانیوێتی بە ئاسانی رەخنە بگرێت، یەکێك لەو رەخنانەشی بریتیە لەو رەخنەی کە لە (د. یوسف القرضاوی) گرتووە لە ئەولەویاتی بزوتنەوە ئیسلامیەکەیدا (اولویات الحرکة الاسلامیة) بەلامەوە رەخنەیەکی زۆر سەیرو عەنتیکەیە، بۆیە کاتێك مەنهەجیەت رۆشن بوو دەتوانرێت بکرێتە پێوەر، شتەکانی دیکەی پێ بپێورێت، لەبەر ئەوە کاتێك شیعرێکی لە رۆژنامەیەك یان لە کتێبێکدا لە زیندانا بینیوە توانیویەتی بلێت باشە یان لاوازە و من دەتوانم باشتر لەوە بلێم، لێرەوە هەست دەکەیت یەك جۆری شیعری نیە، شیعرەکانی شیعرێکی عیرفانی رووت نین، تەنانەت تا ئێستا کەسێکم نەدیوە بە قووڵی لەسەر شیعرەکانی (موفتیزادە)ی نوسیبێت، لەم دوایانەدا برایەك کە زۆر نەقدی ئەدەبی جوانی هەیە لەسەر زۆرێك لە شاعیرە مردوەکان (لە سەر-حافیز-یش) پێی وتم: شیعرەکانی (کاك ئەحمەد)م گرت بە دەستمەوە هیچم پێنەکرا، ئەوە لەبەر ئەوەیە کاك ئەحمەد سێ جۆر شیعری هەیە ، ئاخر قەریحەی کوردستانی عێراق جیاوازە لە کوردستانی ئێران، بۆیە من قەناعەتم وایە ئەگەر لە پاشخانێکی عیرفانی و لە (مەولانا) و (حافیز)ەوە نەیەیتەوە ناتوانیت قسە لەسەر کاك ئەحمەد بکەیت، هەروەها ئەگەر لە کلاسیکی ئیسلامیش شارەزا نەبیت ناتوانیت ئەوە بکەیت، بەلام بە بۆچوونی من ئەوە یەکێك لە هۆکارەکان بووە.

## خاڵۆی رێبوار(رێبواری هزری ئەحمەدی موفتی زادە):

هۆکارێکی دیکە بریتیە لەو رێبواریەی کاك ئەحمەد، کەئەو خاڵە رێبوارە (بەبێ تەشبیە) لەگەڵ ئەو تەعبیرەی کە عاریفەکان و سۆفیەکان بۆ پێغەمبەری خودای بەکاردەهێنن، بەراستی خاڵە رێبوارێك بووە هەمیشە لە نێوان زەین و قەلبدا سەفەری کردوە، لە دەمێکدا لە جیهانی زەین و فەلسەفە و فیکردا بووە لەهەمان کاتدا گەڕاوەتەوە بۆدڵ: وەکو خۆی دەڵێت (هاو ..هاو دڵی) زۆری بۆ دەهێنێت و دەگەڕێتەوە بۆ دونیای عیرفان و قەلب{١٧}، ئەمەش زۆرجار رێگر بووە لەوەی بتوانرێت مامەڵەیەکی مەنهەجیانە لەگەڵ (کاك ئەحمەد)دا بکرێت، با فراوانتر بچینە ناو فیکر و بابەتەکانی کاك ئەحمەدەوە کە یەکێك لە خۆشەویستەکانمە وەکو

(مامۆستا نوورسی) و (مامۆستا ناصر)یش کە ئەگەر ئەوان نەبوونایە رەنگە من کەسێکی دیندار نەمبوومایە و نەمتوانیایە دینداری بکەم، چونکە ئەو دیندارە باوەی پێش ئاشنا بوونم بەم کەسایەتیە مەزنانە ناسیبووم هەستم دەکرد پێویستی من دابین ناکات، بەڵکو رووکەشترە لەوەی بتوانرێت جێی ئومێدێکی قووڵ بێت، بۆیە فیکری کاک ئەحمەد یەکێك بوو لەوانەی باش هاوکاریکردم لەم بابەتەدا، لەبیرم دێت کاتێك بابەتی (فەلسەفەی حیجاب){١٨}م لە ساڵی (١٩٨٨)دا خوێندەوە، وایلێکردم کە جارێکی دیکە بچمەوە بە فیکری ئاینی خۆمدا، ئەگەر چی زۆر لە فیکری ئاینی لەلای بیریارانی دیکەی جیهانی ئیسلامیم خوێندبۆوە، بەڵام هیچکامیان بە ئەندازەی بۆچوونەکانی ئەو تێری نەکردم، بۆ نموونە بابەتەکانی (شوری) و (ئیسراو میعراج) و (ئایین و ئینسان) و..هتد کە هەستم دەکرد زۆر نزیکی لە نێوان من و ئەودا هەیە لە رووی رۆحیەوە، ئەو ئاشنا بوونەی ئەو بە عیرفانی کوردی و بەشێوە زاری هەورامی، کە بۆ من یەکێکە لەو شێوە زارانەی زۆر سوودم لێ بینووە لە رووی عیرفانەوە، تەنانەت ئاشنا بوونی ئەو بە (مەلەوی) و (وەلی دێوانە){١٩} ، کە بۆ من ئەوە شتێکی نوێ بوو بە تایبەتی بۆ ئەوکاتە، کۆکردنەوەی فیکری نەتەوەیی لەگەڵ بابەتی ئایینیدا کە وەك ئێستا نەبوو( کە نەك یەکێك لە مومکیناتە) بەڵکو یەکێك لە پێویستیەکانی ئەمرۆیە.

## رێبواری فیکری و فەلسەفیش:

لە راستیدا ئەو رێبواریەی کە کاك ئەحمەد بوویەتی لە عیرفان و لە فیکری ئایینیدا لە فیکری فەلسەفی ئەویشدا بوونی هەیە، فیکرێکە بۆ سەردەمی ئیستقراری کۆمەڵگە ناشێت، بۆ سەردەمێکە کە لە حاڵەتی گوزەردا بێت، کە لە هەندێك برگەدا بۆچوونەکانی نزیکن لە (عەبدولکەریم سروش)ەوە، بەڵام بە گشتی زۆر نزیکترن لە بۆچوونەکانی (عەلی شەریعەتی)ەوە{٢٠} ، لەو خاڵەدا کە بە بۆچوونی من فیکری (عەلی شەریعەتی)ش فیکرێکی ئینقیلابیە، ئینقیلابیش بە زاراوەی کاك ئەحمەد واتە (مەکتەبی) بوون، کە لە ئایینیدا فیکرێکی ئاراوتەیە، فیکرێکە بۆ سەردەمی جێگیری کۆمەڵگە ناشێت، شەریعەتی و موفتیزادەلە هزری ئینقیلابیدا لە یەکدی نزیك دەبنەوە.

بوونی جیاوازیەکان یەکێکە لە تایبەتمەندیەکانی سەردەمی ئیستیقرار، واتە جیاوازی نەتەوەیی و مەزهەبی و..هتد، لە کۆمەڵگەی مرۆڤایەتیدا لە سەردەمی جێگیری کۆمەڵگەدا بەدڵنیاییەوە هەر بوونی دەبێت، بێگومان هەرچی هەوڵدان بۆ کەمکردنەوەی ئەو جیاوازیانە کاری عاریفەکان و رۆشنبیرەکان و سیاسیەکانە، هەوڵ بدرێت هەرچی زیاترە جیاوازی چینایەتی و نەتەوایەتی و مەزهەبی نەمێنێت، بەڵام ئەوەی کە بە تەواوی جیاوازیەکان نەمێنێت ئەوا ئیدی کۆمەڵگەش نامێنێت، هەروەکو ئەوەی لە زماندا وتمان ئەگەر مەجاز لە زماندا نەمێنێت ئیدی خۆی بۆ خۆی زمانیش نامێنێت، چونکە زمان بە مەجازەوە زمانە، کۆمەڵگەش بە بوونی جیاوازیەوە کۆمەڵگەیە، واتە سەردەمی جێگیری کۆمەڵگە بەندە بە بوونی جیاوازیەکانەوە، لێرەوە ئەو فیکرە فەلسەفیەی دەیەوێت ئەم جیاوازیانە هەڵبگرێت، یەکەم: دەبێتە ئایدۆلۆجیا، دووەم: بۆ سەردەمی جێگیری کۆمەڵگە ناشێت، کاک ئەحمەد بە حوکمی رێبوار بوونی خۆی لەنێوان (زەین و قەلب)دا کە بە بۆچوونی من باش لەو رێبواریەی خۆیشی تێگەیشتووە لە جوڵانی بەرەو قیامەت، بۆیە فیکری فەلسەفی ئەویش بۆ سەردەمی پاڵدانەوە و نا رێبواری و جێگیربوون نیە، بەڵکو فیکرێکە بۆ سەردەمی گوزەرە، دەشێت بڵێم ئەگەر فیکری کاک ئەحمەد فەلسەفی بێت ئەوا فیکرە فەلسەفییەکەشی فیکرێکی فەلسەفی کرداریە، پێچەوانەی ئەو بۆچوونەی کە دەڵێت: دیوی کرداری فەلسەفەی میتافیزیکی یۆنانی کۆن نەهاتە ناو شارستانیەتی ئیسلامیەوە، ئەو رەخنەیەی کە (محمد عابد الجابری)ش لە شارستانیەتی ئیسلامی گرتووە، کە دەووترێت ئەگەر بەشە سیاسەکەش لەگەڵ ئیلاهیاتی یۆناندا بهاتایەتە ناوەوە، ئەوا شارستانیەتی ئیسلامی بەو دەردەی ئێستا نەدەچوو، من لە چاوپێکەوتنێکی دیکەشدا کە لە گۆڤاری (هێشتا)دا بڵاوبۆتەوە وەڵامی ئەوەم داوەتەوە کە ئەگەر فیکری سیاسی یۆنانی کۆن نەهاتۆتە ناو شارستانیەتی ئیسلامیەوە ئەوا یەکەم: ئەوە پیلانێك نەبووە، بەڵکو هەر خۆی واکەوتۆتەوە، کە نەهاتووە لەبەر ئەوەی کە نەشیاوە بێت نەوەك نەویسترا بێت. دووەم: خۆ هاتنی فەلسەفەی ئیلاهیاتی یۆنانیش مەترسی بۆ دەسەڵات هیچی کەمتر نەبووە لە فەلسەفە سیاسیەکە، چونکە هەر دەستکاریکردنێکی سیۆلۆژیا بە تایبەتی لە کۆمەڵگەیەکی ئایینیدا، دەستکاریکردنێکی دەسەڵاتیشە{٢١}، بۆیە دەتوانین بڵێین کاك ئەحمەد ئەو فەلسەفە سیاسیەی هێناوە کە دەووترێت لە شارستانیەتی

ئیسلامیدا بوونی نیە، یان ئەوەی ناومان برد بە فەلسەفەی کرداری، واتە بێجگە لەوەی وەکو قەریحە میتافیزیك لای (موفتیزادە) بوونی هەیە، ئەوا فەلسەفەی ئەو فەلسەفەیەکی کردارییە، کە ئەمەشە کاتی خۆی ناویان ناوە فەلسەفەی سیاسی، یاخود دوای هاتنی حیکمەت لە فەلسەفەی ئیسلامیدا ناونراوە حیکمەتی کرداری.

## فەلسەفەی موفتیزادە
## و (چەوساندنەوەی چینایەتی،نەتەوەیی، مەزهەبی)

لێرەوە فەلسەفەی کاك ئەحمەد فەلسەفەیەکی کرداریە، کە لەسەر سێکوچکەیەك بینا بووە: نەهێشتنی چەوساندنەوەی (چینایەتی و نەتەوەیی مەزهەبی){٢٢}، هەموو بۆچوونەکانی کاك ئەحمەد تەنانەت دیدی ئەو بۆ ئایین، بۆ کۆمەڵگە، بۆ سیاسەت و بۆ دەستوری ئێرانیش کە ئەو هەموو رەخنە گەورانەی لە دەستوری ئێرانی گرتووە و بە بۆچوونی من (موفتیزادە) یەکێك لە رەخنەگرە زۆرباشەکانی دەستورە لە دونیادا، هەر لەم سێ بنەمایەوە باسی لە چاکسازی کشتوکاڵی تا برایەتی نێوان شیعە و سوننەشی کردووە، کە دوای ئەوەی لە مادەی دوانزەی دەستوری ئێرانیدا چەسپێنرا کە مەزهەبی سەرەکی ئێران بریتیە لە مەزهەبی جەعفەری، کاك ئەحمەد هاتووە بەو فیکرەوە کە نەهێشتنی جیاوازی مەزهەبییە هەوڵی چارەسەرکردنی ئەم گرفتە دەدات، کە بە بۆچوونی من ئەمە پانتاییەکی زۆری لە فیکری کاك ئەحمەددا داگیرکردووە، هەروەها هەوڵی داوە بۆ نەهێشتنی جیاوازی نەتەوەیش کە ئەو هەموو گفتوگۆیانەی کاك ئەحمەد لەگەڵ دەسەڵاتی ئێرانیدا کردویەتی و پێشنیار کردنی خود موختاری بۆ کوردستان{٢٣} و.. هەمووی لەسەر ئەو بنەمایە بووە، وەك لە نووسینێکیدا بەناوی (وەحدەتی ئیسلامی)یەوە بۆچوونی خۆی بەرامبەر بە فیدراڵیەت باس کردووە کە دەبێت لە پێشدا دەوڵەتی فیدراڵی بوونی ببێت ئینجا هەرێمە سەربەخۆکان جیاببنەوە، کە بە بۆچوونی من ئەمە دیدێکی زۆر قووڵە لەوێدا باسی کردووە، من یەکێك لەو ناودژێتیانەی لە فیقهی دەستوریدا دەمخوێندەوە ئەوە بوو کە دەوترێت دەوڵەتی فیدراڵ بریتیە لە یەکگرتنی کۆمەڵێك هەرێمی سەربەخۆ بە رێککەوتنێك، بەڵام ئێستا سەیری عێراق بکە دەبینیت دەوڵەتێکی مەرکەزیە و دەکرێت بە ویلایەت نەك ئەوەی کۆمەڵێك ویلایەت بن و یەکبگرن، بۆیە بۆچوونی (موفتیزادە) لەم بوارەدا بۆچوونێکی زۆر

قووڵە و باش پێکاوێتی، کە بەڕای من ئەگەر کەسێك فەیلەسوفێکی یاسا و مافناس نەبێت ناتوانێت ئەو رەخنە قووڵانە بکات{٢٤}.
لێرەوە ئەو سێ چەمکەی مامەڵەی چینایەتی و مامەڵەی مەزهەبی و مامەڵەی نەتەوەیی زۆربەی زۆری بۆچوونەکانی کاك ئەحمەدی داگیر کردووە، تەنانەت بە بۆچوونی من دیدگای ئەو بۆ قورئانیش لەو سێ چەمکەوەیە{٢٥}، بەمەشە کە فەلسەفەی کرداری کاك ئەحمەد دروست دەبێت، ئەمەش دەرگایەکی باشە بۆ ناسینی فیکری کاك ئەحمەد بەڕای من، کە زۆرێك لە نووسین و وتارەکانی لەم دیدەوەیە، بەڵام ئەمە فیکرێکە بۆ سەردەمی جێگیری کۆمەڵگە ناشێت، بۆیە دەتوانم بڵێم یەکێك لە نەپێکانەکانی کاك ئەحمەد بووە لەسەر ئەم بۆچوونە، ئەم رێبواربوونە ئەو- بەزاراوەی خۆی -(دڵی سان) شتێکی زۆر گەورەیە، لە جیهانی رۆحدا هەوڵدان بۆ ئەوەی کە جیاوازی چینایەتی نەمێنێت، ئەو هەموو هەوڵانەی کاك ئەحمەد داویەتی تا وەك هەژارەکان بژی، تەنانەت دەگێڕنەوە کاتێك کارمەند بووە رۆژی هەینی تەرخان کردووە بۆ ئەوەی ئەگەر هاورێیەکی ماڵ گواستنەوەی ببێت لەناو شاری سنەدا نەچێت ئۆتۆمبێلی دیکە بەکرێ بگرێت، بەڵکو خۆی ئۆتۆمبێلێکی کۆنی هەبووە چووە ماڵەکەی بۆ بارکردووە، جگە لەوە زۆرجار کە بە هەندێك لە گەڕەکەکانی سنەدا تێپەڕیووە و منداڵان رایانکردووە بە شوێن سەیارەکەیدا، لەوکاتەدا هاوڕێکەی یان قوتابیەکی کە لەگەڵیدا بووە ویستوویەتی لێیان تورە بێت، بەڵام کاك ئەحمەد فەرموویەتی لێیان گەڕێ، تەنانەت ئۆتۆمبێلەکەی خاوکردۆتەوە و ئازاری منداڵەکانی نەداوە و بەڵکو ئامادە نەبووە لێشیان تورەبێت{٢٦}، لێرەوە بیگرە تا دەگاتە ئەوەی کە میوەیەکی نەخواردووە ئەگەر هەژارەکان پێیان نەخورا بێت، جلوبەرگیشی وەکو خەڵکە هەژارەکەی سنە لەبەرکردووە (کە لەبەرکردنی کۆتێکی بیانی بووە لەگەڵ شەرواڵێکی کوردیدا){٢٧} کە ئەوەندەی من سەردانی ئەو ناوچە کوردنشینانەم کردبێت هەتا ئێستاش هەژارەکانیان ئەو جۆرە جلوبەرگەیان لەبەردایە، هەر لێرەوە تا دەگاتە ئەوەی ژیانی خۆشی ماڵەوەی جێهێشتووە ژیانی سوختەیی حوجرەی هەڵبژاردووە، کە گەنجی ئەمڕۆ لە سوختەیی تێناگات، سوختەیی واتە زیللەت! ژێردەستەیی موستەعیدەکان، ماڵە و ماڵ کردن بۆ نان، هەژاری و پینە بە جلەوە بوون، هەموو ئەمانەی قبووڵ کردووە لەبەر ئەوەی وەکو هەژارەکان بژی، کە یەکێك لە شانازیەکانی کاك ئەحمەد لە وەسیەتەکانیدا

بریتیه له‌وه‌ی که شانازی به ئه‌وه‌وه ده‌کات که ئه‌و فه‌قێ بچکۆله‌یه‌کی ناو کورده‌واری بووه {٢٨}، بۆیه وه‌ك باسم کرد ئه‌م رێبوار بوونه‌ی (موفتیزاده) له‌ناو جیهانی رۆحدا زۆر مه‌زن و گه‌وره‌یه، به‌ڵام ئه‌مه فیکرێکی سه‌رده‌می ئیستقرار نیه، فیکری سه‌رده‌می ئیسقراری کۆمه‌ڵگه فیکرێکه که باوه‌ڕی وایه کۆمه‌ڵگه خۆی دروست ده‌کاته‌وه، هه‌میشه به خۆیدا ده‌چێته‌وه و چینه‌کان داده‌رێژێته‌وه ناهێڵێت زۆر له یه‌کتر دووربکه‌ونه‌وه، به‌ڵام ئه‌وه‌ی جیاوازی چینایه‌تی و ململانێی نێوانیان نه‌مێنێت، ئه‌گه‌ر ئه‌م ململانێیانه نه‌مێنێن ئه‌وا کۆمه‌ڵگه‌ش ناتوانێت به‌رده‌وام بێت، به‌ڵام خودی کاك ئه‌حمه‌د به کرداری له ژیانی خۆیدا له‌گه‌ڵ ئه‌م بۆچوونه‌یدا ژیاوه، که یه‌کێك له ره‌خنه زۆر تووندەکانی له سیسته‌می ده‌سه‌ڵاتی ئێران ئه‌وه‌یه که ده‌فه‌رموێت هاتوون ئاغاواته‌کانیان چه‌کدار کردوون بۆ ئه‌وه‌ی به‌ربینه گیانی جوتیاره‌کان، ته‌نانه‌ت ده‌گری بۆ ئه‌م مه‌سه‌له‌یه، ئاخر به‌لای (کاك ئه‌حمه‌ده‌وه رۆحی ئایین بریتیه له ئه‌وه‌ی که به‌رگری له چه‌وساوه‌کان بکرێت و جیاوازی چینایه‌تی نه‌هێڵرێت) به‌ڵام له‌ولاوه ده‌بینێت سیسته‌می به‌ناو ئیسلامی ئێرانی دێت له پێناو جێگیری و مانه‌وه‌ی خۆیدا ده‌ره‌به‌گه‌کان چه‌کدار ده‌کات {٢٩}، ته‌نانه‌ت راسته‌خۆ ره‌خنه‌ی توندی ئاراسته‌ی خومه‌ینی کردووه، ئه‌و گفتوگۆیه‌ی نێوان ئه‌و و خومه‌ینی که هه‌تا ئێستاش کورده‌کان باسی ده‌که‌ن که له ته‌له‌فزیۆنه‌وه راسته‌وخۆ په‌خشکراوه، کاتێك گه‌یشتوونه‌ته سه‌ر خاڵه ناکۆکان له‌سه‌ر بابه‌تی نه‌ته‌وایه‌تی و له‌وێدا کاك ئه‌حمه‌د زۆر توڕه بووه یه‌کسه‌ر ده‌نگه‌که‌یان بڕیوه {٣٠}، لێره‌شه‌وه هه‌روه‌کو باسمان کرد ده‌کرێت (موفتیزاده) له رێی بوێریه‌وه بخوێنینه‌وه، هه‌ر لێره‌وه بیگره تا ده‌گاته به‌رگریکردنه‌کانی له‌سه‌ر خود موختاری و ئه‌و کۆنگره گه‌وره‌یه‌ی له شاری سنه گرتوویه‌تی که له هه‌ندێك ده‌نگوباسه‌کانی ئه‌وکاته‌ی رادیۆی له‌نده‌ندا هاتووه، لانیکه‌م پێنج سه‌د که‌س له رۆشنبیرانی ئێرانی به‌شداریان تێداکردووه، هه‌تا بڕیار بووه (قاسملو) له‌وێ بێت {٣١}، ئه‌مانه هه‌مووی به‌ڵگه‌ی ئه‌و راستیه‌ن که کاك ئه‌حمه‌د ته‌نها له فیکردا نه‌وه‌ستاوه‌ته‌وه به‌ڵکو له کرداریشدا سه‌لماندویه‌تی، ئه‌مه خاڵێکی زۆر گرنگه له ژیانی (موفتیزاده)دا بۆ نموونه من زۆر که‌سم له چه‌په‌کان بینیووه که بانگه‌شه‌ی چه‌پایه‌تی کردووه و که‌چی له هاوڕێکه‌ی دزی کردووه، به‌ڵام کاك ئه‌حمه‌د چیرۆکی ژیان (قصه الحیاة) نه‌بووه وه‌کو (سه‌ید قوتب) ده‌فه‌رموێت، به‌ڵکو خودی ژیان بووه، که به‌بۆچوونی من هه‌ستی سیاسی

ئەو لەوکاتەدا هێندە گەورە بووە هەتا ئێستاش سیاسیەکانی کورد نەگەیشتوونەتە ئەو هەستە سیاسیەی کە کاک ئەحمەد لەو سەردەمەدا بۆ کورد بویەتی، داواکانی زۆر لە سەرووی داوای حیزبە نەتەوەیەکانەوە بووە، بۆ ئەمەش هەوڵی داوە و شەڕی کردووە، ئەوەیە کە دەبینیت کورد پەروەرێکی رەخنەگری وەکو (هەژار) وەسفی دەکات، دیارە بە گاڵتە وەسفی نەکردووە، کاک ئەحمەد ئەگەر بۆچوونە نەتەوایەتەکانی لەوپەڕی بوێریدا بە کردەوە پیشان نەدابێت هەرگیز لەژێر تیغی رەخنەکانی (هەژار)دا دەربازی نەدەبوو{٣٢}.

هەروەها زۆر هەوڵیداوە کە جیاوازی مەزهەبایەتی نەهێڵێت، کە زۆر جەریئانە ویستوویەتی ئەو جیاوازیە مەزهەبیە بەڵکو دوو ئایینیەی نزیکەی هەزار و چوار سەد ساڵە لە نێوان شیعە و سوننەدا دروست بووە نەیهێڵێت، لانیکەم خۆی بەو جۆرە ژیاوە، هەروەکو ئامۆژگاری کوڕەکەی دەکات کە ئەوانە برای تۆن، کە لە سەردەمی دەسەڵاتی شاهدا لەگەڵ زۆرێك لە مەرجەع و کەسایەتی شیعەدا لە زینداندا بووە لەوانە وەکو (بەنی صەدر) و (باهونەر) و..کە دواتر دەبنە دەسەڵاتدار و کاربەدەستی گەورە لە کۆماری ئیسلامی ئێراندا، کە توانیویەتی ئەو هەستە برایەتیەی ئەم باوەڕی پێیەتی پیشانیان بدات، ئەمەش کارێکی ئاسان نیە کە یەکێتیەك لە نێوان زەین و مامەڵەی کرداریدا ببێت، هەر بۆیەش لە سەرەتاوە باسمان کرد فەلسەفەی (موفتیزادە) فەلسەفەیەکی کرداریە.

یەکەم سەرۆك کۆماری پاکستان کە (گاندی) دەبینێت، کەناوی (محمد علی جناح) بوو دەڵێت من دەمەوێت دەوڵەت جیابکەمەوە، واتە بەشی موسڵمانەکان جیابکاتەوە (کە دەکاتە پاکستانی ئێستا)یەکێك لە هاوڕێکانی (گاندی) دەڵێت خۆ ئێمە بە فیکری گاندی برای یەکین، (محمد علی جناح)یش لە وەڵامدا دەڵێت: بەهزری گاندی بەلێ، بەڵام لە واقیعدا نا! چونکە ئێمە لە واقیعدا دەژین و کەسمان وەك گاندی عاریف نین. ئەمە ئەو وەڵامەیە کە دەیداتەوە بە هاوڕێکەی گاندی لە راستی ئەم بۆچوونانەش لەلای کاك ئەحمەد شتێکە و لە واقیعیشدا و لە سەردەمی ئیستقراردا شتێکی دیکەیە، بەبۆچوونی من ئەمە ئەو کەلێنەیە کە لە فیکری کاك ئەحمەددا هەیە، کە دەشێت بڵێم لەم بڕگەیەشدا نزیکە لە (عەبدولکەریم سروش)ەوە دوای ئەوەی دەگەزرێت لەلایەن مەلاکانەوە، چینی ئاخوندی ئێرانی، دوای ئەوەی کە خوێندنەوەیەکی فاشیستانە بۆ (ئایین) دەکەن، ئەوەی لەگەڵ ئەواندا بێت

دینداره و لەسەر حەقە و ئەوەش لەگەڵیاندا نەبێت بێدینە و هیچ حەقێکی لانیە، کە سێیەمێك نیە یان ئەوەتا لەگەڵ منی یاخود دژی منی، ئەو لۆجیکەی کە فیکری فاشیستی لەسەری دەژی، کاتێك (سروش) بەمە دەگەزرێت ئیدی دەست دەکات بە نووسینە توندەکانی لەسەر مەلاکان، کە دەڵێت ئایینی ئیسلام سیکۆلارە و پێویستی بە چینی ئاخوندەکان نیە، پێویست بە نێوانبەرێك (الوسیط) نیە لە نێوان خالیق و مەخلوقدا کە ئەمەش یەکێك لە ماناکانی سیکۆلاریزمە لای ئەو، راستیشی بۆچووە، بەڵام خۆ ناکرێت کۆمەڵگەیەکی جێگیر ببێت و پیاوانی ئایینی نەبن، راستە کۆمەڵێك دروست دەبن بەڵکو زۆرینەیەك دروست دەبن کە مەعیشەتیان لە رێگەی شەریعەتەوەیە، ئەمە گومانی تێدا نیە، بەڵام ئەگەر بتەوێت چینی مەلاگەل — بە زاراوەی کاك ئەحمەد— لەناوببەیت ئەوا تۆ لەناو دەچیت و چینی مەلاگەل هەر دەمێنێت، کە خودی کاك ئەحمەد و قوتابیەکانیشی لەسەر بوونی ئەم دیدە لە فیکری ئەودا باجێکی زۆریان داوە، تەنانەت لە یەکێك لە وتارەکانیدا کە بە وتاری (نیگڵ) بەناوبانگە دەڵێت نازانم ئەم ئایینی ئیسلامە بە دەست ئەم مەلاگەلەوە چۆن ماوە{٣٥}، بۆیە بە رای من ئەمە رەخنەیەکە کە دەکرێت لە فیکری (موفتیزادە) بگیرێت، چونکە ئەمە فیکرێکە لە سەردەمی گوزەردا و بۆ مرۆڤە مەکتەبیەکانە، بۆ مرۆڤە نوخبەکانە، بۆ ئەوانەیە کە دەیانەوێت گۆڕانکاری لەناو کۆمەڵگەدا بکەن ئەگینا بۆ خودی کۆمەڵگە نیە، ئەمە گرفتێکە وەك پێشتریش باسمان کردووە دووبارە پەیوەندی هەیە بە جیاکردنەوەی کۆمەڵ لە کۆمەڵگە، کە هەم سروش و هەم کاك ئەحمەدیش لەم بابەتەدا تێکەوتوون بە بۆچوونی من کە ناکرێت کۆمەڵگەیەك بەبێ توێژی (مەلاگەل) ببێت، کە هیچ ئایینێکیش بەبێ توێژی رۆحانی نابێت، ئەو گومانەی مۆدێرنە بەرامبەر بە ئایین پەیدای کرد هەر لە (هیوم)ەوە هەتا ئەمرۆ — کە لە زۆر شوێنی دیکەشدا باسمکردووە— تەنانەت فیکری کلاسیکی ئایینی هەڵوەشاندەوە، ئیلاهیاتی مەسیحی کۆنی هەڵوەشاندەوە، بەڵکو کۆمەڵگەی واهەبوو حەفتاساڵ بەبێ باسی خودا ژیا! (وەکو یەکێتی سۆڤیەتی پێشوو) کۆمەڵگە هەیە لەسەر لائیکیەت دروست بووە، بەڵام ئایا کەشیش و مەلاکان لەو کۆمەڵگانە و کۆمەڵگەکانی دیکەی رۆژئاوادا هەڵکەنران یاخود ئێستاش یەکێك لە چینە بەهێزەکانی کۆمەڵگەی رۆژئاوان؟! ناکرێت توێژی رۆحانی نەمێنێت{٣٦}، ئەمە یەکێك لە هەڵەکانی رۆشنبیرانی ئێمەشە کەوا دەزانن دەکرێت پیاوی ئایینی

هەڵبکەنرێن لە کۆمەڵگەدا! ڕاستە هەر خۆی لە خۆیدا بوونی پیاوی ئایینی شتێکە لە ناچاریدا قبوڵمانە، ئەگەر بکرایە خۆم مەلای خۆم و کەشیشی خۆم بوومایە وەکو مەسیحیەکان دەڵێن، ئیدی پێویستمان بە پیاوی ئایینی نەدەبوو، بەڵام لە ڕاستیدا نەمانی چینی ئایینی لە کۆمەڵگەدا مەحاڵە، کۆمەڵگەیەك نیە لە دونیادا کە توێژی ئایینی تێدا نەبێت، بوونی فیکرەیەك ڕەفزکردنەوەی پیاوی ئایینی تێدا بێت بۆ کۆمەڵگە ناشێت، لێرەدایە کە ئەو فیکرەی کاك ئەحمەد فیکرێکە بۆ حاڵەتی ئاراوتەیە و مەکتەبیە، بۆ نوخبەیە، بەڵام ئەم فیکرەی (موفتیزادە) کە لەسەر هەرسێ بنەمای نەهێشتنی چینایەتی و نەهێشتنی جیاوازی مەزهەبی و نەتەوایەتی دامەزراوە، بۆ سەردەمی کاك ئەحمەد شتێکی گەورە بووە، لەبەر ئەوەی کە فیکری باوی ئەوکاتە نەیتوانیوە هەرکام لەو شتانە پێکەوە کۆبکاتەوە، بۆ نموونە فیکری نەهێشتنی جیاوازی چینایەتی هەرگیز نەیتوانیوە لەگەڵ دوو بوارەکەی دیکەدا بگونجێ، واتە کەسێك نەیتوانیوە چەپ بێت و لە هەمانکاتیشدا ئایینی و نەتەوەییش بێت، هەروەها ئەو کەسەش کە نەتەوەیی بووە کەمتر توانیویەتی کەسێکی دیندار و دژی جیاوازی چینایەتیش بێت لە هەمان کاتدا، بەڵام کاك ئەحمەد لەناو سیستەمێکی قووڵ و گونجاودا باش توانیویەتی ئەو سێ شتە پێکەوە کۆبکاتەوە کە هەر لەو سێ بنەمایەشەوە توانیویەتی شتەکانی دیکەش بخوێنێتەوە و جیهانی خۆی دابرێژێت، تەنانەت هەر لەم سێ شتەوە توانیویەتی دیدگایەکی ڕۆشنی ببێت و بەهۆیەوە مێژووی ئیسلامی بخوێنێتەوە — دەکرێت دواتر هەندێك زێتر ئاماژە بەم بابەتە بکەم– کە گرفتی ئیمامەتی لای مەزهەبی جەعفەری بەمە چارە کردووە، بۆ نموونە ئەگەر لە مەزهەبی جەعفەریدا بوونی ئیمام پێویست بێت بۆ بەردەوامی تێگەیشتنی مرۆڤەکان لە (وەحی)، بەڵام لە دیدی (موفتیزادە)دا ئەگەر ئیمام و فیرقەکان بوونیان نەبوو ئەوا (شورا) جێی ئەوان دەگرێتەوە، کە زۆر بە ڕوونی پیشانی دەدات کە نەمانی شورایە قەیرانی فیرقە بوون و جیاوازیەکانی دروست کردووە، ئەگەر بڕیار بێت جیاوازی مەزهەبی نەبێت، ئەوا بە دروست بوونەوەی (شورا) ئەم جیاوازیە مەزهەبیانە نامێنن، واتە ئەهلی شوران کە شوێنی ئیمام و سەرۆکی مەزهەبە فیقهیەکان و شێخەکان و..هتد دەگرنەوە.

## مەکتەبی بوون و ژیان لە واقیعدا:

لێرەوە من کە دەڵێم فیکری کاک ئەحمەد فیکرێکی مەکتەبی و ئینقیلابیە و بۆ سەردەمی جێگیری کۆمەڵگە ناشێت مانای وانیە کە (موفتیزادە) ئەم واقیعەی ئێستای کۆمەڵگەی لەبەرچاو نەگرتوە، واتە هەرچەندە کاک ئەحمەد هەوڵی ئەوەی داوە (شورا) جێگەی ویلایەت و ئیمامەت بگرێتەوە و جیاوازی مەزهەبی نەمێنێت، بەڵام ئەمەش مانای ئەوە نیە ئەو واقیعەی ئێستاش هەیە لەبەرچاوی نەگرتووە، بەڵام چۆن مامەڵە بکەین لەگەڵ مەزهەبە جیاوازەکان و ئەو مەزهەبگەرایییەی ئەمڕۆ هەیە، ئایا دەکرێت بەهۆیەوە دژایەتی و زەمی یەکتری بکەین؟ کە بەبۆچوونی من هەم (مامۆستا نوورسی) و هەم کاک ئەحمەدیش لەم بابەتەدا زۆر گەورەبوون کە هەرگیز زەمکردنی خەڵکی دیکەیان قبوڵ نەبووە، تەنانەت کاتێك زۆر دەچیتە ناو باسەکانی و شیعرەکانیەوە و هەروەها گوێ لەو کاسێتانەی دەگریت کە لە دوای بەربوونی لە زیندان تۆمارکراون هەست دەکەیت قبوڵی نیە (تەنانەت) زەمی خراپەکارانیش بکرێت{٣٨}، ئەمە بەراستی شتێکی زۆر گەورە و جوان و ناسکە لە جیهانی عیرفان و ڕۆحدا، واتە وەکو ناچاری ئێمە مامەڵە لەگەڵ ئەو واقیعەدا دەکەین کە هەیە، لێرەوە کاك ئەحمەد یەکێك لە گەورەترین بیریارەکانی جیهانی ئیسلامی بوو کە توانیویەتی بەر لە خوێنڕێژی بگرێت، تەنانەت ئەوە زانراوە کە حیزبە چەپەکان لە قوتابیەکانیان کوشتووە و سزای زۆر سەختیان داون بەڵام کاك ئەحمەد نەچۆتە سەنگەری تۆڵەسەندنەوەوە ئەگەر چی توانای ئەوەشی هەبووە{٣٩}، تەنانەت ئەوەندە بەناوبانگ و مەحبوب بووە لای خەڵکی شاری سنە کاتێك هاتۆتەوە بۆ ئەو شارە لەدوای ئینقیلاب و هاتنەوەی خومەینی، خەڵکی سەیارەکەیان بەرزکردۆتەوە هێندە خۆشەویست بووە{٤٠}، واتە دەیتوانی تۆڵە بسەنێتەوە بەڵام ئامادە نەبووە ئەوە بکات، ئەوکاتەی دەگاتە ئەو قەناعەتەی دەسەڵاتی ئێرانی چارەی گرفتەکانی کوردی بۆ ناکەن، دوای ئەوەی وەکو دوایین هەوڵی خۆی فراوانترین نامە دەنووسێت لە کتێبێکدا بەناوی (دەربارەی کوردستان){٤١} و ئەو دەمەی دوو سێ لێپرسراوی کۆمەڵی برایان (الاخوان المسلمون) دەچن تکای لێدەکەن کە وازنەهێنێت و نائومێد نەبێت لە چاکسازی، بەڵام ئەو لەجیاتی ئەوەی بێت تۆڵە بسەنێتەوە و دەست بکات بە کوشتار، دێت خۆی وازدەهێنێت، کە ئەمە لە هەستێکی قووڵەوە بووە، لەگەڵ ئەو هەموو فشارەی

لەسەری بووە لەلایەن حیزبە کوردیەکان و لەلایەن دەسەلاتیشەوە کە بە راستی هەر ئەو بووە بەرگەی ئەو هەموو فشارەی گرتووە و وازی لە خەباتی مەدەنی خۆی نەهێناوە، کە دەیتوانی شوێنی خۆی مەحکەم بکات و زۆر بە ئاسانی دەسەلات باوەشی بۆ دەکردەوە، بەڵکو بە شوێن کەسێکی ئاواهیدا دەگەڕان بەلام ئەو بەمە رازی نابێت، نایەوێت ببێتە دیکتاتۆر تەنانەت لە شۆردنی جلەکانی خۆیشدا، ئەوکاتەی لە زیندان دێتەدەر و میوانی ماڵێك دەبێت و لەوێ خۆی دەشوات و دەبینن درەنگ دێتەدەر لە حەمام کە خەریکی شۆردنی جلەکانی خۆی بووە، دواتر لێی دەپرسن بۆ نەتهێلا بۆت بشۆرین، ئەویش دەفەرموێت ئاخر دەتەوێت ببمە دیکتاتۆر؟ خەڵك جلم بۆ بشوات، ئەمە چیرۆکێکە رەنگە نامۆبێت بە سەردەمی مۆدێرنە، چیرۆکی پیاوێك بەو رۆحە و بەو هەموو فەزیلەتانەی پێش مۆدێرنەوە، تەنانەت کاتێك گوێم لە دۆعاکانی کاك ئەحمەد بوو خوێندمنەوە بینیم زۆرێکیان لەو دۆعایانەن کە گێڕانەوەیان هی شیعەیە، بەلام مانای قووڵیان تێدایە، جگە لەوەش رێگەی گرتووە لە قوتابیەکانی کە خۆیان خەریکی شتێك بکەن لە توانا و باری ئەواندا نەبێت، کە ئەمەش لێکچوونێکی دیکەیە لەنێوان کاك ئەحمەد و مامۆستا نوورسیدا تەنانەت خۆی لە شوێنێکدا دەڵێت ئەگەر ئێوە بتانزانیایە! ئێستا ئەو هەموو ئەزکە نەدەکەوتە سەر شانی من{٤٢} !.هەروەها زۆر بە حەزەرەوە مامەڵەی لەگەڵ وەرگرتنی فەرموودەدا کردووە کە ئەگەر زۆر موتەواتیر و دڵنیایی تێدا نەبووبێت پشتی پێنەبەستووە{٤٣} کە هەموو ئەمانەش دووبارە لە پێناو کەمکردنەوەی جیاوازی چینایەتی و مەزهەبی و نەتەوایەتی بووە.

## کوردبوون لای موفتیزادە:

بەلام لەگەڵ هەموو ئەوانەشدا لایەنی کوردبوون لە کاك ئەحمەددا زۆر بەهێز بووە، کە هەروەکو پێشتریش باسمانکرد چ سەعید نورسی و چ ناصری سوبحانیش هەریەکەیان مامەڵەیەکی تایبەتیان لەگەڵ مەسەلەی کورد و فیکری نەتەوایەتیدا کردووە، کە (نوورسی) کتێبێکی تایبەتی هەیە دەربارەی کێشەی کوردی و بەناوی (رەچەتەی عەوام)ەوە بەناوبانگ بووە، دەوترێت گوایە بەناوی رەچەتەی کرمانج یاخود کوردەوە بووە دەستکاری کراوە{٤٤}، هەندێك لە نووریەکان وەك مەدرەسەی (زەهرا) و (مامۆستا عیزەدین) لەسەر ئەو رایەن کە دەستکاری ئەو

بابەتانە کرا بێت کە پەیوەندی بە کوردایەتی نوورسی و ئەو بابەتانەوە بووە، ئەگەر نا (مامۆستا نوورسی) زۆر بەرگری لە کێشەی کورد کردووە و لە دیدە عاریفانەکەی خۆیەوە سەیری بابەتی نەتەوایەتی کردووە و چارەیەکی تایبەتی بۆ ئەو گرفتە پێبووە و زۆر ویستوویەتی خۆی لەو فیکرە شۆڤێنی و فاشیستیە بەدوور بگرێت کە بەناوی نەتەوایەتی و نەتەوە پەرستیەوە دروست دەبێت، هەروەها (مامۆستا ناصر)یش موسایانە بەرگری لە نەتەوەی کورد دەکات، کە (موسا) پێغەمبەریش بووە و لە هەمانکایشدا بەرگری لە (بەنی ئیسرائیل) کردووە{٤٥}، بۆیە ئەویش بەم فیکرەوە دەچێتە ناو بابەتە نەتەوایەتیەکانەوە — کە پێشتر ئاماژەمان بەمانە کردووە— بەڵام دەتوانم بڵێم (کاك ئەحمەد) لە رووی فەرهەنگ و کلتورەوە و لە رووی مێژووی ژیانی کەسایەتی خۆیشیەوە لە (مامۆستا نوورسی) و (سوبحانی)ش کوردتر بووە، هەر لە بەشداریکردنیەوە لە حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێرانیدا (حدکا) و ئەو راستکردنەوانەی لە مێژووی کورددا کردوویەتی{٤٦} و تەنانەت ئەو هەوڵانەشی کە لە دروستبوونی زمانی یەکگرتووی کوردیدا داویەتی، تەنانەت ئەگەر بە وردی سەرنجی شیعرەکانی بدەیت هەست دەکەیت رێنووسێکی تایبەتی خۆی هەیە، ئەم رێنووسەشی لەسەر ئەوە بونیادناوە کە ئەو باوەڕی بە جیاوازی نێوان نووسین و وتن نیە{٤٧} وەکو ئەوەی کە لە فارسیدا هەیە، کە ئەمە رەوتێکە دەکرێت زمانزانان بە شوێنیدا بچن، هەروەها لەسەر بابەتی کورد و نەورۆز کاسێتی هەیە کە تێیدا شتی زۆر جوانی وتووەو زۆر مێژووناسانە گەلێك لەو بابەتانەی راستکردۆتەوە و بابەتی کاوە و بەرگریکردنی لە ئیمپراتۆریەتی کوردی تێدا باسکردووە کە کاتێك ئەو ئەمەی باسکردووە خەڵکی دیکە ئەو باسانەی لانەبووە و بەڵکو ئەو مێژووە پێچەوانە لێکدراوەتەوە، لێرەوە تادەگاتە سەر باش کوردی زانین کە دەشێت بڵێم زۆر جێگەی گرنگی پێدانی ئەو بووە، ئاخر ئێمە بە حوکمی زاڵ بوونی شێوەزاری سلێمانی زۆرێك لە زاراوە و وشەکانی شوێنەکانی دیکە مردوون لامان، کە ئێمە زۆرجار لەزەت لە شیعرەکانی کەسێکی وەکو (کاك ئەحمەد) نابەین لەبەر ئەوەی کە قەریحەی ئێمە جۆرێکی دیکەیە و زاراوەکان جیاوازن، دەبێت من وەکو سنەییەك بیربکەمەوە ئینجا لەزەت دەبەم لە شیعرەکانی کاك ئەحمەد، یاخود دەبێت وەکو هەورامیەك بیربکەمەوە ئینجا لەزەت لە شیعرە هەورامیەکانی دەبەم، لێرەوە دەتوانم بڵێم (موفتیزادە) زۆر

دەوڵەمەندە لە زاراوە و وشەدا{٤٨} مەگەر (هەژار) وەکو ئەو بوو بێت، تەنانەت مامەڵەی ئەو لەگەڵ نەریتی کوردەواریدا زۆر تایبەت بووە، بۆ نموونە ئەو وەسیەتەی لە بابی عورفدا بۆ قوتابیەکانی خۆی دەکات دەڵێت نەکەن جلی کوردی داکەنن{٤٩}، کە ئەگەر بە زانستی کۆمەڵناسی لێکی بدەینەوە، ئەمە وەکو رەمزێکە . و تەنها داکەندنی ئەو جلوبەرگە نیە بەڵکو شتی دیکەشی لە پەنادایە{٥٠}، ئەوە تەنها دیوە بینراوەکەیەتی بۆیە ئامۆژگاری قوتابیەکانی دەکات کە هەمیشە جلی کوردیتان لەبەر بێت و خۆیشی وایکردووە، ئیتر لێرەوە بیگرە تا دەگاتە هەستە قووڵە نەتەوایەتیەکانی دیکەی کە کەسێك بووە نەك تەنها هەستی نەتەوەیی بەڵکو فیکری نەتەوەیی هەبووە، ئەگەر فیکری ئەو سیالیزمێك بووبێت (نەتەوە، مەزهەب، چین) ئەوا یەکێکیان بریتی بووە لە باسی نەتەوە، بەڵکو هەموو گفتوگۆکانی ئەو لەگەڵ دەسەڵاتدا لەسەر بناغەی چارەسەرکردنی گرفتی نەتەوەیی کورد بووە کە تائێستاش فیکری سیاسی نەتەوەیی ئێمە نەگەیشتۆتە ئەو ئاستە، هەر لەو سەردەمەدا بابەتی فیدرالیەتی پێشنیار کردووە و بەری لە فێڵەکانی دەسەڵاتی ئێرانی گرتووە کە بەناوی یەکێتی نێوان سوننە و شیعە و یەکێتی نێوان فارس و کوردەوە ویستویانە کێشەی کورد و بابەتە نەتەوەیەکانی کورد بکەن بە ژێرەوە{٥١}، بەراستی کاك ئەحمەد زۆر قووڵ توانیویەتی فیکری ئایینی و فیکری نەتەوەیی پێکەوە کۆبکاتەوە، زۆرێك لە نەتەوەکانی دیکەدا ئەوەندەی من بەدوادا چوونم هەبێت هەستمکردووە لە فیکری ئاییندا فیکری نەتەوەیی ونە، بۆ نموونە لای بزوتنەوە ئیسلامیەکانی وڵاتەکانی دیکە، بەڵام فیکری نەتەوەیی چ لای کاك ئەحمەد و چ لای مامۆستا ناصریش لە ئێراندا ئامادەییەکی زۆر باشی هەبووە{٥٢}.

### زەمەنی یان بان زەمەنی بوونی فیکری کاك ئەحمەد:

لەگەڵ ئەوەشدا ئاماژەماندا کە فیکری کاك ئەحمەد زیاتر فیکرێکی ئینقیلابی و مەکتەبیە و بۆ سەردەمی جێگیری کۆمەڵگە ناشێت، بەڵام ئەمە مانای ئەوە نیە کە فیکری ئەو فیکرێکی زەمەنی بێت، کە دەکرێت بووترێت پێشنیاری ئەو بۆ فیکر بەو جۆرەیە، ئەگینا فیکرێکە دەچێتە بان زەمەنەوە، جارێك ئەو جیاوازی دەکات لە نێوان ئیمانی زەینی (فیقهی) و ئیمانی قەلبیدا{٥٣} کە ئەمە سەرەتایەك بووە دایمەزراندووە و دواتر (عەبدولکەریم سروش) ئەوەی فراوانتر پیشانداوە، لێرەدا کە

لای بیریارانی دیکە زۆربەی مەفهومەکان مەفهومی زەمەنی و مێژوویین، لای کاک ئەحمەد دەچنە بان مێژووەوە، کە دەتوانم بڵێم دواتر مامۆستا ناصر زۆر سوودی لەم لایەنە فیکریەی ئەو وەرگرتووە، بۆ نموونە (ئەهلی فەترە) لە فیقهی سیرەی پێغەمبەر و وەحی ناسیدا بریتیە لەو زەمەنەی کە پێغەمبەری پێشوو نەماوە و هێشتا پێغەمبەری داهاتووش نەهاتووە، واتە خەڵکانێك هەن کە پێغەمبەریان نیە، بەڵام لە تێگەیشتنی مێژووی ئیسلامیدا ئەهلی فەترە بە هاتنی پێغەمبەری خودا کۆتایی دێت، لە کاتێکدا لای کاک ئەحمەد ئەمە مێژوویەك نیە رۆیشتبێت، بەڵکو لای ئەو شتێکی بان زەمەنیە کە دەکرێت جارێکی دیکە تەوزیف بکرێتەوە تەنانەت دوای خەتمی نبووەتیش{٥٤}.

لێرەدایە کە باسی (حجة) و (اتمام حجة) لای کاك ئەحمەد و مامۆستا ناصریش دروست دەبێت، کەسێك با لە خێزانێکی موسڵمانیشدا بژی ئەگەر بە تەواوی پەیامی ئایینی پێنەگەیشتبێت هەر ئەهلی فەترەیە، لێرەوە زۆر سوودم لەو شتانە بینیوە کە کاك ئەحمەد لە جەدوەلەکانیدا باسی کردوون، ئەو چەمکانەی کە لە فیقهدا هەستمکردووە چوونەتە ناو مێژووەوە، بەڵام لای کاك ئەحمەد بوونەتە بان مێژوویی و بەردەوام لەناو زەمەندا کار دەکەن، نە ئەوەی جوگرافیایەك و شوێنێك بن و جیابووبێتنەوە لە یەکتر، بەڵکو جارێکی دیکە تەوزیف دەکرێنەوە و دەردەکەوێت کە پەیوەندی هەریەکەیان لەگەڵ ئەوی دیکەدا چۆنە، مەبەستم ئەوەیە ئەو زاراوانەی (بۆ نموونە زاراوەی فیقهی) وادەردەکەوێت کە کاتیان بەسەرچووە کاك ئەحمەد سەرلەنوێ دەیانهێنێتەوە نێو کایە فیکریەکە و بە زیندوویی رایان دەگرێت، کە بە بۆچوونی من ئەمە دەستکەلایەکی زۆر باشە کە فیکری فیقهی ئایینی جارێکی دیکە سوودی لێوەربگرێتەوە و تەوزیفی بکاتەوە، کە لە راستیدا موفتی زادە زۆر ماندووبووە لە پێناو پیشاندانی ئەو بابەتەدا کە زیاتر لە سی چل ساڵ تەمەنی خۆی لەو پێناوەدا بردۆتە سەر{٥٥}.

### دڵی ساز ودڵی ناساز:

بابەتێکی دیکە لە فیکری کاك ئەحمەددا کە لە زۆربەی بابەت و نووسینەکانیدا باسی کردووە بریتیە لە پەیوەندی نێوان زەین و قەلب، شتێك هەیە کە لای زۆرێك لە بیریارانی ئایینی ناونراوە (تەقوای پێشین)، تەقوایەك کە پەیوەندی بە مەعریفەی

ئایینیەوە نیە، زەمینەسازی وەرگرتنی مەعریفەی ئایینیە نە ئەوە خوی مەعریفەی ئایینی بێت، کاك ئەحمەد ئەمەی ناوناوە (دڵی سان) کە دەکرێت لای کافرێکیش ببێت، شتێکی زۆر وردە ئەم بابەتە، کافرێك کاتێك هەژارێك دەبینێت و بۆی دەگری یان کە حەقیقەتێکی بۆ دەردەکەوێت و هەڵەیەکی خۆی بۆ دەردەکەوێت دەگری و هەوڵدەدات خۆی راست بکاتەوە، ئەوا ئەو کافرە لەوکاتەدا دڵی سازە{٥٦}، بەڵام موسڵمانێك ئەگەر چی شایتوئیمانیشی هێناوە ئەگەر لەو کاتانەدا وەکو ئەو کافرەی بەسەردا نەهات ئەوا دڵی ناسازە لەو بوارەدا یاخود بڵێین خەسڵەتی ناسازی تێدایە{٥٧}، کەواتە سازبوونی دڵ یان ئەوەی زانایانی دیکە ناویان ناوە (تەقوای پێشین) کە مایەی هیدایەتە بۆ مرۆڤ، قورئان هیدایەتە بۆ ئەوانە (هدی للمتقین){٥٨} ئەمەشە پێش تەعلیم دەکەوێت لای کاك ئەحمەد بریتیە لە (تەزکیە){٥٩}، کە لە باسەکانیدا زۆر تەرکیزی کردۆتە سەر ئەم بابەتە و هەمیشە لای ئەو تەزکیە پێش تەعلیمە، بەڵگەشی ئەو ئایەتەیە کە دەفەرموێت ﴿کما أرسلنا فیکم رسولا منکم یتلو علیکم آیتنا ویزکیکم ویعلمکم الکتاب والحکمة﴾{٦٠}. کە لێرەدا مانای ﴿یتلوا علیکم آیتنا﴾ لای (موفتیزادە) جیاوازە لەو مانایەی لای مامۆستا ناصر هەیەتی، لای کاك ئەحمەد بە مانی تیلاوەی ئایاتی وەحیە، بەڵام لای ناصری سوبحانی بریتیە لەو ئایەتانەی کە ئافاقی و ئەنفوسین، جا لای (موفتیزادە) سازکردنی دڵ و تەزکیە دەکەوێتە پێش تیلاوەی ئایاتی وەحیەوە، واتە دەبێت تەقوایەکی پێشین دروست بووبێت بۆ ئەوەی ئەم فێربوونی کتێبە(تلاوة الآیات) ببێتە هیدایەت (هدی للمتقین)، ئەمەیە فیکری موفتیزادە لە گەیاندنی ئایینیدا کە لە دوای سالی چلوسێی هەتاویەوە ئەمەی بۆ دروست دەبێت، کە مەکتەبەکانی قورئان لە شارەکانی کوردستانی ئێراندا دروست دەکات و خەریکی پێگەیاندنی قوتابیەکانی دەبێت، هەروەکو چۆن لای نوورسی لە پاڵ سەعیدی کۆن و سەعیدی نوێدا سەعیدێکی سێیەمیش هەیە، بەهەمان شێوە کاك ئەحمەدیش قۆناغی یەکەمی بە خوێندنی حوجرە و بوون بە مەلا دەست پێدەکات و قۆناغی دووەمی وەرگرتنی رۆشنبیری و مەعریفەی دەرەوە ئایینیەتی و قۆناغی سێیەمیش کە لە ساڵی (١٣٤٣)ی هەتاویەوە دروست دەبێت بریتیە لە قۆناغی ئەو پەیوەندیەی نێوان زەین و قەلب لای ئەو کە باسمکرد، بەڵام قۆناغێکی چوارەمیشی هەیە کە زەمەنی زیندانیکردنی و دوای زیندانیشی دەگرێتەوە، کە زۆرتر دەبێتە کەسێکی رۆحی و

قەلبی و ئەوکاتەی لە زیندانی ئینفیرادیدا بووە چرکەساتی رۆحی زۆر سەیری بۆ دروست بووە کە لەوەو پێش تەجرەبەی لەو جۆرەی نەکردووە، بەلام قۆناغی گرنگیدان بە (تەزکیە) لای ئەو لە دوای چلوسێی هەتاویەوە دەست پێدەکات، هەروەکو چۆن ژیانی (سەعیدی نوێ) لە دوای سالی (١٩٢٣)ەوە دەست پێدەکات و ژیانی تەواو چوونە ناو قورئانی (سوبحانی)ش لە دوای نووسینی کتێبی (الولاية والامامة)وە دەست پێدەکات، (ئەمە پۆلبەندی فیکریە نەك مێژوویی) جا مەفهومی تەزکیە دروستبوونی حالێکی تایبەتیە لای مرۆڤ کە ئیدی ئامادەیە بۆ (تعليم)، کە هەمیشە کاك ئەحمەد لە بابەتەکانیدا و لەو خشتانەی کە دایناون و لەو قۆناغانەی بۆ پێگەیاندنی قوتابییەکانی دەست نیشانی کردوون و تەنانەت لە بابەتی (علوم الآلة) و (علوم الغاية)دا کە فەقیهەکان دەیخوێنن، لە هەموو ئەوانەدا زۆر تەرکیزی لەسەر ئەو لایەنە قەلبیە هەیە{٦١}، کە ئەم دل سازکردنە تەنها پەیوەندی بە عەقایدەوە نیە، دەکرێت بلێین ئەمە نزیکیەکی هەیە لە مەفهومی (ئیمان)ەوە لای (سەعید نورسی) کە وتمان لای ئەو ئیمان و عەقیدە جیان لە یەکتر و جیاوازیان هەیە یاخود دەتوانین بلێین نزیکە لە عیشقی عیرفانی زوهدەکەی لای (ئیمامی غەزالی){٦٢}. دل و دەرك، گەشانەوەیەکی دیکە بۆ پەیوەندی دلی سازودەرکی پێشتر:

بەلام ئایا ئەم قەلبە لە بۆشاییدا تەزکیە دەکرێت؟ پێویستی بە تەعلیمی پێشتر نیە؟ لێرەوە دەبێت بۆ پەیوەندی نێوان عیشق یاخود تەقوای پێشین لەگەل دەرك و مەعریفەدا بگەڕێین، ئایا دەکرێت مرۆڤ لە نەزانیندا و بەبێ مەعریفە دلی ساز بکات؟ ئایا قەلب بەبێ زەین دەیکرێت؟ لێرەوە دەمەوێت بچمەوە سەر ئەو ڕێبواریەی کاك ئەحمەد لە نێوان زەین و قەلبدا، بێگومان ئەوەم باس کرد کە (موفتیزادە) قەناعەتی وایە کە تەزکیە یاخود سازبونی دل (تەقوای پێشین) دەکەوێتە پێش فێربوونەوە، بەلام ئایا ئەوەی کەوتۆتە پێش دەرکەوە دووبارە پێویستی بە دەرکێکی دیکە نیە؟ لێرەدایە کە یەکێتیەکی قوول لە نێوان (زەین و قەلب)دا دروست دەبێت، عاقل و مەعقول دەبنەوە بە یەك، چرکەساتێکی زۆر سەیرە، کە دەفەرموێت: لە راستیدا تەقوای پێشین و تەزکیەش لانی کەمی دەرکی پێویستە، شتە ئیعتیباری و عەرەزیەکان بوونیان لە خۆیانەوە نیە، بۆ نموونە نەخۆشی بوونی نابێت تا کەسێك نەبێت نەخۆش بێت، ژیری بوونی نابێت تا کەسێك نەبێت کە ئیمکانیاتی ژیربوونی ببێت و ژیر بێت، هەروەها تەزکیەش بوونی نابێت هەتا

(مزکی)یەك نەبێت و ئالەتێك و مەعلوماتێك نەبێت ببێتە خۆراکی ئەو (تەزکیە)یە، تا نەزانیت نەفس چیە؟، خالق چیە؟، خودی تەزکیە چیە؟، چۆن دەتوانرێت کەسێك تەزکیەی ببێت؟ ئەمە یەکێك لە چرکەساتە زۆر قووڵە فەلسەفیەکانی لای (موفتیزادە)یە کە دەکرێت سەدان سەعات قسەی لەسەر بکرێت، کە کاك ئەحمەد زۆرێك لەم چرکەساتانەی هەیە کە هەتا کەنار رۆیشتووە و ئیتر لەوێدا وەستاوە و ترساوە لەوەی بەرامبەرەکان لێی تێنەگەن!، زۆرن ئەوشتانەی ترساوە لەوەی بەرامبەرەکان لێیان تێنەگەن و لە رووکەشدا دژیەك (متناقض)ن کە لە زۆر شوێندا بەناوی (حافین)ەوە باسیان دەکات، بەڵام ئیدی لەوێدا دەوەستێت کەوا دەردەکەوێت چارەنەکراو بن ئەگەرچی لە خۆیدا چارەشکراون، بەڵام لەبەر ئەوەی زەینی بەرامبەر توانا و ئامادەیی ئەوەی نیە لەم بابەتانەدا تێبگات، هەروەك (مەولانا)ش چرکەساتی لەو بابەتەی هەیە کە ناودژێتیەك دەردەکەوێت، دەبینیت لە یەك کاتدا ئەوپەڕی عەزابی خودا و ئەوپەڕی رەحمی خودا، ئەوپەڕی ئیکرامی خودا و ئەوپەڕی جەلالی خودا – ذوالجلال والاکرام–{٦٤} چەندەها حاڵەتی لەو شێوەیە هەن کە (مەولانای رۆمی) بە یەك قسە دەڵێت تەنها وەڵامی ئەو بابەتانە بە (عیشق)ە{٦٥}، هەروەها مامۆستا نوورسیش حاڵەتی لەو بابەتەی هەیە، وەك لە شوێنێکدا دەفەرموێت جەهەننەم بۆ جەهەننەمیەکان باشە، ئەمانە حاڵەتانێکن کە بە (عیشق) وەڵام دەدرێنەوە، لە سازبوونی دڵدا، لە یەکگرتنەوەی نێوان (عەقڵ و دڵ)دایە{٦٦}.

## موفتیزادە و رەخنەی لە دەستووری ئێران:

هەروەك باسمکرد فیکری کاك ئەحمەد فیکرێکە رۆشنە و فیکرێکی فەلسەفی کرداریە (الفلسفة العملیة)، کاك ئەحمەد زۆر باش توانیویەتی بە فیکری فەلسەفی خۆی قسە لەسەر بڕگەکانی ناو کۆمەڵگە بکات، زیندووترین شتی ناو کۆمەڵگەی ئێرانی دەستوورە کە زۆر رەخنەی جوانی ئاراستە کردووە، ناکرێت کەسێك یاساناسێکی باش نەبێت و بتوانێت بەو وردیە رەخنەی دەستوور بکات، کە زۆر بە قووڵی و بڕگە بڕگە لەگەڵیدا رۆیشتووە، دواتریش دەیکاتە وانە و دەیلێتەوە، پێیان دەڵێت کوا ئەوکاتەی (طالقانی) دەیووت: دەبێت دەوڵەتێکی قورئانی دروست بکەین{٦٧}، ئاخر دەوڵەتێکی قورئانی چۆن دەتوانرێت تەنها دەوڵەتێکی

جەعفەری بێت؟ كە بەمە جیاوازی و تەفرەقەی (مەزهەبی) و (چینایەتی) و (نەتەوایەتی) دروست دەكەن، بەم وردیە هاتووە دەستووری خوێندۆتەوە.

## مانای ماناكان لای موفتی زادە:

وەك ئاماژەمان پێدا قەریحەی (موفتیزادە) هەم لە فەلسەفەدا هەم لە فیقه و نیزامی سیاسی و فیكری خۆیدا قەریحەیەكی پێش مۆدێرنیزمانەیە، كە لە زماندا زۆر باش دەردەكەوێت، نموونەیەك بۆ ئەمە بریتیە لە كاسێتەكانی باسی (ئیسرا و میعراج) كە زۆربەی رەهەندە فیكریەكانی (موفتیزادە) روون دەكاتەوە من هەمیشە ئەو پرسیارەم هەبوو كە بۆشاییەك لە قورئاندایە و بە من كەشف ناكرێت! بە مانایەكی دیكە بڵێم هەستم دەكرد موتەشابیهاتم بۆ چارە ناكرێت یاخود لێی تێناگەم، ئەم ئایەتەم دەبەستەوە بەو ئایەتەی دیكەوە وبۆ ئەمە دەبێت نموونە بهێنمەوە: وەكو ئەوەی دوو شت وەكو یەك بن بەلام یەكێكیان كەمێك بچووكتر بێت لەوی دیكەیان، وەكو دوو قابلەمە ئەگەر یەكێكیان هەر تۆزێك بچووكتر بێت لەوی دیكەیان ئەگەرچی لە دوورەوە وادەركەوێت وەكو یەكن، بەلام یەكێكیان دەچێتە ناو ئەوی دیكەیانەوە و دەشجوڵێنرێت لە ناویدا چونكە بچووكترە، لێرەوە دەكرا سیستەمێكی قورئانی بۆ خۆم بینا بكەم بەلام هەستم دەكرد هێشتا هەر پڕ بە پێستی خۆی نیە، بۆشاییەك هەیە و بۆم پڕنەكراوەتەوە، وەهاشم دەبینی كە هیچكام لە بیریارە ئیسلامیەكان ئەو بۆشاییەیان بۆ پڕنەكراوەتەوە، ئەگەر چی فیكری زمانەوانی (لغوی) كۆن فیكرێكی تاك مانابیە بەلام بۆیان نەكراوە ئەو مانا تاكە بدۆزنەوە، باشە لە كوێی سیرە و فەرموودە و قورئاندا بۆی بگەڕێم، دواتر بۆم دەركەوت كە كاك ئەحمەدیش هەمان گرفتی هەبووە، مانایەكی ورد هەیە كە نهێنی هەموو ماناكانی دیكە كەشف دەكات، لە فەلسەفەی زمانی نوێدا بۆ ئەوەی دەقێك تێبگەیت مەرج نیە كۆی سیستەمی دەقەكەت كەشف كردبێت یان بۆ ئەوەی لە كتێبێك تێبگەیت مەرج نیە هەمان ئەو مانایەت مەبەست بێت كە نووسەری كتێبێكە مەبەستی بووە، بەلام فیقهی زمانی كۆن هەر لە سەردەمی یۆنانەوە كەهاتووە مەبەستی نووسینەكە لەبەرچاوگیراوە، لەوێ مومكین نیە لە سیستەمێكی زمانی تێبگەیت ئەگەر كۆی مەتنەكەت كەشف نەكردبێت، لەبەر ئەوە كاتێك بۆشاییەك دەهێڵرێتەوە لێی تێناگەیت یاخود ناتوانیت سیستەمەكەت كامڵ بكەیت، بەلام لە

فیقهی زمانی نوێدا ئەمە ئاساییە بە حوکمی ئەوەی ئۆپێرایەك — بۆشایی — هەیە لەناو زماندا تەنانەت هەربەشێك لە دەقەکە بخوێنیتەوە تۆ مانای خۆتی لێوەردەگریت، ئەمە بۆ کەسێك کە قەریحەی پێش مۆدێرنەی هەیە بوونی بۆی هەرس ناکرێت لەبەر ئەوە هێشتنەوەی تەنها بۆشاییەك بۆ ئەو دەبێتە (نهێنی)، کە لە زانستی ئیشارەی کۆندا چ زمان بێت و چ تەسەوف بێت بەشوێن تاکە مانای نهێنیدا گەڕاون — کە لە تەسەوفیش بەشێکی زانستی ئیشارەیە وەك تێگەیشتن لە مەقامەکان و سرڕەکان..، بۆیە زاراوەکانی وەکو (سر، سرالسر) لەو بابەتەوە دێن کە شتێك هەیە ماوتە لێی تێبگەیت، لێرەدا مەدرەك زۆر گرنگە، بەڵام لە زمانی نوێدا شتی خۆتت دەست دەکەوێت بێ ئەوەی بگەیتە شتە جەوهەرە (نادر)ەکە، بێگومان ئەمەی لە زماندا باسی دەکەم کاردانەوەی لە سۆسیۆلۆژیا و دەروونزانی و شتەکانی دیکەشدا هەیە، تەنانەت لە بابەتێکی وەکو سێکسیشدا گەیشتن بە ئۆرگازم، ئەوەی (فۆکۆ) لە کتێبەکانیدا زۆر ئاماژەی پێکردووە، گەڕان بە شوێن تاکە شتێکدا و لە مامەڵەی سێکس ...ەمرۆدا ئەوە نیە، تەنانەت لە سۆسیۆلۆژیاشدا وەك مردن لە پێناو یەك شدا، هە..وو کۆمەڵگە بابمرێت بەڵام حەقیقەتێك هەیە کەشف ببێت هەنوکە بوونی نیە حە ئەوسا هەیبوو.

لێرەدا حوکمی ئەخلاقی نادەم بەسەر ئەو بابەتانەدا کە ئەمە باشە یان ئەو باشە، چونکە من لێکۆڵەرەوانە مامەڵە لەگەڵ ئەو بابەتانەدا دەکەم، لێرەوە هەست دەکەیت لە فیکری کۆندا هەمیشە ئەگەری بۆشاییەك هێڵراوەتەوە با زۆر بچووکیش بێت ئیدی کاردەکاتە سەر تێگەیشتن لە کۆی سیستەمەکە و دەبێتە نهێنی (سر)، بۆیە کاتێك (موفتیزادە) لە بابەتی (ئیسرا و میعراج)دا دەفەرموێت: پێغەمبەری خودا حەقیقەتی هەموو موتەشابیهاتی لە (میعراج)دا بۆ دەرکەوتووە {٦٨}، سوودی لەو فەرموودانە بینیووە کە لەم بارەیەوە باس دەکەن، وەك ئەوەی پێغەمبەری خودا لەو شەوەدا هەموو بەهەشت و جەهەننەمی بینیووە یاخود لەو شەوەدا نوێژ وەکو بنەڕەتی سەرەکی ئایین واجب کراوە، ئەمە مانای ئەوەیە نهێنیەك هەیە لە (وەحی)دا لەوکاتەدا بۆ پێغەمبەر دەرکەوتووە، واتە نهێنیەکە لە دەرەوەی قورئاندا بۆ پێغەمبەر (لە شەوی میعراج)دا دەرکەوتوە، ئەمەش پێشاندەری ئەوەیە کە بۆچوونی کاك ئەحمەد لە زماندا بۆچوونێکی کلاسیکیە، دیارە ئەمەش توانا بە مرۆڤ دەدات کە شتی نوێ کەشف بکات و داهێنانی نوێی ببێت، هەر بۆیە کاك ئەحمەد

بەو تیۆریایەی کەوا دەزانرا پێی نەماوە(تیۆریا کلاسیکیەکانی زمان) توانیویەتی زۆر شتی نوێ کەشف بکات، بۆچوونی قووڵی هەبووە لەسەر سیستەمی فیکری و سیاسی تەنانەت لەسەر مەکتەبە فەلسەفیەکان و هەروەها لە زمانیشدا، کە وەکو (مامۆستا ناصر) نیە دوای ئەوەی موتەشابیهاتی کەشف کرد کە یەك مانای هەیە (هەروەکو پێشتر باسمان کرد) ئیدی دواتر هەر بە خودی قورئان خۆی مانای زاراوەکانی قورئانیش دەکات.

## فیکری دەرەوە ئایینیانەی موفتی زادە:

دەتوانم خەت بهێنم بەژێریدا ئەگەر لە رووی فەلسەفی و ئایینیەوە قسە بکەم کە بە حوکمی ئەوەی حەقیقەتێکی تازەیە و رەنگە زۆر خوێنەر هەبێت تێنەگات مەبەستم چیە لەمە، فیکری کاك ئەحمەد هەم لە فیکری مامۆستا ناصر و هەم لە فیکری سەعید نوورسیش زیاتر فیکرێکی دەرەوە ئایینیە، کە سیستەمەکەی مەکشوفە، وەك باسمان کرد لە رێگەی نەهێشتنی جیاوازی چینایەتی و نەتەوە و مەزهەبەوە بینا بووە، هەر لەمەشەوە تەفسیری قورئان دەکات، کە رۆحی ئایینز لەوەدا دەبینێتەوە کە ئەم جیاوازیانە نەمێنێت، بەڵام ئێمە لەمانای ئەم شتانە (نەتەوە و ئایین و چین) تێدەگەین بەبێ ئەوەی بەك ئایەت بهێنینەوە، بەڵام ئایا لە سیستەمی ئابووری و سیتەمی سیاسی و فەرمووردەناسی لای مامۆستا ناصر تێدەگەین ئەگەر باسی قورئان نەکرێت؟ کەواتە فیکری کاك ئەحمەد زۆرتر لە دەرەوەی ئایینە لە رووی فەلسەفەی ئایینەوە، هەربۆیەش باوەڕی بە تەقوای پێشین هەبووە، ناڵێم فیکری هەریەك لە (سوبحانی) و (نوورسی) زۆر دوور بووە لەمەوە، بەڵام دەشێت بڵێم فیکری کاك ئەحمەد زۆرتر نزیکە لە رۆحی مۆدێرن و ـەلسەفەی دینی نوێ، بەیەکەوە ژیانی شتە دژەکان لە سەردەمی نوێدا وەکو پلۆرالیزمی مەعریفی و پلۆرالیزمی ئەخلاقی و پلۆرالیزمی ئایینی، ماناکانیان لە دەرەوە رۆشنن و گوتارەکەی تەنها گوتاری ئایینی نیە، ئەوەی کە قورئان کەلامی خودایە و دەبێت بە گوێی بکەم بۆ کەسێکی دیندار جێگەی قبوڵە، بەڵام ئەمە جیایە لەوەی بووترێت پراکتیك کردنی عەدالەت لە بە بەگوێکردنی قورئاندایە: بەوەی جیاوازی چینایەتی ناهێڵێت و نەتەوەکان و چینەکان بە مافی خۆیان دەگەن، بەڵکو ایینیەکان بە مافی خۆیان دەگەن، دەبینیت دەوڵەمەندیەك هەیە لەم فیکرەدا،

ئەمە وەکو شاهیدییێکیش دەیڵێم. جیا لەوەی کە (موفتیزادە) زۆرتر شتەکانی بە مەتنی بووە و دولتر (سوبحانی) زیاتر لە قورئان شارەزا بووە تا کاک ئەحمەد، جگە لەوەش کە کاک ئەحمەد تا ئەو کاتەش کە سەری نایەوە پشووی نەداوە هێشتا هەر ڕێبوار بوو، کە من ناوم ناوە (خاڵە ڕێبوار)، بەڵام (مامۆستا نوورسی) دوای ئەو ئینقیلابە ڕۆحیەی بەسەریدا هات ئیدی تەواو بوو بە عاریفێکی گەورەی خزمەتگوزاری قورئان و بەرگریکار لە ئیمان، لە کاتێکدا هەست دەکەیت کاک ئەحمەد بەردەوام لە سەفەردایە، هەر لە وەسفکردنی شاخەکانی کوردستان و ئەو تاسەیەی کە هەیەتی بۆ سروشتی کوردستان، کە دەشێت بڵێم دوای (گۆران) سروشت ویستێکی وەك کاک ئەحمەد بوونی نیە لەناو شاعیرە کوردەکاندا{٦٩}، تەنانەت شیعرەکانی هەندێکیان قەلبین وەکو خۆی دەڵێت، هەندێکیان هی دەرەوە ئایینین، لێرەدایە کە ئەو کەسەی دەیەوێت تەنها خوێندنەوەیەکی عیرفانیانەی بۆ کاک ئەحمەد ببێت تووشی موباغەتە دەبێت، بەهەمان شێوە ئەو کەسەش کە دەیەوێت خوێندنەوەی دەرەوە ئایینیانەی بۆی ببێت کە دەبینێت دەگاتەوە بە (قەلب) و بە حاڵەتە ڕۆحیەکە، تووشی موباغەتە دەبێت، کە بە ڕاستی زەمەنی کاک ئەحمەد زەمەنی دژەکانە، زەمەنی ڕێبوار بوونە، ڕێگایەکە بەردەوام دەبێت مرۆڤ تێیدا گوزەر بکات و نابێت بوەستێتەوە چونکە ئەگەر وەستایەوە لێی تێناگات، لێی تێك دەچێت! دوایی شەمەندەفەرەکە بەجێیدەهێڵێت، ئەگەر لە (قەلب)ەوە قسە لەسەر کاک ئەحمەد بکەیت ئەوا نیوە (زەین)یەکت کوشتووە و بە پێچەوانەشەوە ئەگەر تەنها لە (زەین)ەوە بیخوێنیتەوە ئەوا نیوە (قەلب)یەکەی دەکوژیت، سەرزەویەکە پڕە لە ناودژێتی (تناقض) بەڵام ئەوەش بڵێم کە ئەمە مانای ناکامڵی فیکری کاک ئەحمەد نیە، دەتوانم بڵێم کاک ئەحمەد بریتی بوو لەو پیاوە عاریفە فەیلەسوفە سیاسیە هەزار ویستەی کە ڕێبوارێك بوو لەنێوان (زەین و قەلب)دا، بەڵام بۆچی ناوم نا (فەیلەسوف)؟ لە بابەتەکانی موفتیزادەدا هەمیشە ئیرادەیەکی تاکی بوونی هەیە (شتێکی تایبەت بە خۆی)، بۆ نموونە کە لەگەڵ هەژاراندا ژیاوە، ئەو ژیانە کۆششێکی عاریفانە و ڕۆحیانەیە بە تایبەتی (ئەزموون) لای (موفتیزادە) (وەك لای عاریفەکانی دیکە وایە) شتێك نیە ڕۆح پێی بگات، وەك ئەوەی لای (مەولانا) بەو جۆرەیە، با بۆ ڕوونکردنەوەی ئەمە نهێنیەك لای کاک ئەحمەد کەشف بکەم کە ڕەنگە خەڵکی دیکەش پێی زانیبێت بەڵام بۆ من ڕازێك بوو دوایی پێم زانی،

(ئەزموون) لای (کاك ئەحمەد) حاڵەتێکی رۆحی و تەقاندنەوەی تواناکانی رۆح نیە بەڵکو (ئەزموون) چەشتنی تاڵی هەڵەکانی لەوەو پێشە، منی گوناهبار پێویستم بە تەوبە هەیە گوناهەکەی لەوەو پێش ئەو ئەزموونە دروست دەکات؛ واتە ئەزموون لای کاك ئەحمەد تەجرەبەیەکی لە سەداسەد نوێ نیە، شتێك نیە لە سەرەتاوە ئاسان بووبێت و دواتر قەیرانەکان دروست بوو بن{٧٠}، نا قەیرانەکان لە پێشەوە بوون لە تەجرەبەکانی کاك ئەحمەددا، بێگومان لە عیرفاندا پێشتر مەلامەتگەرەکان و ئیرادە ویستەکان لەو بابەتەیان هەبووە، چوون لە قاپی عارەقدا ئاویان خواردۆتەوە لەبەرچاوی خەڵکی بەڵام ئەمە ئەوەی کاك ئەحمەد نیە کە مانایەکی رۆحی بەحتە، لێرەدایە کە باسی (حافیز) دەکات و یەکێتیەك لەنێوان مامەڵە زەمینی و مامەڵە ئاسمانیەکاندا دروست دەبێت کە بەرای من برگەیەکی زۆر جوانە لە فیکری کاك ئەحمەددا، ئەو کەسەی زۆر دونیاییە و عاشیقی کچێك بووە دەتوانرێت بکرێتە دەستکەلای بابەتێکی ئاسمانی، چونکە ئەوە دەبێتە دەستکەلای ئەزموون، ئەگەر ئەزموون تەنها رۆحی رووت بێت و لە داهاتوودا دروست بێت، ئەوا لێرەدایە کە وتراوە (المجاز قنطرة الحقیقة) بزانە چەند قووڵ لەم بابەتە تێگەیشتووە، ئەمەشە مانای لە (فەقر)ەوە تەقەدان لە دەرگای رەحمەتی خودا ئەوەی کە (نوورسی) باسی دەکات، دەبێت لە پێشدا گەزرا بێت، نقورچێکی زەمانەی بەرکەوتبێت وەك دەوترێت دەستهاڕی زەمانە هاڕیبێتی ئینجا دوایی لەزەت لەو بابەتە دەبات، یاخود (جیمس جویس) گوتەنی دەبێت زەمین تەواو بوو بێت ئینجا ئاسمان دەست پێبکات، تەنانەت ئەزموونی کاك ئەحمەد شتێك نیە بە ئاسمانەوە بسنورێتەوە وەکو عاریفە هیندیەکە وتی سوێند بە خودا من بوومایە لە جیاتی (موحەمەد) دانەدەبەزیمەوە بۆ زەمین هەر لە ئاسماندا دەمامەوە، (ئەوکاتەی کە پێغەمبەری خودا (د.خ) (ئیسراو میعراج) دەکات) لێرەدایە کە وتمان هەستی جەمالی کاك ئەحمەد هەژارویستە، هەڵە ویستە، ئەمەیە کە لای سوریالیەکان بە جۆرێکی دیکە دەکەوێتەوە، جەهەننەم دەبێتە گوڵێك لە باخەکانی بەهەشت، هەڵەکانی رابردوو دەستکەلایەکە بۆ ئەزموونی جوان، ئەمە لێبوردەیی بەرامبەر ژیان و بەرامبەر بە مرۆڤەکانی دیکە دروست دەکات، مانای ئەوە نیە نۆرماتیڤانە لێگەڕێم هەڵە بکات، بەڵام تەوسیفیانە هەڵەکەی لێ قبوڵ دەکەم. چونکە رەنگە ئەمە ببێتە دەستکەلای ئەزموونێك، نورماتیڤانە دەبێت رێگای (تەزکیە)ی پیشان بدەم؛ بەڵام دواجار ئەو

هەڵانەش کە هەیەتی لێی گەورە ناکەم، ئیرەشدایە کە دەفەرموێت (ئامان، ئامان، خاکی بن){٧٢} کە ئەوەندەی تەرکیز لەسەر خاکی بوون (تواضع) دەکات ئەوەندە لەسەر شتی دیکە نایکات، بەردەوام دان بە هەڵەکانی خۆیدا دەنێت، تەنانەت بە کوڕەکەی دەڵێت من باوکێکی باش نەبووم بۆ تۆ، ئەمە گەورەییە کە ئەگەر کەسێك بەو ئەندازەیە گەورە نەبێت ناتوانێت ئەوە بکات، ئەمە لە لایەنی (قەلب)ەوە، لەلایەنی (زەین)یشەوە وەك باسم کرد زۆر بە وردی رەخنەی فەلسەفەی کۆن و فەیلەسوفەکان دەکات!

## موفتی زادە و زانستە ئەزمونیەکان:

شتێکی دیکە هەر لەم رێبواریەی کاك ئەحمەددا ئامادەیی زانستە ئەزموونیەکانە لای ئەو کە بەردەوام لە باسەکانیدا ئاماژە بە زانستەکان دەکات وەکو کیمیا و فیزیك و بایۆلۆژی، بەڵام ئەمە مامەڵەیەکی دەرەوە ئایینیە، هەرچەندە دەیەوێت بەهۆیەوە حەقیقەتێکی ئایینی پێ بناسێنێت، تەنانەت لەو کاسێتەدا پرسیاری موتەشابیهاتی لێدەکەن، بە چەمکە تەجرەبیەکان باسی چارەی ئەم بابەتە دەکات{٧٣}، راستە (سەعید نوورسی) و (مامۆستا ناصر)یش بەردەوام ئەوەیان هەبووە، کە (سوبحانی) بە تایبەتی لە سەلماندنی (وجود الله)دا ئیستدلالی بە علومی تەجریبی کردووە، بەڵام هیچکامیان بە ئەندازەی کاك ئەحمەد مامەڵەی دەرەوە ئایینیان نەبووە، تەنانەت لە شەرحی مەتنە ئایینیەکاندا زیاتر شەرحێکی دەرەوە ئایینی دەکات، بۆ نموونە نایەت زاراوەیەکی قورئان بە خودی قورئان مانا بکات بەڵکو مانایەکی دەرەوە ئایینی بۆ دەکات کە رۆشنبیریەکی فراوانی لەو بوارەدا هەبووە، بەڵام دواجار دەتوانین بڵێین مرۆڤێکی پێش مۆدێرنە بووە.

خۆزگە هەریەك لە (نوورسی و سوبحانی و موفتیزادە)ش ئەوروپایان وەك ئەوروپا ببینیایە و مەکاتیبە فەلسەفیەکانی ئەویان وردتر بخوێندایەتەوە. ئەمەش مانای ئەوە نیە کە ئەوان نەیانتوانیوە رۆژئاوا بخوێننەوە و بناسن، بەڵکو زۆر قووڵ رەنگە کەم کەس ببێت توانیبێتیان وەکو ئەو سێ کەسایەتیە رەخنەی رۆژئاوا بکەن لەگەڵ ئەوەشدا رۆژهەلاتیش تێکنەدا، (ئایین)یان وەکو خۆی ناسیوە..(کلتور)یان وەکو خۆی ناسیوە، بەڵکو لە کلتوورەوە هاتوونەتە دەرێ، بەڵام ئەم هاتنە دەرەوەیە لە کلتور ئەوانی کردۆتە پاڵەوان، پاڵەوانێك کە قەزەمەکانی ناو مۆدێرنە

سەیری باڵای بەرزیان بکەن، زیرەکیان و بلیمەتیان و رۆحانی بوونیان، کە لە سەردەمی مۆدێرنەدا ئەو شتانە دەست ناکەون، واتە لە (یەقین) دەگمەنترن! خۆزگە دەخوازم بریا منیش کەسێکی کلتووری بەحت بوومایە و یەقینم هەبووایە لەوەدا وەکو ئەوان بە شوێن یەك ماناد بگەڕامایە و بمتوانیایە بەو یەك ماناییەش دونیایەك ئیمکانیات بسازێنم، بەڵام ئێمەی ناو مۆدێرنیزم پارەپارە بووین.

دواجار کاك ئەحمەد وەك هەرکەسێکی دیکەی شەستەکان و حەفتاکان موعجەب بووە بەرامبەر بە زانستە ئەزموونیە نوێیەکان و تەوزیفیشی کردوونەتەوە و زۆرێك لە چەمکە زەینی و قەلبیەکانی خۆی پێ کەشفکردووە، ئەو مووەحیدانە بیری کردۆتەوە لەوەی خۆیشی تێك بشکێنێت، بە زاراوەی خۆی نەبێتە بتێك بپەرسترێت{٧٤}، یاخود ئەو دەرەنجامانەی گرتوونی بە حەقیقەتی موتڵەق بزانرێن، دەشێت بڵێم ئەمە شتێك بووە زۆر ئازاری کاك ئەحمەدی داوە، کە بریتی بووە لە تەنیایی، تەنیایی لەوەدا کە کەسانێکی زۆر پێی موعجەبن و تەنهایە، چۆن بتوانێت لە بەرامبەر ئەم هەموو ئیعجابەدا لە بەردەم نەفسیدا دانەڕمێت، لەوەدا کە هەندێك دەرکی مەعریفی کردووە، ئەوانەی لەگەڵیدا بوون زۆر دەرکیان نەکردووە. واتە لەلایەکەوە تەنیایی قەلبی کە چۆن نەفسێك بەرامبەر بەو هەموو ئیعجابە بووەستێتەوە، لەلایەکی دیکەوە تەنیایی مەعریفی کە زۆر ترساوە لەوەی مەعریفەی ئەو ببێتە مەتنی خودی ئایین{٧٥}، تەنیاییەکی قەلبی کە ئەگەر چی لە ئینفرادیش ببێت بتوانێت خودای لەگەڵ ببێت{٧٦}، بەراستی زاڵبوون بەسەر ئەم هەموو تەنیاییەدا کارێکی زۆر سەخت بووە، بۆیە داستانی کاك ئەحمەد داستانێکی پڕ لە بەرزی و نزمیە و شەپۆلاویە، داستانێکە هەر لە بواری درێژیدا گۆڕانی بە سەردا نەهاتووە کە ئەم قۆناغەی بڕیبێت و چووبێتە قۆناغێکی دیکە، بەڵکو لە بواری پانیشدا گۆڕاوە و درامایانە مامەڵەی کردووە.

## موفتی زادە و نامە لەسەر نامە نووسین:

یەکێك لە جوانترین شتەکانی کاك ئەحمەد نامە نووسینی بووە کە من زۆر سەرم لەبەردەمیدا سوڕماوە، بێگومان بیستومە زۆرێك لە سەرکردە نێو نەتەوەییەکان و تەنانەت سەرۆکەکانی ئەمریکاش کە ژیننامەی هەندێکیانم خوێندۆتەوە کە هەیانبووە زۆر ئیعتیمادی لەسەر نامەنووسین و وەڵامدانەوەی نامە بووە، یەکێك

لەوانە ،جۆرج واشنتۆن) بووە کە جاربووە نامەی منداڵێکیشی وەڵامداوەتەوە، تەنانەت (کلینتۆن)یش کە برادەرێك نامەیەکی ئەوی هێنابووە کە بۆ کچێکی موسڵمانی پێنجی ئامادەیی نووسیبوو، بەڵام کەسێك کە لە کۆشکی سپیدا دانیشتووە باکی لە هیچ شتێك نیە جیاوازە لەگەڵ کەسێکدا کە لە زینداندایە، ئازار دەدرێت، دەرمانخوارد دەکرێت و نەخۆش دەخرێت، تووشی هەژاری کراوە لە کاتێکدا کە دەوڵەمەند بووە، لەهەمانکاتدا خەمی شوێنکەوتوو و قوتابیەکانێتی کە لە مەقامی تەبەعدا بووە، یەکێك لە تایبەتمەندیەکانی کاك ئەحمەد ئەوەیە کە لە (مەقامی تەبەع)دا بووە و قوتابی هەبووە، قوتابیەکانی چاوەڕانیان لێی بووە وەکو رابەر، وەکو چۆن خومەینی رابەری شیعەکان بووە ئەویش وەکو رابەری ئەهلی سوننە ترساوە لەوەی هەڵەیەکی ببێت و نەك تەنها شوێنکەوتووەکانی بەڵکو جیهانی ئیسلامی بە شوێنیدا تێبکەون، واتە شوێنگەیەکی زۆر هەستیاری هەبووە، هاوسێ لەگەڵ شیعەدا کێشەیەکی مەزهەبی و چینایەتی لەبەرچاوە و کێشەیەکی نەتەوەیشی هەیە وەکو کوردێك، کێشەیەکی مەزهەبی وەکو ئەهلی سوننە لە وڵاتێکی زۆرینە شیعەدا، کێشەی فیکری و نەتەوەیی زۆری هەیە لەگەڵ هاونەتەوەکانی خۆیدا کە فیکرێکی چەپی زۆر توندڕەویان پێیە، تەنانەت ئامادەن خوێنی هاونەتەوەکانی خۆیان برێژن، بەڵکو پێستیان لێبکەنەوە{٧٧}، وەکو ئەوەی بیستراوە، لەناو ئەم هەموو کێشانەدا بتوانێت گرنگی بە بچووکترین نامەش بدات لەناو زینداندا و بە نەخۆشیەوە، کە یەکێك لە جوانترین شتەکانی ئەو نامەکانیەتی، تەنانەت گفتوگۆکانی لەگەڵ غەیبدا لە رێی نامەکانیەوە کە هەم (مامۆستا نوورسی)ش ئەوەی هەبووە و هەم (ناصری سوبحانی)ش وەك ئەو ئەو نامەیەی کە لە کارەساتی هەڵەبجەدا دینووسێت (رسالة من الأرض البلايا الى الأنبياء){٧٨} بە راستی زۆر سەختە تۆ کۆڵێکی قورست بەسەر شانەوە بێت و بە شوێن زەنگیانەیەکدا بگەڕێیت، ناتوانیت بەرگەی ئەوە ناگریت، بەڵام کاك ئەحمەد ئەگەرچی کۆڵێکی گەورەشی بە پشتەوە بووە کەچی وەڵامی شتە بچووکەکانیشی داوەتەوە، هەست دەکەیت رازێك هەیە کارێکی پێغەمبەرانەیە، ناڵێم (موفتیزادە) پێغەمبەر بووە، نا تەنها گرتنەبەری رێگەی پێغەمبەرانە؛ کە لەگەڵ هەموو ئەوانەدا رازێکی زۆر گەورەی هەبووە، کە شیعری عیرفانی گەورە گەورەی هەیە، بەداخەوە کە قەریحەی ئێمە بە جۆرێکە ئەو خواردنە شیرینەمان لا تاڵە، ئەدەبیات و

رۆشنبیری ئێمە ناتوانن دەرکی ئەو جەمالیاتە بکەن، چونکە ئەوە ئەدەبیاتێکە گەورەترە لە جەستەو دونیای بینراو، جەمالیاتێکە وەك باسمانکرد تەنانەت خۆشەویستی هەژارەکانیش دێتە ناو ئەوەوە، کە ئەمە مەسیح ئاساییانەیە. قەریحەی وەك دەوترێت تەبعی ناشەکەرباری ئێمە ناتوانێت دەرکی بکات.

## لە نێوان عیرفان و سیاسەتدا چوونە پێشەوە و گەڕانەوە:

لەگەڵ ئەوەشدا من بۆچوونم وایە کە (موفتیزادە) عاریف نەبووە، چونکە هەمیشە نیوەیەکی لە قەلب و نیوەکەی دیکەی لە زەیندایە. لە بنەڕەتدا عاریف سێبەری نامێنێت سەهۆڵێکە و دەتوێتەوە{٧٩}، ڕاستە ئەو ڕێگا نادات شوێنکەوتووەکانی زۆربەی کاتی خۆیان لەسەر حسابی وێرانی خۆیان بەرنە سەر بەلام نابێت ئەوەمان لەبیر بچێت کە ئەو لەسەر سیاسەت گیراوە و لە زینداندا بووە، تەنانەت ئەوکاتەش بڕیار دەدات ئیدی پەیوەندی بە سیاسەتەوە نەمێنێت ئەوەش خۆی بۆ خۆی مامەڵەیەکی سیاسیانەیە، تەنانەت من زۆر بە پەرۆش بووم گوێ لە کاسێتە تۆمارکراوەکانی دوای هاتنە دەرەوەی لە زیندان بگرم، لێرەشدا دووبارە هەستم دەکرد فیکرەکانی لەوەو پێشی زۆر ئامادەیی هەیە کە خۆی ئاماژە دەکات بەوەی لە فلان شوێندا ئەوە و ئەوەم وتووە کە هەست دەکەیت ئەمە درێژەپێدانی سیستەمێکە کە دایمەزراندووە و بەردەوام گەورە دەبێت، بەڵکو زۆرجار دەگەڕێتەوە سەر کتێبی (دەربارەی کوردستان) کە جەوهەری بابەتە سیاسیەکانی ئەوی تێدایە{٨٠}، واتە لای (نووسی) دەبینێت کە بە ڕاناوی کەسی سێیەمی تاك باسی (سەعیدی کۆن) دەکات، بەلام لای کاك ئەحمەد بەو جۆرە نیە باسی ڕاناوی کەسی یەکەمە{٨١}، وامکردو وام نووسیی، لەگەڵ ئەوەشدا ڕاستە کە ویستوویەتی شەرابی عیشق تێکەڵ بەو خاکە وشکەی زەین بکات بەو خۆڵ و شەرابە ڕێگا ببڕێت، واتە هەم لایەنی زەین و هەم لایەنی قەلب پێکەوە تێکەڵ بکات.

بۆ نموونە یەکێك لەو هەڵوێستانەی دەیەوێت ڕاستی بکاتەوە ئەو جەدەلە دوورو درێژانەی بووە کە لەگەڵ چەپەکان و رۆشنبیرە کوردەکانی دیکەدا هەیبووە، هەروەك پێشتریش باسمکردووە، بە حوکمی زیرەکی و بە حوکمی بوونی رۆشنبیری پێش مۆدێرنانە لای ئەو توانیوێتی بەسەر بەرامبەراکانیدا زاڵ بێت، یەکێك لە خاڵە بەهێزەکانی ئەو کەسانەی لە حوجرە خوێندوویانە ئەوەیە، ئاخر ماسی ئاو نابینێت

هەتا نەیەتە دەرەوەی دەریا، کەسێکیش لە مۆدێرنە تێدەگات کە بزانێت دەرەوەی مودێرنەش چۆن بیردەکاتەوە، واتە من خۆم ئێستا لە حوجرەوە هەندێک رەهەندی نوێم بۆ دەردەکەوێت کە رۆشنبیری دیکە لەناو ئەو ئاوەدا غەرقە و نازانێت ئەو دەریایە بوونی هەیە، وەک ماسیەکان پرسان دەکەن کوا ئاو{٨٢} ؟ ئاو چیە؟ ماسیان تا نەبرێنە دەرەوەی ئاو نازانن ئاو هەیە! لێرەوە کاک ئەحمەد و مامۆستا ناصر بە حوکمی ئەوەی لە دەرەوەی مۆدێرنەوە هاتوون ناتەواویەکانی مۆدێرنە و نەقسەکانی رۆشنبیری مۆدێرنە بەتایبەتی غیکری چەپ و مارکسیان باش ناسیووە کە یەکێک لە دەرەنجامەکانی مۆدێرنەیە، باش ئەو کەلێنانەیان کەشفکردووە و گفتوگۆیەکی زۆر ورد و زانستیان لەگەڵ کردووە، ئەوەندەی ئاگادار بم لەگەڵ هەر کەسێکدا گفتوگۆیان کردبێت ئەگەر نەچووبێتە سەر قسەکەی ئەوان ئەوا لانیکەم بێدەنگ بووە، بەلام (موفتیزادە) ئەمە راستدەکاتەوە دەفەرموێت: (ئەگەر چی ئێمە ئەو گفتوگۆ زۆرانەمان دەکرد و چەندەها کاتژمێر قسەمان دەکرد بەلام هەست دەکەم تەنها جەدەلێکی زەینی رووت بووە، مەبەستمان هیدایەت دانی بەرامبەرەکان نەبووە){٨٣}، لێرەدایە دەیەوێت هەردوو لایەنەکە بەیەکەوە بێت، واتە نایەوێت تەنها قەلبی رووت بێت بەڵکو دەیەوێت زەینیش بوونی بێت (فەلسەفەش ئامادەیی ببێت)، کەسێك بێت لە مۆدێرنەدا بێت و تایبەتمەندیەکانی پێش مۆدێرنەی خۆیشی بپارێزێت وەکو سادەیی و زیرەکی و رۆحانی بوون.

هەروەها خۆی لە توشبوون بە نەخۆشیەکانی مۆدێرنەش بپارێزێت لە زۆرخۆری و مۆدێل و ئیستیهلاك. بەڵکو زۆر بە سادەیی بژی مولکێکی لە دوای خۆیەوە بەجێنەهێڵێت ئەگەر چی لە سەرەتای ژیانیەوە یەکێك لە خێزانە دەوڵەمەند و سیاسیە ناودارەکانی کوردستانی ئێران بووە! کەچی زۆر سادە بمرێت{٨٤}، بەردەوام هەوڵیداوە فەزیلەتەکانی پێش مۆدێرنە لەلای بمێننەوە، کە ئەگەر کەسێك پاڵەوان نەبێت. پاڵەوان بە مانا ئەخلاقی و مەعریفیەکەی ناتوانێت بەو شێوەیە بژی.

## سەرەتا و کۆتایی شیعرە:

دەمەوێت دوایین قسە لەسەر کاك ئەحمەد دەربارەی شیعرەکانی بێت، کە زۆرێك وادەزانن شیعری کاك ئەحمەد وەعزە، لە کاتێکدا وەعز نیە بەڵکو شیعرە، چ شیعرێك قەلبیەکانی چ شیعرە زەینیەکانی و چ ئەو شیعرانەشی کە لەبەرامبەر

شیعری یەکێکی دیکەوە لە دایك بووە، هەموویان شیعرن بە پێوەری هەرکام لە مەکتەبە شیعرییەکان بێت، بەڵام ئەوە هەیە لە شیعرەکانیدا بە حوکمی شێوەزاری کاك ئەحمەد کە نایەوێت جیاوازی بکات لەنێوان زمانی وتن و نووسیندا، بۆیە دەبێت بچیتە ناو جیهانی ئەوەوە ئینجا لە شیعرەکانی تێدەگەیت، هەموویان ئیشاراتی قەلبین، بە خێرایی کاتێك گوزەری کردووە لە حاڵەتێکی ڕۆحیدا ئیشارەیەکی داناوە بۆ ئەوەی بزانێت لەو سەرەوە هاتەوە لە کاتی ئیستراحەتدا بزانێت چی کردووە، واتە شیعری کاك ئەحمەد هی دوای گەڕانەوەیە، هەمووی ئیشاراتە لەبەر ئەوە دەبێت تۆ بنەڕەتی حەرەکەتەکەی ئەو بزانیت ئینجا لە ئیشارەتەکانیش تێدەگەیت، کە بە بۆچوونی من یەکێك لە شاعیرە گەورەکانی کوردە، کە بە پێچەوانەی شاعیرە کلاسیکیەکانی دیکە، راستە شیعری بە فارسی وتووە و هەندێك شیعری عەرەبی وتووە، بەڵام زوربەی شیعرەکانی کوردین{٨٥}، ئەمەش گەورەییە بۆ کەسێك فیکری ئایینی ببێت، ئەو فیکرە ئایینیەی ئەو بۆ نەتەوەی کورد دەشێت بەڕای من، دەتوانین زۆر سوودی لێببینین، بێجگە لەوەی کە ژیانی تاکە کەسی خۆی دەتوانین بڵێین سەرمەشقێکی گەورەیە بۆ سەرکردە و سیاسیەکان کە نەبنە کەسێکی موترەف و زیادەڕەو، ئەو قەناعەتی وایە هەموو ئیترافێك دوای ئیستکبارێك دروست بووە{٨٦}، بێگومان لە ولاتی خۆماندا دەیبینین ئەمە چەند کێشەیەکی گەورەیە کە سەرکردە سیاسیەکانمان هەمووی دەوڵەمەند بوون، هەموو (دەسەلات) و (سامان) و (مەعریفە)یان بۆ خۆیان قۆرخ کردووە، ئەمە لەبەر ئەوەیە کە ئیستکبارێك دروست بووە لێرەدا، دڵیان ناسازە بە زاراوەی کاك ئەحمەد واتە شۆڕشگێرێك نین بەڵکو چەوسێنەرەوەیەکن، لە دڵدا بوونەتە موستەکبیرێك کە خۆیان بە زیاتر لە خەڵکی دیکە دەزانن، تەنانەت بیستوومە هەژارێك چووتە لای بەرپرسیارێك پێی وتووە من خۆم و بنەماڵەکەم دەنگمان بە ئێوە داوە ئەو لە بەرامبەرەوە جنێوێکی هێندە ناشیرینی پێداوە ناکرێت بیڵێمەوە لێرەدا پێشی وتووە دەنگەکەتان بۆ خۆتان، کەواتە گرفتەکە تەنها ئەوە نیە کە لە رووی مادیەوە گۆڕاوە بەڵکو پێشتر ئیستکبارێك دروست بووە، کە دەبێت جارێکی دیکە دڵەکان سازبکرێنەوە، سادەیی بگەڕێنینەوە بۆ ژیان هەتا لە دەرەوەش خۆمان بە جیا لە خەڵکی تر نەبینین، واتە ئەوەی کە من لە شوێنی دیکەش باسم کردووە کە عەدالەت بریتیە لە عەدالەتی ئەخلاقی و بە حەکەم کردنی ویژدان، ئەوەی کە ڕەچاوی ڕێسا

ئەخلاقیە باوەکان بکرێت ئەمەیە عەدالەت، کاك ئەحمەدیش باوەڕی وایە بەبۆچوونی من کە عەدالەت لای ئەو جارێ پێش هەموو شتێك سازکردنەوەی خودە، گرفتەکە لەناو خۆتدایە، مانای ئەوەی کە ئیستکبار دروست نەبێت واتە تا لە نۆرمی ئەخلاقی لانەدەیت، کە ئەوە دیوێکی مەعنەویشی هەیە کە لە دڵی مرۆڤدایە، لێرەوە سیستەمە ئابووری و سیاسیەکەش وێران نابێت، بۆ ئەوەی لە هەریەکە لە سیستەمە ئابووری و سیاسی و مەعریفیەکەدا عەدالەت دروست ببێت، دەبێت بچینەوە سەر ڕێسا ئەخلاقیەکان، واتە لە پێشدا ئیستکبار نەهێڵین ئیدی ئیترافیش نامێنێت، لەمەوە هەمیشە شیعرەکانی کاك ئەحمەد دیوێکی نەبینراویان هەیە، کە ڕەنگە لە ڕووکەشدا باسی ئیتراف و شتێکی مادی بکات بەڵام دیوێکی نەبینراوی لەگەڵدایە، بۆ نموونە کاتێك مەولودنامەکەی دەخوێنێتەوە، کە بە بۆچوونی من کوردیەکی زۆر ڕەسەنی جوانی تێدایە، هەست دەکەیت فیکرێکی فەلسەفی زۆر قووڵیشی تێدایە و هەرسێ چەمکەکەی خۆیشی زۆرباش تەوزیف کردووە، کە نەهێشتنی جیاوازی چینایەتی و مەزهەبی و نەتەوەییە، باسی سیرەی پێغەمبەری خوداش دەکات، هەروەها فیکرێکی بان زەمانیشی داوە دەربارەی وەحی بەوەی ئەگەر ئایین نەما چۆن واقیع دەگۆڕێت و کۆمەڵێك مەقامە ئایینی و دونیایەکان بەکاردەهێنن بۆ خۆدەوڵەمەند کردنیان و کۆمەڵێك کۆمەڵێکی دیکە دەچەوسێننەوە لەوێدا هەموو ئەوانەی تەوزیف کردووە، کە دەشێت بڵێم ئەو مەولودنامەیە یەکێك لە شاکارەکانی سەدەی بیستی کوردە، بەداخەوە نازانم بۆ تەواو نەکراوە، زۆرجار ئێمە پێوەرمان بۆ چاکی و خراپی ئەدەبیات بریتیە لە گەورە و بچووکی دیوان و کتێبەکان، کەزۆرجار نووسەر هەوڵدەدات کتێبی گەورە بنووسێت بۆ ئەوەی بە گرنگ دابنرێت، لە کاتێکدا لای فارسەکان بە پێچەوانەوەیە، بۆ نموونە کتێبی (یك بی نهایت جلوش سفرها) ئەوەی کە (هەژار) کردوویەتی بە کوردی کتێبێکە هەمووی دە پانزە پەڕەیە و یەکێك لە شاکارەکانی (د.عەلی شەریعەتی)یە {٨٩}، ئەو مەلودنامەیەش شاکارێکی (ئەحمەدی موفتی زادە)یە کە بەراستی ڕۆحێکی نەتەوایەتی کوردیانەی تێدایە، بە ڕۆحێکی ئایینیانە و فیکرێکی ڕۆشنبیریش نووسراوە و لە هەمانکاتدا فیکرێکی فەلسەفی و ڕۆحێکی عیرفانیشی تێدایە، لەوێدایە هەستی جوانبینی کاك ئەحمەدت بۆ دەردەکەوێت کە چەند جوانناس بووە، چەند شتە نەبینراوەکان لای خەڵکی دی دەدۆزێتەوە، ئەدیب کێیە؟ ئەوەی کە خەڵکی دی نایبینێت ئەم

دەیدۆزێتەوە، ئەو پەیوەندیانەی خەڵکی تر کەشفیان ناکات ئەو کەشفیان دەکات، سەدان جار سیرەمان خوێندۆتەوە و ئەوەی ئەو وتوویەتی نەمان بینیووە، دەتوانم بڵێم بەهرەیەکی خوداییە کە کاک ئەحمەد توانیویەتی وەك ئەدیب، ئەدیب بێت، وەك فەیلەسوف، فەیلەسوف بێت و وەك عاریفێکیش چرکەساتی عیرفانی ببێت، (حافیز) گوتەنی ئەو (رەندێك) بوو، بەڵام بە بۆچوونی من (رێبوار بوون) بۆ ئەو گونجاوترە، چونکە ئەو لە حاڵەتی گوزەری کۆمەڵگە و نەتەوەکەیدا ژیاوە و ئەو جیاوازیە چینایەتی و مەزهەبیەی لە سەردەمی ئەودا هەبووە و ئەو مەعریفەیەی لەوکاتەدا باوبووە، ئەمانەش پیشانمان دەدەن کە کاک ئەحمەد باش مەعریفەی سەردەمی خۆی هەرس کردووە و توانیویەتی زیادەشی بخاتە سەر، بێگومان ئەوەمان وتووە کە مەعریفە شوناسێکی بە کۆمەڵی هەیە کە زۆر لەو بۆچوونانە لە پێش ئەودا بوونیان هەبووە بەڵام کاک ئەحمەد توانیویەتی کۆیان بکاتەوە لە سیستەمێکدا و ئیزافەی خۆیشی بۆ بکات و لە ژیانی کەسی خۆیشیدا بەو جۆرە بژی، کەسێك بووە زۆر بلیمەت و زیرەك بووە، تەنانەت لە دروشمەکانی سەردەمی ئینقیلابدا کاك ئەحمەد و خومەینی بەیەکەوە باسکراون{٩٠}، فیکرێکی هەبووە کە زۆر رەخنەگرانە مامەڵەی لەگەڵ شتەکاندا کردووە، بەڵام زۆر بە خۆشەویستیەوە و دوور لە غەیبەت و لەوەی کە خەڵکی بە کەم سەیر بکات، تەنانەت لە شوێنێکدا باسی ئەوە دەکات کە منداڵێك داوای پاسێکی دووقاتی راستەقینەی کردووە نەك هی منداڵانە، لەوێشدا هەست دەکەیت زۆر بەرێزەوە سەیری هەڵوێستی ئەو منداڵەی کردووە، وەکو شتێك کە لە سەروی هەست و تێگەیشتنی ئەو منداڵەوەیە{٩١}، بە کورتی زۆر رێزی لە بەرامبەرەکانی گرتووە، بەڵکو زۆر رێزی لە سروشتیش گرتووە کە بە روونی لە شیعرەکانیدا دەردەکەوێت، ئەمە بێجگە لەوەی کە زۆر خۆشەویستی پێغەمبەری خودای لە دڵدا بووە کە من بۆ خۆم لە ئەوەوە فێر بووم کاتێك ناوی پێغەمبەری خودا برا چۆن مامەڵەی رۆحی بکەم، ئەو دەفەرموێت (رۆحم بە قوربانی بێت){٩٢} ئەمە چرکەساتێکی رۆحی گەورەیە ئەگەر کەسێکی ئەهلی فەلسەفە و مەعریفە نەبوایە چۆن دەیتوانی ئەو هەمووە پێکەوە کۆبکاتەوە، من کاتێك مامەڵەی فەلسەفی دەکەم ناتوانم رۆحی بم کە رۆحی دەبم ناتوانم فەلسەفی بم ئەوکاتەی مەعریفیم ناتوانم قەلبی بم، ئەوکاتەش شاعیر دەبم ئیدی مەعریفەم باردەکات بە راستی گەورەییە بۆ ئەو کە توانیویەتی ئەو یەکگرتنە بەهێز و قووڵە لە نێوان زەین

و قەلبدا دروست بکات تەنانەت رۆحی هێندە گەورە بووە کاتێك لە زینداندا بووە پێیان وتووە گوایە (سوبحانی) قوتابیەکانت دووچاری ئینحراف دەکات، ئەویش لە وەلامدا فەرموویەتی باشە بۆ کوێیان دەبات؟ هەر بۆ ئایین نیە؟ کە دەگمەنە کەسێك هەبێت بتوانێت ئەو رۆحە گەورەیە و ئەو هەموو مەعریفەیە لە خۆیدا کۆبکاتەوە لە هەمان کاتدا رازی خۆیشی ببێت لەگەلّ خودای خۆیدا، رازی هەبێت لەگەلّ نزیکەکانی خۆیدا، رازیشی ببێت بۆ مێژووی ئیسلامی و رازی ببێت بۆ عیرفان کە ئەگەر نەگەڕێیتەوە بۆ خودی عیرفان تێناگەیت، واتە ئەگەر بمەوێت کەسێك بناسم رەنگە بە خوێندنەوەی بەرهەمەکانی لێی تێبگەم، بەلام هەندێك شت هەیە لای کاك ئەحمەد دەبێت بگەڕێیتەوە بۆ فەرهەنگی رۆحانیەت لای پێشینان ئینجا لێی تێدەگەیت، ئەمە ئەو خالّەیە کە زۆرێك لەوانەی مامەلّە لەگەلّ کاك ئەحمەددا دەکەن. کەشفی ناکەن واتە زۆر شت هەیە لای کاك ئەحمەد کە لە رووکەشدا چارەنەکراوە بەلام کە دەگەڕێیتەوە بۆ ریشەکەی لە فەرهەنگی پێشینیدا دەرکی ئەوە دەکەیت کە مەبەستی لەچی بووە{٩٣}، ئەمەش نیشانەی ئەوەیە کە کاك ئەحمەد زۆر باش ئاگاداری مێژووی ئیسلامی بووە و داهێنانەکانی شارستانێتی ئیسلامی باش ناسیوە کە بەڕای من ئەمە زۆرتر دەگەڕێتەوە بۆ ئەوکاتەی کە مامۆستای زانکۆ بووە و خەریکی خوێندنەوەی دەرەوە ئایینی بووە، هەرچەندە ئێمە بیستوومانە کە موسلّمانەکان چیان داهێناوە لە پزیشکی و فەلسەفەو ئەندازە و جوگرافیا، بەلام وەك پسپۆڕێك نموونەی واقیعی بۆ بهێنینەوە ئەو ئاگایی و رۆشنبیرییەی کاك ئەحمەدمان نەبووە و هەتا ئێستاش نیمانە، لەگەلّ ئەوەشدا موفتیزادە زۆر سوودی لە رۆشنبیرەکانی ئێران بینیوەو شتی ئەوانی خوێندۆتەوە، وەك ئاماژەمان پێدا زۆر سوودی لە رۆشنبیرە ئایینیەکانی وەکو ( شەریعەتی و تالّەقانی) بینیووە، هەروەها زۆر سوودی لە دروشمی عاریفە کۆنەکان بینیوە، بەلّکو عاریفناسێکی گەورە بووە، دەتوانین بلّێین زۆربەی رۆشنبیرەکانی ئێران بەو جۆرەن، بەلام جارێکی دیکە تەوزیفکردنەوی ئەو بابەتانە لای (موفتیزادە) زۆر کەم وێنە بووە، لێرەوە دەتوانین بلّێین کاك ئەحمەد مەکتەبێکی گەورە بوو کە دەکرێت زیاتری لەسەر بووترێت بەلام لێرەدا هەر ئەوەندە بوار هەیە، دواجار هەروەك وتم کاك ئەحمەد دوایین فەیلەسوفی شارستانیەتی ئیسلامیە کە توانیویەتی کەموکوڕیەکانی فەلسەفەی نوێ بە فیکری میتافیزیکی کۆن پێشان بدات{٩٤}.

## پەراوێزەکان:

١-کاسێتی موفتیزادە لە هۆڵی حوسەینیەی ئیرشادی ئیسلامی لە تاران، دوای نوسینەوەی یاسای بنەڕەتی کۆماری ئیسلامی ئێران (دەستوری ئێران) لەوێدا بوێری ئەو پیاوە دەردەکەوێت.

٢- لە نامەیەکی تایبەتدا کە هاوڕێی (موفتیزادە) بورهانی ئەمینی بۆی ناردووم بە وردی ژیاننامەی موفتیزادەی تێدا نووسیوە بۆم، دەست نووس.

٣- موفتیزادە، هونەر و زەوقی جەمال دۆستی، کاسێت، چاوپێکەوتنی دوای ئازادبوونی لە زیندان لەسەر شیعرەکانی، (C.D).

٤- ئازاد مودەڕیس، حیکمەتی باڵا و پەیوەندی نێوان سەرچاوە رەسمی و مادیەکانی یاسا، گۆڤاری هەژان، ژمارە (١٣) ل٥٠.

٥- ئەحمەدی موفتیزادە، دەربارەی کردستان، انتشارات نور، ١٣٥٩، ل(٢٤-٣٩-٤٠).

٦- لهۆن قادر، جەدەلیەتی دیالێکتی ئیسلامی لە دیدی ئەحمەدی موفتیزادەوە، گۆڤاری هەژان ژمارە (٦) ل١٣٣.

٧- ئەحمەدی موفتیزادە، دیالکتیك اسلامی، انتشارات اوج.

٨- سەرچاوەی پەراوێزی ژمارە (٦).

٩- هەمان سەرچاوە.

١٠- سەرچاوەی پەراوێزی ژمارە (٢) و، (٥) ل٢٠.

١١- سەرچاوەی پەراوێزی ژمارە (٢).

١٢- یەکێك لە هاوڕێکانی موفتیزادە لە چاوپێکەوتنێکدا بۆی گێڕامەوە.

١٣- کاك ئەحمەدی موفتیزادە، (وصیتنامە) و گیانی (وەسیەتنامە) ل٤.

١٤- سێ لیزمەکەی کاك ئەحمەد، (نەمانی چەوساندنەوەی؛ نەتەوەیی، مەزهەبی، چینایەتی) لە سێ لیزمەکەی شەریعەتی (ئیستعمار، استسمار، ئیستحمار)ەوە زۆر نزیکە، ئەمە بێجگە لەوەی موفتیزادە ناوی شەریعەتی دەهێنێت.

١٥- سەرچاوەی پەراوێزی ژمارە(٥)

١٦- سەرچاوەی پەراوێزی ژمارە (٥) ل (١٢٠-١٤٠).

١٧- چاوپێکەوتن لەگەڵ مامۆستا موفتیزادەدا سەبارەت بە شیعرەکانی (C.D).

١٨- برادر احمد مفتیزادە، فلسفە حجاب در اسلام، انتشارات نور، ١٣٥٩.

١٩- موفتیزادە وەلی دێوانە بە یەکێك لە (عاریفی گەل) ناودەبات.

٢٠- محمد عابد الجابری، الدولة والدین وتطبیق الشریعة، مرکز حداسات الوحدة العربیة، بدون تأریخ.
٢١- سەرچاوەی پەراوێزی ژمارە (٥) ل(٣٢-٣٩-٤٠).
٢٢- سەرچاوەی پەراوێزی ژمارە (٥) ل٤١.
٢٣- علامە احمد مفتیزادە، وحدت اسلامی، انتشارات میعاد، بهار ١٣٥٨.
٢٤- هەمان سەرچاوە و (لەم ژمارەیەی هەژاند! وەگێڕاوە و بڵاوکراوەتەوە).
٢٥- سەرچاوەی پەراوێزی ژمارە (٥) ل(١٢١-١٤٠).
٢٦- سەرچاوەی پەراوێزی ژمارە (٥) پێشەکی دەزگای بڵاوکەرەوە بێ ژمارەی لاپەڕە.
٢٧- سەرچاوەی پەراوێزی ژمارە (٢).
٢٨- سەرچاوەی پەراوێزی ژمارە (٥) ل٢٢٩.
٢٩- سەرچاوەی پەراوێزی ژمارە (٥) ل٢٦.
٣٠- ئەو چاوپێکەوتنە لە (T.V) رەسمی دەوڵەتی ئێرانەوە بڵاوکراوەتەوە تا ئاستی سنە پتر خەڵکی باسیان لێوەکردووە و دەیکەن.
٣١- مامۆستا عومەر عەبدولعەزیز، ژیاننامەی شەهید ناصری سوبحانی، دەستنووس.
٣٢- مام هەژار لە (چێشتی مجێور)ەکەیدا هەوڵەکانی کاک ئەحمەد بۆ کورد زۆر جوان دەنرخێنێت، بریا هەموو نووسەر و رۆشنبیرانی کورد بەو شێوەیە بە ویژدانەوە کاری یەکتریان دەنرخاند و لێك بوردە دەبوون بەرامبەر بە یەکدی.
٣٣- کاك ئەحمەدی موفتیزادە، مجموعەایی از نامەهای کاك احمد مفتیزادە (٢) ص(٣-٤-٥).
٣٤- عبدالکریم سروش، رازدانی و روشنفکری و دینداری، مؤسسەی فرهنگی صراط، چاپ پنجم، ١٢٧٩، ص٧٩.
٣٥- ئەحمەدی موفتیزادە، کاسێتی وتاری نگڵ.
٣٦- فرانسیس فؤکۆیاما، التصدیع العظیم، ت: عزة حسین کبة، بین الحکمة، بغداد.
٣٧- علامە احمد مفتیزادە، فلسفە محراب ومطلبی دربارەی شوری، انتشارات تابستان ١٣٥٩ ص١٦
٣٨- احمد موفتیزادە، کاسێت و (C.D)یەکانی بڵاوکراوە لە دوای ئازادبوونی لە زیندان ئەو هەناسەیان تێدایە کە هەرچی ناسك بوونەوە و دووری گرتن لە زەم و غەیبەت.
٣٩- سەرچاوەی پەراوێزی ژمارە (٥) ل(٩٩-١٠٠).
٤٠- لە پاش ئینقیلابی ئیسلامی ئێران خەڵکی شاری سنە ئۆتۆمبێلی کاك ئەحمەدیان هەڵبڕی لە کاتی گەڕانەوەیدا بۆ ئەو شارە.

٤١- سەرچاوەی پەراوێزی ژمارە (٥).
٤٢- لە گوتەیەکیدا بە ئەو قوتابیانەی کە سەرپەرشتی کاروباریان پێسردراوە دەڵێت.
٤٣- کاک احمد مفتیزادە، مجموعە ای ازنامەها، نامەی حەوتەم ل٧٤ بەدواوە.
٤٤- بدیع الزمان سعید النورسی، سیرە ژاتیە، اعداد و ترجمە: احسان قاسم الصالحی، نشر: دار سوزلر للنشر استانبول، الگبعە الاولی، ١٩٨٨ص٤٩٩.
٤٥- قورئانی پیرۆز، سورەتی (الشعراو) ئایەتی (١٧).
٤٦- ئەحمەدی موفتیزادە، کاسێتی تایبەت دەربارەی نەورۆز.
٤٧- ئەحمەدی موفتیزادە، راڤەی زاراوەی شیعرەکانی (بۆ نموونە) هەروەها شیعرەکان و نامەکانی کە بە کوردی نووسیویەتی.
٤٨- عەبدورەحمان شەرەفکەندی (هەژار)، چێشتی مجێور، ئامادەکردن و سەرپەرشتی چاپ: خانی شەرەفمەندی، چاپی یەکەم، پاریس ١٩٩٧.
٤٩- سەرچاوەی پەراوێزی ژمارە (٤٣) ل٣٢.
٥٠- علم الاجتماع بین الرمز والاشارە، اینو دوزی، ت: د.قیس النوری، الگبعە الاول١٩٨٨، ل٢٢٨.
٥١-- سەرچاوەی پەراوێزی ژمارە (٢٣).
٥٢- سەرچاوەی پەراوێزی ژمارە (٣٣) ل ٩١.
٥٣- سەرچاوەی پەراوێزی ژمارە(٤٣) ل ٤٦.
٥٤- سەرچاوەی پەراوێزی ژمارە (٥) ل ١٠٨ بەدواوە.
٥٥- هەمان سەرچاوە.
٥٦- سەرچاوەی پەراوێزی ژمارە (١٣) ل ٥.
٥٧- هەمان سەرچاوە.
٥٨- قورئانی پیرۆز، سورەتی البقرە، ئایەتی (٢).
٥٩- سەرچاوەی پەراوێزی ژمارە (٤٣) ل ٨١.
٦٠- قورئانی پیرۆز، سورەتی (البقرة) ئایەتی (١٥١).
٦١- سەرچاوەی پەراوێزی ژمارە (٤٣) ل ١٣.
٦٢- سەرچاوەی پەراوێزی ژمارە (١٣) ل٢.
٦٣- ئەحمەدی موفتیزادە. ناميلكەی تەزكيە و تەعليم، ت، ئا: كامەران، ب، زانكۆ، ١٩٩٨.
٦٤- ناصری سوبحانی، زنجیرە کاسێتەکانی (اسماء الله).

٦٥- دیوانی شیعرەکانی موفتیزادە، بۆ نموونە ل (٩، ١٨، ٣٠) هەروەها بڕوانە شیعری کوردستانی جوانم.

٦٦- سەرچاوەی پەراوێزی ژمارە (٤٣) ل٤٦.

٦٧- سەرچاوەی پەراوێزی ژمارە (١).

٦٨- دوو کاسێتی (اسراو ومعراج)، ئەحمەدی موفتی زادە.

٦٩- سەرچاوەی پەراوێزی ژمارە (٦٥).

٧٠- سەرچاوەی پەراوێزی ژمارە (١٢) ل ٥٦، لە چەندین کاسێت و چاوپێکەوتندا ئاماژەی بەم بابەتە کردووە.

٧١- سەرچاوەی پەراوێزی ژمارە (٤٣).

٧٢- هەمان سەرچاوە.

٧٣- سەرچاوەی پەراوێزی ژمارە (٦٨).

٧٤- سەرچاوەی پەراوێزی ژمارە (٤٣) ل (٥٠-٥٢).

٧٥- هەمان سەرچاوە و لاپەڕە.

٧٦- ئاماژەیە بۆ دوو بەیتی:

لە جەرگەی یارانی گیانی — تۆم نەبێ هێشتا خۆمم پێ تەنیایە
تۆم هەبێ تەنیا لە انفرادی — لێم جەمە هەرچی خۆش دونیایە

سەرچاوەی پەراوێزی ژمارە (٦٥) ل١٠.

٧٧- سەرچاوەی پەراوێزی ژمارە (٥).

٧٨- هەروەها لەم ژمارەی هەژاندا بلاۆکراوەتەوە.

٧٩- عبدالکریم سروش، حکمت ومعیشت، دفتر نخست، مؤسسەی فرهنگی صراط، چاپ اول، ل٨٥.

٨٠- سەرچاوەی پەراوێزی ژمارە (٥).

٨١- سەرچاوەی پەراوێزی ژمارە (١٣).

٨٢- سەرچاوەی پەراوێزی ژمارە (٧٩) ل٥٩.

٨٣- سەرچاوەی پەراوێزی ژمارە (١٣).

٨٤- سەرچاوەی پەراوێزی ژمارە (٢).

٨٥- سەرچاوەی پەراوێزی ژمارە (٤٧).

٨٦- سەرچاوەی پەراوێزی ژمارە (٥) هەروەها لە چەندین شوێنی دیکەش ئاماژەی پێکردووە.

٨٧- هەمان سەرچاوەی پێشوو، هەروەها - سەرچاوەی پەراوێزی ژمارە (١٣) ل١٥، - سەرچاوەی پەراوێزی ژمارە (٤٣)، ل٢٣ز

٨٨- کاك ئەحمەدی موفتیزادە، مەولودنامە، ئامادەکردنی عوسمان سەنگاوی، پرۆژەی بەرنامەی گوڵستان -٣-، چاپی یەکەم ٢٠٠٥.

٨٩- مام هەژار ئەو کتێبەی وەرگێراوە بەناوی (یەك لە پەنای خاڵ و سفری بێ برانەوە، بڵاوکردنەوەی: نووسینگەی تەفسیر، هەولێر ٢٠٠٤.

٩٠- بۆ نموونە ئەو دروشمە لەسەردەمی شۆڕشەوە دەگێڕدرێتەوە کە دەیانووت: شیعە و سوننە فەرقیان نیە، رابەرمان کاك ئەحمەد و خومەینیە.

٩١- ئەو کەسەی گوێ لە کاك ئەحمەدی موفتیزادە بێت، زۆر گوێی لەو زاراوەیە دەبێت کە لە هەناسەیەکی قووڵەوە دێتە دەرەوە، بۆ نموونە زنجیرە کاسێتەکانی دین و ئینسان، ئیسرا و میعراج ...هتد.

٩٢- سەرچاوەی پەراوێزی ژمارە (١٣).

٩٣- بۆ نموونە چاوپێکەوتن و کاسێت و (C.D)یەکانی دوای بەربوونی و نامەکانی زیندان و وەسیەتنامە، سەرچاوەی پەراوێزی ژمارە (١٣)، سەرچاوەی پەراوێزی ژمارە (٤٣).

٩٤- سەرچاوەی پەراوێزی ژمارە (٦١).

تەحسین حەمە غەریب

# نوورسی لە سەردەمی مەولانا و مەولاناش لە سەردەمی نوورسیدا لە مەسنەوی مەعنەویەوی مەولاناوە بۆ مەسنەوی نوورسی رانان و بەراوردی هەردوو مەسنەوی مەولانای رۆمی و سەعیدی نوورسی.

پێشەکی:

ئەگەر بەشێك مەلەفی ئەم ژمارەیەی هەژان بۆ عاریفی گەورە (سەعیدی نوورسی) تەرخان کرابێت ئیدی ناشێت بەسەر چڕترین و قووڵترین کتێبی ئەو واتە کتێبی (المثنوی العربی النوری) تێپەڕ بکەین، ئەو کتێبەی بەشێکی لەسەرە وەختی ئەو وەرگەڕانە رۆحیەی کە بەسەر ئەو پیاوەدا هات و لە سەعیدی کۆنەوە کردی بە سەعیدی نوێ نوسراوە، ئەو کتێبەی کە تێیدا شێواز و ستایلی تایبەت بەخۆی لە نووسیندا دۆزیوەتەوە، کە ئەو هەمیشە نووسین وەك تابلۆیەك دەشوبهێنێت کە کەسی هونەرمەند (نووسەر) هەم جوانیەکانی خۆی دەبینێت و هەم جوانی و لێهاتنەکانی بەوانی دیکەش دەناسێنێت، ئەمەش کورتەی حیکمەتی بوونە کە پەروەردگار هەم جوانی داهێنان و خەلقی خۆی بە مەخلوقات لە سەرووی هەمووشیانەوە بە مرۆڤ پیشانداوە، بە خوێندنەوەی کتێبی مەسنەوی هەم وردەکاریە ئەزموونیەکانی نوورسی دەزانرێت و هەمیش شێوازی ئەو دەناسرێت کە سەبارەت ستایلی ئەو بۆ خۆی دەڵێت: بەرزەخێکە لەنێوان قەلب و عەقڵدا، وەك ئەو شێوازەی کە لای ئیمامی رەبانی و ئیمامی غەزالی و مەولانا جەلالەدینی رۆمی بوونی هەیە {١}، واتە شێوازی کارکردنی ئەو تەنها گرتنەبەری رێگەی فەلسەفە و عەقڵ نیە وەك ئەوەی سەعیدی کۆن دەیکرد، هەروەها تەنها رێگەی (دڵ)یشی نەگرتووە وەك سالیکانی رێگەی تەریقەت وایاندەکرد مەسنەوی ئەو کۆمەڵە حەقیقەتەیە کە لە بنەڕەتدا نووری موعجیزەی قورئانن و نەفسی سەرکەش و بەڵگەویستی فەلسەفی

مەشرەبی نوورسی کۆنیان رامکردووە، هەربۆیە زۆربەی بەشەکانی ئەو کتێبە کە بە (رسالة) ناسراون بە بزانە (اعلمی) دەستپێدەکەن و ئەو وشەیە لەو کتێبەدا زۆر دووبارە بۆتەوە، مەبەستی پێی نەفسی خۆیەتی و رەنگە لەبەر ئەوەش بێت ئەو کتێبەی نووسیوە نا مرۆڤەکانی دیکەش (کە ئەگەر نەفسیان زۆر سەرکەشیش بێت لە نەفسی ئەو سەرکەشترنیە) سوود لەو حەقیقەت و ئەزموونانە بیبینن کە لەو کتێبەدا هەن هەربۆیە بۆ خۆی لەو کتێبەدا نووسیویەتی (تۆ هەرکەس هەیت ببە، نە نەفس سەرکەش و بەفیزترە لە نەفسی من و، نەشەیتانیشت لە شەیتانەکەی من سەرلێشێواو بەدبەخت ترە){٢}.

کورتکاری کردن لە کتێبی مەسنەویدا لەوپەڕیدایە، تا رادەی ئەوەی نوورسی لەو کتێبەدا شەربەتێکی خەستی گرتۆتەوە حافیز گوتەنی تەنها دلۆپێکی بایی ئەوەیە نەک هەر مرۆڤ سەرخۆش بکات، بەڵکو کەم لە مرۆڤەکان بەرگەی بگرن بە نۆشینی نەمرن و رۆحیان عروج نەکات و بۆ لای پەروەردگار بەرزنەبووبێتەوە، هەر بۆیە نوورسی داوا لە خوێنەری دەکات دەڵێت: وا مەزانە دووبارەبوونەوەی ئەو (بزانە، بزانە)انە لە پاڵیەکتردا زیادەن و هەندێکیان جێگەی هەندێکی دیکەیان دەگرنەوە،نەخێر تەنانەت هەرکامیان بابەتی کتێبێکی سەربەخۆ و تەنانەت (مەقام)ێکی سەربەخۆ و بەڵکو دۆزەرەوەی گەوهەرێکن کە لە شوێنێکی دیکە دەستناکەوین، ئیدی هەر (بزانە)یەك بنەمای کتێبێکە، چەند (بزانە) هەن لەو کتێبەدا هێندەش جیاواز ئەو دووبارەبوونەوانەش، تەنها ئاماژەن، (مەسنەوی مەعنەوی) شاعیرانەترین کتێبی سەعید نوورسیە، رەنگە لەبەر ئەوە بێت کە سەرەتای ئەزموونی رۆحی بێت و بە جۆرێك ئەو ئەزموونانە لە سەرەتای گەرموگوڕی و ئەوپەڕی داگیرسانیایەتی، کەمتر ئاداب و رێساکان (تەنانەت رێساکانی بەیان) توانیویانە رامی بکەن، بۆیە زۆر کورتکاری و بە زاراوەی مامۆستا نوورسی تەنانەت ناڕوونیشی تێدایە.

نوورسی دەڵێت: وامەزانە من بە ویستی خۆم عیبارەتەکانم لێ ئاڵۆز کردوویت، چونکە ئەم کتێبە چەند پەیڤێکی کتوپڕ بوون لە کاتێکی سەمەرەدا، وشەکان لەدایك بوون لە ئانی گفتوگۆیەکی مەزندا، وەك زریانێك کە تێیدا رووناکی لەتەك ئاگردا لە ململانێدا بێت، سەرم لە یەك دەمدا لە دوندەوە بۆ بن سوڕی دەخوارد و لە خاکەوە بۆ ئاسمان هەڵدەبەزیەوە، ئیدی من رێگەیەکی نەشکاوم گرتبوویە بەر

ڕێگەیەکی نەدیتراو لەنێوان عەقل و دڵدا، عەقڵم لەنێوان مەدهۆشی کەوتنە خوارەوە و سەرکەوتندا خولی دەخوارد، بەم سلوکەمدا هەر ڕۆشناییەکم دیتبێت ئاماژەیەکم لەسەر داناوە هەتا بیناسمەوە. زۆرجار ڕێککەوتووە تەنها وشەیەکم لەبەرامبەر شتێك داناوە بۆ ئاگادارکردنەوە و وەبیرهێنانەوە نەك بۆ مانا بەخشین، ئاخر زۆرجار تەنها وشەیەکم لەسەر نووریکی گەورە داناوە {٣}

هەروەك لە پێشەکی یەکێك لە بەشەکاندا دەنووسێت کە دەشێت بلێین کورتەی ئەزموونەکانی ئەوە:

ئەی ئەو کەسەی تەماشا دەکەیت، من دەبیستم لە خەڵکیەوە گلەیی ناروونی لە نووسینەکانم دەکرێت، بۆیە من هەشت گوتەم بۆ تۆ هەیە گوێ بیستیان بە:

یەکەم: پەلە مەکە لەسەرزەنشت کردنم لە پێناو ناروونیەکاندا، چونکە گوێگرم تێیاندا نەفسی بەدفەرم بووە، چونکە ئەو خێرا لە وەڵامی پرسیارە خەڵەتێنەرەکانی خۆی تێدەگات ئەگەر بە ئاماژەش بێت.

دووەم: هەموو بابەتێك بە (بزانە) دەستی پێکردبێت ئەوە چەکێکی بڕەڕو دەرمانێکی سوود بەخشە، دەرخواردم دراوە بێ ئەوەی حسێبی بۆ بکەم، لە کاتی زۆر پێویست بوونمدا.. لە ئانی زۆری برینەکانمدا، ئیدی لە کتێبەکەمدا خاوەنی هیچ نیم تەنها ئازار و برین و دەردی بێ دەرمانی شاراوەی دەروون نەبێت، بۆیە ئەوەی کە هاتووە تێیدا لە دەواو چەك و چەشتنی حەقیقەت ئەوە لە منەوە نیە و هەڵگۆزراوی هزر نیە و بەڵکو بەهرەمەندیەکە لە قورئانەوەیە.

سێیەم: گوێم لە ڕەخنەگرتنەکانی خەڵکی نیە، چونکە سوپاس بۆ خودا لە نەفسی خۆمدا بێجگە لە دەستەوسانی و کەمتەرخەمی و چشتێك کە شایستەی لۆمە کردن بێت شك نابەم، ئیدی ئەگەر بمەوێت شانازی بکەم و خۆم هەڵکێشم تەنها شەرمەزاری و ئابروو چوون نەبێت چی دیم نین کە لە بنەڕەتدا هەموو ئەوانەش خراپەن، ئیدی گوێ نادەمە دەروونی لێڵ بووی غەیری خۆم بە خۆپەرستی، هەتا خۆم بە رووپامایی کردن بۆی هەڵبکێشم، بەڵام هێندە هەیە ئاڵۆز کردن و شێواندنی حەقیقەت شیاو نیە، بەڵام هەیهات منێکی دەسەوسان و عەرەبی نەزانێك (مەبەستی لەکوردبوونی خۆیەتی) زۆر لەوە ناتواناترم بتوانم بەکاری لەو شێوەیە هەڵسم بەو شێوازە شێواوانەی خۆمەوە، ئیدی دانی پێدا دەنێم و بەوپەڕی هێزی خۆمەوە بانگەواز دەکەم کە من دەسەوسانم و بێ دەسەڵاتم لە گەیاندن و تێگەیاندندا، بەڵام

دەڵێم بەهۆی باسکردنی نیعمەتی پەروەردگار و گێڕانەوەی ئەو سپاردەیەی پێم بەخشراوە، ئەوە دەڵێم کە وتبێتم متمانەم پێیەتی و ئەزموونم کردووە و پێی گەیشتووم و عیلمم پێی هەیە عیلمی یەقین.

چوارەم: وامەزانە ئەوەی دەینووسم بابەتێکە هەلگۆزراوی بیر و عەقڵە، نەخێر بەڵکو بارشتێکە داباریوە بەسەر ڕۆحێکی بریندار و دڵێکی زامداردا، کە لە قورئانەوە سەرچاوەی گرتووە، واش مەزانە کە بابەتێکی گوزەرا و کاتی و دڵ دەیچەژێت و تەواو دەبێت، نەخێر بەڵکو نورانێکی درەوشاوەو جێگیرن، کە لەسەر عەقڵێکی کول و دڵێکی نەخۆش و دەروونێکی تاریك درەوشاونەتەوە.

پێنجەم: من نازانم چۆن عەقڵم لەگەڵ دڵم تێکەڵ بووە و بەمەش لەسەر ڕێگەی ئەهلی عەقڵ لە زانا پێشینەکان و لە ڕێگەی ئەهلی دڵیش لە پێشینان لامداوە، ئیدی ئەگەر لەتەك ئەوان وێك هاتمەوە ئەوە زۆرباشە و ئەگەر لاشمداوەو هیچ لەو دوو ڕێیەشم نەگرتووە ئیدی ئەوە تاوانی خۆمە.

شەشەم: لە نووسینەکانمدا چاوەڕێی زیاتر ڕوونی و گونجاوی مەکە، چونکە ئەوان بینینەکانمیان لە وەرچەرخانێکی سەیر و تێپەڕبوونی دەروونی پەنهان وچاندین شتی دیکەش کۆکردۆتەوە و کورت کردۆتەوە ئەگەر لێیان ئاگادار بوایەی ئەوا بە دڵنیاییەوە لێت دەبوردم و پۆزشت بۆ دەهێنامەوە!.

حەوتەم: مەڵێ ئەگەر هەمووی نەزانم، ئیدی هەمووی واز لێدەهێنم، ئەگەر تۆ لە باخێکدا بوویت ئایا هەموو میوەکان واز لێدەهێنیت ئەگەر هەمووت پێ نەخورا؟.

هەشتەم: هەرچییەکت هاتەڕێ لە شێوەی بەڵگە و بورهاندا بوو ئەوە بورهان نیە تا بووترێت جێی تێڕوانینە، بەڵکو بنەمای لەپڕ وەرگیراوی قورئانن کە بەستراونەتەوە و هۆنراوەنەتەوەو پارێزراون بە نووری درەوشاوەی قورئانی پیرۆز{٤}.

## چەند نوورێك سەبارەت بە مەسنەوی:

لەوانەیە دیارترین شتی هاوبەشی نێوان (مەولانا جەلالەدینی ڕۆمی و سەعید نوورسی) ئەو کودەتاو وەرچەرخانە (بەڵکو لە دایکبوونەوەیە) مەزنە بێت کە لە کاتێکی دیاریکراودا لە مرۆڤێکی زانا و فەقیهەوە (بەڵکو لەناودارترین زاناوە) بۆ مرۆڤێکی ڕۆحانی کەیل بە ئەزموون و دەستکەوتنی بەختەوەری مەعنەوی وەریگێڕان، ئیدی دوای ئەو وەرچەرخانە گەورەیە هەم نوورسی دەست بە نووسینی

مەسنەوی نووری وەك شەتلگەی پەیامەکانی نوور و پاشان هەر سەدوسیّ پەیامەکە دەنووسیّت.

هەم مەولاناش دوای ئەو وەرچەرخانە مەزنە بوو کە لە دەیەی چوارەمی تەمەنیدا بەسەریدا هات و قوتابی ومووریدانی داوایان لیّکرد کە کتیّبیّك بنووسیّت و ئەزموونی خۆی تیّدا بگوازیّتەوە تا قوتابی و موریدانی سوودی لیّ بینن، لەو کاتەدا بوو مەولانا قەوالّەیەکی لە میّزەرەکەیدا دەرهیّناو نۆزدە دیّری یەکەم و ناسراوی مەسنەوی تیّدا نوسرا بوو، هەروەك ئەوەی قوتابیەکانی نیازی دلّی ئەویان خویّندبیّتەوە{٥}.

ئیدی هەر شەش دەفتەرەکەی مەسنەوی لە ماوەی چوارده سالّدا نوسراون، کە بە تیّکرِا هەر دەفتەریّك بە دوو سالّ تەواو بووە، تەنها دەفتەری یەکەم نەبیّت کە بەهۆی مردنی ژنی سەلاحەدین زەرِینکوبی قوتابی خەتخۆش و نووسەری مەولانا یان بەهۆی بیّتاقەتی رۆحی مەولاناوە دوای نووسینی ئەو دەفتەرە بۆ ماوەی دووسالّ دەوەستیّت، دواتر دەفتەری دووەم دەستی پیّکردووە، کە رووی گوتەی مەولانا هەمیشە لە سەلاحەدین بووە و زۆرجار تا هەلّهاتنی خۆر بەردەوام نووسیویانە نیوە دیّری (واخۆر رووی جوانی شیّوەی رووی جوانی تۆی پیشاندا) بەلّگەی ئەوەیە کە تەنها کاتیّك مەولانا هەستی بە هاتنی غەیرەیەك کردبیّت دەستی لە شیعر وتن و قوتابیەکانی دەستیان لە نووسین هەلّگرتووە{٦}.

کۆی شیعرەکانی مەسنەوی هەنووکە (٢٥٢٦٥) دیّرِ حسیّب دەکریّن، مەولانا بیّجگە لەو شیعرانە دیوانیّکی دیکەی بەناوی (دیوانی کەبیر) یاخود دیوانی (الشمس) هەیە کە نزیکەی (٣٥)هەزار دیّرە شیعرە، واتە مەولانا نزیکەی (٦٠)هەزار دیّرِ شیعری هەیە{٧}.

## شیّوازی مامەلّە و ستایلّی کاری مەولانا لە مەسنەویدا:

لیّکۆلّەران لە گرنگترین کتیّبی عیرفانی لە دوای قورئان(واتە مەسنەوی مەعنەوی) لەسەر ئەوە تەبان کە مەولانا لەو دیوانەدا شاعیرانە مامەلّەی نەکردووە، بەلّکو لەو (٢٥)هەزار بەیتەی لەو دیوانەدا هەن تەنها (٢)هەزار بەیتیان حالّەتی شیعری و گرگرتنی عاشیقانەن{٨}، کە تیّیدا مەولانا نهیّنیەکان دەدرکیّنیّت و هیچ باکی نیە لە دیّریّکدا دەلّیّت: من ئەو نهیّنیانە دەلّیّم کە حەلاج لە بەریان لە سیّدارە بدریّت، ئەگەر لە کۆی شیعرەکانی تردا هەر بە گوتەی مەولانا ئەو گرە ئاگرینانەی نیّو دەروونی خۆی بە سەدان ئاو شۆراوەتەوە هەتا بچیّتە نیّو نیّو ئادابەکانەوە و لە

زماندا جێگەی بێتەوە، ئیدی هەر بۆیە مەسنەوی ئەو کتێبەیە کە قووڵایی ڕۆمانی هەیە، بەڵام هەموو کەس لێی تێدەگات، بەڵام ئەوە (دیوانی شەمس)ە کە شاعیریەتی مەولانایان تێدا دەردەکەوێت ،لەوێ قابیلیەتی لەبن نەهاتووی ئەزموونی شیعری مەولانا دەردەکەوێت، لەم ڕووەوەیەو لەو سۆنگەوەیە کە مەبەستی یەکەمی مامۆستا نوورسی بەرگریکردن بووە لە ئەزموونی ئیمانی، هەر بۆیە هەمیشە هەمان ڕوونکردنەوەی داوەو زۆرترین سوودی لە نموونە وەرگرتووە، ئەم شێوازەش زۆر نزیکە لە مەسنەوی مەعنەویەوە ، هەندێك لە شارەزایان دەڵێن هەموو (احیاو علوم الدین)ی ئیمامی غەزالی بە هەموو نموونە زۆرەکانیەوە لە مەسنەویدا هەن، بە جیاوازی ئەوەی هەمیشە مەولانا خەریکی چنینەوەی بەرەکانی عیشق و ئیمانە، تا ڕادەی ئەوەی دەتوانرێت بووترێت، سەراپای مەسنەوی باسی خۆشیەکانی گەیشتن بە مەعشوق و بانگەشەی وەسڵە، تا ئەوەی زۆرترین زاراوەیەك لەو دیوانەدا دووبارە بۆتەوە بریتین لە زاراوەکانی شەکر و شیرینی ئەگەر لەگەڵ دیوانێکی وەك دیوانی (حافیزی شیرازی)دا بەراوردبکرێت ئەوا ئەو وشەیەی زۆرترین بەکارهێنانی هەیە تێیدا بریتیە لە وشەی (سوێری) {٩}، مەولانا هەمیشە باسی دەستکەوتەکانی ئەو وەرگەڕانە مەزنە دەکات کە عیشق بە سەریدا هێناوە و ئەو هەمیشە میوە جۆراوجۆرەکانی عیشق دەچەژێت.

باغی سبز عشق کو بی منتها است

در او جز غم و شادی بس میوەها است

(بەری باغی سەوزی عیشق هێندە نەبڕاوەیە، کە لەوێ بێجگە لە غەم و شادی چەندین میوەی دیکە هەیە).

مەولانا هێندە مەژوڵی عەیش و نۆش و لەزەت بردنە هەر بیری بەلای خزمەتی ئەو باغەوە نیە کە ئەو میوانە بەرهەم دەهێنێت، یاخود هەر هەستی پێناکات خۆی گوتەنی (ماسی لە دەریادا هەست بە بوونی ئاو ناکات) تەنانەت لەوانەیە یەکێك لەو دێرە دەگمەنانەی مەولانا کە باس لە ئیمان دەکات دەڵێت:

گوشم شنید قصە ایمان ومست شد

کو قسم چشم؟ صورت ایمانم آرزوست {١٠}

(گوێم بیستی چیرۆکی ئیمان و مەست بوو، کوا بەشی چاو من شێوەی بینراوی ئیمانم ئارەزوو).

بەڵام لەبەر ئەوەی نوورسی لە سەردەمێکدا دەژی ئەو باغە بێ دەماخ و خزمەت بووە، ئیدی بەرەکانی وەك لەوەو پێش زۆرو زەبەندە نین پێویستی بە خزمەتکار و باخەوان هەیە، بۆیە نوورسی خۆی تەنها بە خزمەتکارێکی قورئان دەبینێت، (تەنها خزمەتکارێك و بەس کە هەوڵی بەدەماخ کردنەوەی ئەو باخە دەدات، کەواتە کاتی ژیانی نوورسی لەگەڵ سەردەمی مەولانادا زۆر گۆڕاوە، هەر بۆیە نوورسی دەڵێت: ئەگەر من لە سەردەمی مەولانادا بژیامایە ئەوا مەسنەوی مەعنەویم دەنووسی و مەولاناش لە سەردەمی مندا بژیایە پەیامەکانی نووری دەنووسی، رەنگە وێڕای واق بوون و موعجەب بوونی نوورسی لە بەرامبەر ئەزموونی عیرفانی مەولانا و هەست بە نزیکی هەردوو ئەزموونەکە ئەمە یەکێك لە جیاوازیەکانیان بێت، کە لە راستیدا جیاوازی زەمەن و سەردەمە، هەر بۆیە نوورسی لەبری ئەوەی بەدووی چنینەوە و دەستخستنی ئەزموونەوە بێت، ئەزموونەکەشی بۆ خزمەتی ئیمان تەوزیف دەکات، بەڵام بەرگیری کردنێکی وشکی مەنتیقی و عەقڵانیانە نا، بەرگریکردنێك بە خولقاندنی بەرزەخێك کە لە نێوان دڵ و عەقڵدایە هەر بۆیە بابەتی سەرەکی کتێبێکی وەك مەسنەوی نووری بریتین لە بابەتی یەکتاپەرستی و پێغەمبەرایەتی و حەشر و ئیمان و قورئان، بەڵام لەنێو دەریایەك لە زاراوەی عیرفانی و رۆحی وەك، راز و نوور و دەریا و تەڵەسم و فەیز و...هتد، ئەوەی لەو کتێبەدا هەستی پێدەکرێت زیندوویەتی سروشت و بوونە تێیدا کە ئەوە تەنانەت لە ناونیشانی هەر سیانزە بەشەکەیدا دەردەکەوێت وەك (دروشانەوەیەك لە خۆری یەکتاپەرستی، دڵۆپێك لە دەریای یەکتاپەرستی، چەند تکەیەك لە دەریای فروانی قورئان، دانەیەك لە بەرەکانی باخەکانی قورئان، گوڵێك لە باخچەکانی قورئان، زەرەیەك لە تیشکدانەوەی هیدایەتی قورئان، شنەیەك لە سروەی رێنموونی قورئان، مەشخەڵێك لە تیشکەکانی قورئان، خاڵێك لە نوری ئایینی پەروەردگار، تیشکێك لە تیشکی ئەستێرەکانی قورئان){١١} بە کورتی ناوەرۆکی بابەتەکانی مەسنەوی بابەتە ئیمانیەکانە بەڵام رۆحێکی عاریفانە.

هەندێك لە خاڵە هاوبەشەکانی سەعید نوورسی و مەولانا جەلالەدینی رۆمی:

هەرگیز شیمانەی ئەوە نیە لە خوێندنەوەیەکی کورتی وەك ئەم بابەتەدا هەموو ئەزموون و بیری ناو مەسنەوی مەولانا و مەسنەوی مامۆستا نوورسی بهێنرێت، لەو باوەڕەشەوە کە هەرگیز خوێندنەوە بۆ کتێبێك جێگەی خوێندنەوەی کتێبەکە

ناگرێتەوە، هەر لەو سۆنگەیەوە کە خوێندنەوەکە شتی نوێی تێدا نابینین، هەر بۆیە لە ژێر دوو ناونیشاندا کە لە یەکێکیاندا بابەتە هاوبەشەکانی نێوان نوورسی و مەولانا لەوی دیکەیاندا جیاوازیەکانی نێوانیان باس دەکەین ئیدی

هاوبەشەکانی نێوانیان:

یەکەم: ئەزموونی هاوبەش: دوای گەڕانەوەی مامۆستا نوورسی لە دیلێتی لە یەکێتی سۆڤیەت و دوای پێشوازیەکی گەرم لەلایەن سوڵتانی عوسمانی و خەڵکێکی زۆری ئەستەمبولی پایتەختەوە و کردنی بە ئەندامی یانەی حیکمەتی دەوڵەتی عوسمانی و بڕینەوەی موچەیەکی شیاو بۆی و لەپاش ئەوەی نوورسی لەبەردەم ئاوێنەدا موویەکی سپی لە ریشیدا دەبینێت ئەو دەمە هەست بە فەنا و کۆتایی هاتنی دونیا دەکات و ئەمەش دەبێتە سەرەتای ئەزموونێکی گەورە و هەست بە لاوازی نەزعەی فەلسەفەی عەقڵانیەت لای ئەو، ئیدی کتێبی عاریفە گەورەکانی وەك ئیمامی رەبانی و شێخ عەبدولقادری گەیلانی و ئیمامی غەزالی و مەولانا جەلالەدینی رۆمی دەخوێنێتەوە، دەبینێت ئەوان رێگەیەکی سنووری هاوبەشی نێوان (عەقڵ و دڵ)یان گرتووە، ئیدی لە مەکتوباتی ئیمامی رەبانیدا تەعبیری (قیبلەت بکەرەوە بە یەك)دەخوێنێتەوە و هەست دەکات ئیمامی رەبانی لەو تەعبیرەدا لەگەڵ ئەودا دەدوێت، لەو واتێدەگات کە پێی بڵێت لە ئەزموونی رۆحی خۆتدا قورئان بکەرە مامۆستات، واتە مامۆستا نوورسی زەمەن دەبڕێت لەگەڵ کەسایەتی ئیمامی رەبانیدا رووبەڕوو دەبێتەوە، لە کاتێکدا مەولانا کاتێك لەگەڵ کەژاوەی قوتابیەکانیدا پیاوێکی پیری موو سوور پرسیارێکی بەراوردی نێوان (ویلایەت) و (نبوەت)لێ کرد، ئەو پرسیارە نەریتیەی لە کتێبە کەلامیەکاندا بوونی هەیە، ئەمە سەرەتای ناسراوی نێوان شەمس و مەولانا دەبێت پەیوەندیەکی نائاسایی و بێ سنوور لە نێوانیاندا دروست دەبێت،بەو پەیوەندیە دواتر هەم مەولانای مردوو بە گوتەی خۆی زیندوو دەبێتەوە و هەم شەمسیش بە گوتەی خۆی کە ئەستێرکێك بوو پڕ لە ئاو وبەردەوام پڕو پڕتر دەبوو ئەوە مەولانا بوو جۆگەیەکی لەو ئاوە بەست لە (تەقین) رزگاری کرد، کەواتە زۆر بە کورتی هاوبەشترین خاڵی نێوان مەولانا و نوورسی دەست پێکردنێکی هاوبەش و هاوشێوەیە.

دووەم: دەشێت بووترێت بەهۆی گەورەیی ئەزموون و بلیمەتی هەرکام لە مەولانا و نوورسیش ئاسان توانراوە بە (شێت) تۆمەتبار بکرێن، ئیدی نوورسیەکی عاقڵ رێی

دەکەوێتە شێتخانە و مەولاناش دوای ون بوونی شەمس دەداتە دەشت و دەر، تەنانەت لەلایەن کورەکەی خۆیەوە بە (دێوانە) ناودەبرێت ی تەنانەت خەڵکی فێڵزان بە هەواڵی درۆینەی هاتنەوە یاخود بینینی شەمس پێی رادەبوێرن، جارێك کەسێك پێدەڵێت (شەمس)م بینیوە ئەویش جلوبەرگی دەرەکی خۆی پێدەبەخشێت، پاشان بە مەولانا دەڵێن ئەو پیاوە درۆ دەکات، ئەویش دەڵێت من دەزانم درۆ دەکات، خۆ ئەگەر بەراستی بوایە ئەوا هەرچیەکم هەیە هەمووم پێدەبەخشی{١٣}.

سێیەم: ئەزموونی گەورەی هەرکام لە نوورسی و مەولانا وایکردووە هەرچیەکیان وتبێت بۆ ئەوە شیاو بووە وەك حیکمەت سەیر بکرێت بۆ کتێب بگوازرێتەوە ئیدی بە تەمەنترین ئەزموونی رۆحی ئەزموونی ئەو دوو پیاوەیە و ئەم هەرچیەکی وتووە نووسیاویانە و نزیکەی (٦٠)هەزار دێڕ شیعر و چەند کتێبێکی لێ هاتۆتە بوون نوورسیش تەنها هەر پەیامەکانی نوور (١٣٠) پەیامن بێجگە لە کتێبەکانی دیکەی، هەرکامیان ئەوان وتوویانە قوتابیەکانیان نووسیویانە و زۆرجار رۆحانی بوون یاخود خێرایی ئەو نووسینانە مایەی سەرسوڕمان و سەمەرە بوونە، جاری واهەبووە نوورسی کتێبێکی لە دوو کاتژمێردا نووسیوە{١٤}.

چوارەم: ناوداری و شۆرەت، هەرکام لە سەعید نوورسی و مەولاناش پێش ئەوەی بەو ئەزموونە رۆحی و عیرفانیانەدا تێپەڕ بېن کەسێکی زانا و ناوداربوون، بۆ ئەمەش هێندە بەسە کە بووترێت مامۆستا نوورسی زیرەکیەکی بێ وێنەی هەبوو بە ناوازەی زەمانە (بدیع الزمان) ناسراوە و سەرۆکی سوپای خۆبەخشەکانی دەوڵەتی عوسمانی و یەکێك لە شەش ناودارترین زانایانی (دار الحکمە) بووە بەڵام هەموو ئەوانەی واز لێهێناوە لە پێناو خزمەتکردنی قورئان و ئیماندا، هەروەها مەولانا موفتی قۆنیە و سەدان قوتابی و فەقێی هەبووە و باوکی شێخی تەریقەت و بە باشی مەولانا بە کارەکانی هەڵساوە، بەڵام لە هەموو ئەوانە گوزەراوە و خۆی بۆ ئەزموونەکەی یەکلایی کردۆتەوە و وازی لە هەموو شتێك هێناوە{١٥}.

پێنجەم: نوورسی زۆر لە بەرامبەر کەسایەتی مەولانا موعجەب بووە تەنانەت نووسینە عەرەبیەکانی ئەگەرچی شیعر نەبوون، بە مەسنەوی ناوناوە، دیارە کە زاراوەی مەسنەوی لە بەرامبەر جۆرێکی دیاریکراوی شیعردا بەکاردێت تەنانەت لەبەرامبەر دەروێشێکی مەولەویە، واتە تەریقەتەکەی مەولانا کە سەعید نورسی دەبینێت تووشی حاڵەتێکی سەیر دەبێت لەبەر سام و هەیبەتی نوورسی، بەڵام

نوورسی پێیدەڵێت: من هیچ نیم تەنها کەسێکی وەك شێخ واتە (مەولانا) نەبێت، هەروەها (نووسینە عەرەبیەکانی) لەو ناوەوە بۆ ناوی (مەسنەوی) دەگوازێتەوە، چونکە کاریان وێکچووی یەکترە، هەروەك لە پێشەکی مەسنەویدا دەنوسێت هەروەك براکەی مامۆستا نوورسی واتە (مەلا عەبدولمەجید) پێشەکیەکەی خۆی وەك ئامادەکاری (مەسنەوی نووری) لەلای گۆڕی مەولانادا نووسیوەو ئەمەش تەنها بە رێکەوت لێك ناداتەوە{١٦}، بەڵام ئەگەر لە هۆکاری سەرەکی گۆڕینی ناوی (المجموعە العربیە) لە نوسینەکانی مامۆستا نوورسی بپرسین؟ وەڵامی نوورسی دەبێتە ئەوەی چونکە ئەویش وەك ئەم هەم رێگەی عەقڵ و هەم رێگەی دڵی پێکەوە گرێ داوە، هەروەها ئەو باوەڕی وایە و تکای ئەوەیە کە ئەمیش رۆڵی مەسنەوی مەعنەوی بۆ زەمەنی خۆی ببینێت.

شەشەم: مامۆستایەتی قورئان، وێڕای ئەوەی مەولانا دوای بینینی شەمسی تەبریزی ئەو شۆکە گەورەیەی تووش بوو، بوو بە مەولانایەکی دیکە، بەڵام هەر ئەوە ئەو نەبوو کە مەولانای کەشف کرد بەڵکو ئەوە مەولاناش بوو وەك پێشتر ئاماژەم پێدا شەمسی کەشف کرد بە شایەتی خودی شەمسی تەبریزی، وێڕای ئەو پەیوەندیە بەهێزە، بەڵام مەولانا موریدی شەمس نەبووە، بەڵکو یەکێك لە خاڵە بەهێزەکانی مەولانا ئەوە بووە کە ئەو لە مەقامی (تەبەع)دا نەبووە و لە سلوکی رۆحیدا مامۆستایەتی کەسی قبوڵ نەبووە و مامۆستای ئەو خودی (رسول الله) و (قورئان) تاکە رێنموونی کاری بووە، ئەگەر چی سوودی زۆری لە کەسانێکی وەك سەنائی و (الهی نامە)ی ئەوی بینیوە ، تەناتنەت زۆر دیوانی موتەنەبی شاعیری گەورەی عەرەبی خوێندۆتەوە ، هەروەها نوورسیش بەهەمان شێوە بووە و قورئان تاکە رێنموونی کاری بووە خۆی بە خزمەتکاری قورئان زانیوە و وتوویەتی ئەم سەردەمە سەردەمی تەریقەت و تەسەوف نیە خۆی بە شێخ نەزانیوە{١٧}، هەروەها مەولاناش بەهەمان شێوە چەندین بەیتی هەن کە زەمی زاهید و وشکە سۆفی دەکات.

حەوتەم: رۆحی شیعری هەردووکیان، لە شوێنی دیکەش نووسیومە یەکێك لە تایبەتمەندیەکانی ئایینداری عیرفانی بریتیە لە خولقاندنی دەقی ئەدەبی جوان، هەر لێرەوە مەسنەوی مەولانا یەکێك لە جوانترین دەقە ئەدەبیەکانی جیهانە، مەولاناش یەکێك لە شاعیرترین عاریفەکانی دونیایە. هەروەها بە گوتەی یەکێك لە شاعیرە

ناودارەکانی تورکیا نوورسیش لە ئاستی گۆتە و دانتی دایە لە شاعیر بووندا ئەو شیعریەتەش لە پەیامەکانی نووردا وای کردوە هەرکەس دەستی کرد بە خوێندنەوەیان ئیدی دەبێتە دۆستیان و دەستیان لێهەڵناگرێت، هەربۆیە کەسی وامەبووە زیاد لە پەنجا ساڵ لە خزمەتی ئەو پەیامانەدا بووە، بێماندوو بوون.

لە هاوبەشیەوە بۆ جیاوازی:

ئەگەر پێشتر باسی هەندێ لە خاڵە هاوبەشەکانی نێوان نوورسی و مەولانا کرد ئەوا ئێستە باسی هەندێك لە جیاوازیەکانی ئەو دوو عاریفە دەکەین:

یەکەم: لەوانەیە یەکەم جیاوازی دیاری نێوان هەردوو کتێبی مەسنەوی مەولانا و مەسنەویەکەی مامۆستا نوورسی بریتیە لەوەی لە رووی فۆرمەوە زمانی مەسنەوی مەولانا زمانی شیعریە و مەسنەوی مامۆستا نوورسیش پەخشان و نووسینی ئاسایی، ئەگەرچی هەردووکیان رۆحی شیعریان تێدایە.

دووەم:خزمەتی ئیمان و بەری ئیمان :

پێشتر ئاماژەمان بەوەدا کە مەولانا لەسەردەمی راز و ئەفسون و عیشقدا ژیاوە، ئەو سەردەمەی باخی ئیمان تێیدا بەدەماغەو هەرکەس ویستبێتی بەشی خۆی بەری ئیمانی چنیوەتەوە و ئەو هەموو باسەی مەولانا لەشیرینی وەصڵ و گەیشتن بە مەعشوقی راستەقینەی دەکات و .. لەو باغەدا بێجگە لە غەم و شادی چەندین میوەی دیکەش هەن ، کەسی عاشیق هەرچەند کورتە باڵاش بووبێت هەر بەشی خۆی لەمیوە نیشتوەکانی ئەو باغەی چنیوە، لەکاتێکدا نوورسی لەسەردەمیکدا ژیاوە کە باغی ئیمان بێدەماغ وتا رادەی وشك بوون سیس بووە، درەختەکانی هەمووی وشك و هەڵچوون ، تا رادەی ئەوەی کەسێك دەبێت زۆردارەوان بێت کە بتوانێت بەری ئەو دارانە لێ بکاتەوە، بۆیە نوورسی ئەگەرچی عاشیق و عارفێکی گەورە و دارەوانێکی لێهاتووی ئەو باغە بووەو بەلام زۆر لەخۆبوردانە لەبری ئەوەی خەریکی چنینەوەی بەر و میوەخواردن و لەزەتبردنی تەماشاکردنی وەصڵی یار بێت هەوڵەکانی خۆی بۆ خزمەت و باخەوانی ئەو باغە بێدەماغە چڕ کردۆتەوە ، هەر بۆیە ئەگەر مولانا بەری ئیمانی بردوە و لەزەتی لەئیمان بردوە ئەوا نوورسی خۆی بەخزمەتکاری ئیمان داناوە ئەمەش یەکیك لە جیاوازیەکانی ئەو دوو عاریفەیە.

سێیەم:چڕی مەسنەوی نووری و فراوانی مەسنەوی مەعنەوی

مەسنەوی نووری نوورسی (وەك خۆی دەڵێت) شەتلگەی پەیامەکانی نوورە، هەر ئەو شەتڵانەی مەسنەوییە دواتر باغی فراوانی پەیامەکانی نوور دروست دەکەن، هەر بۆیە لەرووکەش و بە قەبارە مەسنەوی کتێبێکە زۆر گەورە نیە وچەند سەد لاپەڕەیەکی دیاریکراوە ، بەلام لەرووی ناوەرۆکەوە بە حوکمی ئەوەی کورتەی هەموو پەیامەکانە..ئەو پەیامانەی هەزاران لاپەڕەن ئیدی زۆر فراوانە، بەلام مەسنەوی مەولانازێتر لە (٢٥) هەزار دێڕە شیعرە و لەویۆ وەك مەولانا ناسان دەڵێن مەولانا زیاترهۆنەرە(ناقم) تا ئەوەی شاعیر بێت، زۆربەی داستانەکانی (احیا)ی غەزالی و عاریفەکانی دیکەی هێناوە، بۆیە دەتوانرێت بووترێت مامۆستا نوورسی ئەوپەڕی هەوڵی کورتبڕشی و شیعریەتی داوە ، دواتر لەپەیامەکاندا ئەو بابەتە کورتانەی زۆرکردوە و پانتایی پێ بەخشیوە، بەلام مەولانا مەسنەوی خۆی زۆر فراوان کردوەو لەماوەی شانزە ساڵدا نووسیویەتی.

چوارەم: کوردبوون و ژیانی سەردەمی مۆدیرنەی مامۆستا نوورسی و فارس بوون و ژیانی پێش مۆدیرنانەی مەولانا.

پەراوێزەکان:

١- بديع الزمان سيعد النورسى، لمثنوى العربى النورى، نشر دار سوزلر للنشر، استانبول، الطبعة الثانية، ١٩٩٤م، تحقيق:احسان قاسم الصالحى.ص٣٠.

٢- هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل٢٣.

٣- هەمان سەرچاوە،ل٣٥.

٤- هەمان سەرچاوە،ل ٣١٨.

٥- عبدالكريم سروش، ئَينه دوم. تفسير مثنوى، دفتر دوم، نيستان جم، تهران، نحوه سرودن شدن مثنوى (C.D).

٦- هەمان سەرچاوە و هەمان بەش.

٧- هەمان سەرچاوە و هەمان بەش.

٨- هەمان سەرچاوە و هەمان بەش.

٩- د.الهى قمشەاى، حافظ شيرازى، (C.D) .

١٠-عبدالكريم سروش، قصەى ارباب معرفت، مؤسسەى فرهنگى صراط، چاپ پنچم، ١٣٧٣ص ٣٠٨.

١١- سەرچاوەی پەراوێزی ژمارە (١).

١٢- سەرچاوەی پەراوێزی ل٣٥، و هەمان بەش.

١٣- سەرچاوەی پەراوێزی ژمارە (٥) و هەمان بەش.

١٤- هەمان سەرچاوە و هەمان بەش.

١٥- سەرچاوەی پەراوێزی ژمارە (١)، ل٢٣.

١٦- هەمان سەرچاوەی پەراوێزی ژمارە (٥) و هەمان بەش.

# سەوزبوونی گوڵی (فەتوا) لە سەر زەوی (ئیجتیهاد)دا

## فەتوا ترۆپكی داهێنانە فیقهیەكانی ناصری سوبحانی

### خوێندنەوەی كتێبی (فەتواكانی) ناصری سوبحانی

ئەگەر ئیجتیهاد یەكەم تایبەتمەندی هزری ناصری سوبحانی بێت ، ئیجتیهاد لەو شتانەشدا كە بە جێگیرە ئاینیەكان(الپوابت الدینیه) ناسراون، كەواتە لای سوبحانی هەموو شتێك لەبەردەم ئەگەری ئیجتیهاددایە ئەگەر مەرجەكانی ئیجتیهاد هاتبنە دی و میتۆدی ئیجتیهاد گیرابێتە بەر ، راست ئەمە جیاوازی جەوهەری نێوان سوبحانی و كەسێكی وەك نوورسییە ، ئەگەر ئیجتیهادیش سەر زەویەك بێت كە دواجار گوڵی فەتوای تێدا سەوز بێت و هەركام لەو دوانەش (واتە ئیجتیهاد وفەتوا ) تەنها لە كایە و زانستی فیقهدا بوونیان ببێت، كەواتە مامۆستا ناصیر بەپلەی یەكەم فەقیە بووە ، بەلأم فەقیە نەبە مانا باوەكەی ،فیقە بەمانای بان فیقە و وەك تەرزێكی تایبەت لەدینداری و میتۆدیكی تایبەت لە مامەڵە كردن لەتەك ئاییندا !.

ئەگەر مامەڵەی فیقهیش تەرزێكی تایبەت بێت كە تایبەتمەندی و خەسڵەتی سەربەخۆی ببێت و جۆریكی تایبەت لە دید و جۆری مامەڵەی سەربەخۆ ، تەنانەت جیهانبینی سەربەخۆ بخولقێنێت ، ئەو كەسەش كە خاوەنی ئەو دید و مامەڵە و جیهانبینیە تایبەتەیە پێی دەوترێت (فەقیە)، كەجیهانبینی و دیدی جیاوازە لەكەسی عاریف و فەیلەسوف ، كە بێگومان هەركام لەوان لەفەلسەفەی دین و فیكری دینیدا خاوەنی خوێندنەوە و ئیمكانیاتی تایبەت بە خۆیەتی .. لە هەر كامیان كارێك هەڵدەسورێت كە لەوانی دیكەیان نایەت، هەركامیان وەلأمگۆی پرسیارێكە بەوانی دی وەلأم نادرێتەوە و هەر كامیان سەر زەوی كاركردنی تایبەت بەخۆی هەیە ، لێرەوە ئەگەر مامۆستا ناصر فەقیە بووبێت ئەوا سەر زەوی كاركردنی جیاواز بووە لەسەر زەوی كاركردنی فەیلەسوف یان عاریفێك ، بەلأم ئەمەش مانای ئەوە نیە هیچ چركەساتێكی هاوبەش لەنێوانیاندا بوونی نیە ، یا

دەشێت فەیلەسوفێك چرکەساتی فیقهی و بەپێچەوانە وعاریفێکیش بابەتی فیقهی فەلسەفی ببێت!

ئیدی سوبحانی فەقیە هەم مامەڵەی فەلسەفیانە و هەمیش بابەتی عیرفانی لەجیهانی ئەودا هەن ، بەڵام دواجار فەزای لێکۆڵینەوەو جیهانی ئەو فەزاو جیهانێکی فیقهیە و ، هەر بۆیەش ترۆپکی داهێنان لای ئەو بە بۆچوونی من داهێنانە فیقهیەکانیەتی، ناڵێم داهێنانی دیکەی نەبووە ، با هەیبوە، بەڵام هەموو داهێنانەکانی دیکەی لەخزمەت داهێنانە فیقهیەکانیدا بوون ، ئەمەش نەك هەر کەمی نییە بۆ ئەو ، بەڵکو بەوە ئەو کارانەی ئەنجام دا کە تەنها بەو ئەنجام درا ، لەوانەیە کتێبی فەتواکانی باشترین پیشاندەری هەرکام لەو گوتانەی سەرەوە بێت ، کتێبی فەتواکان ئەو کتێبەی تاهەنوکەش لە دونیای چاپەمەنیدا چاوی هەڵنەهێناوە وئەوەی کە لەبەردەستدا هەیە تەنیا دەستنووسێکە بەردەوام کۆپی دەکرێت و دەستاو دەست دەکات ، ئەو دەستنووسەی کە بەخەتە جوانەکەی مامۆستا سوبحانی لە سەر دەفتەرێکی قەبارە مامناوەند لە سەدوسێ لاپەڕەدا نوسراوەتەوە و لە کاتی دەستگیرکرنیدا یەکێك بووە لەو نوسین و تۆمارانەی کە براوە و پاشان بە مەبەستی فەوتاندنی لەناو براوە ،وا زانراوە کە تەنها ئەو نوسخەیەی هەیە و بێئاگا لەوەی کە چەندین نوسخەی دیکەی لێگیراوەتەوە وهەر بە نووسترانی (بارت) گوتەنی نەمری بۆ خۆی خولقاندوە .

ئەم نووسینە تەنها هەوڵێکی ناساندنی ئەو کتێبە و تایبەتمەندیەکانی فەتوای سوبحانی و بیانوویەك بۆ ناساندنی ئەو کەسایەتیە مەزنەیە !

* * *

( لە فەتوا بەرنامە دەرناهێنرێت )، ئەمە ئەو ڕێسا گشتیە یە کە فیقه ناسان دەربارەی فیقه و فەتوا وتوویانە و لەبەر ئەوەی کە کاری فیقه بریتیە لە دەرهێنانی حوکمێکی تایبەت بە مەسەلەیەکی پارەیی (جزئی)تایبەت:کە یەکێك لە پێنج حوکمە ناسراوەکە (حەرام و واجیب، مەکروه، موستەحەب، موباح) بۆ ئەو بابەتە پارەییە دیاری دەکات، ئیدی هەرگیز ناشێت بەرنامەوسیستەمی گشتی لێ دەربهێنرێت ، لێرەوە شیمانەی ئەوە نیە کە فیقه ببێتە بنەمای بەڕێوەبردنی کۆمەڵگەو پرۆژەی پێ دابرێژرێت وئیدارەی کۆمەڵگەی پێبکرێت و پێشبینی ڕووداوەکانی پێبکرێت، هەرکام لەو کارانەش (پرۆژەو بەرنامەو ئیدارەوپێشبینی ) تەنها لە زانستە مرۆییە

نوێکان(العلوم الانسانیه الجدیده)دەخێزێت ، ئەمەش رای چەندین بیریاری وەك (جابیری) و (سروش) ە،بەلاّم ئەگەر ئەمە خەسلّەتی زانستی فیقه بێت بە شێوەیەکی گشتی و بەمانا بچوکەکەی ، ئەوا رۆڵی فیقه لای سوبحانی بەو شێوە یە نیە ، چونکه فیقه لای ئەو هەم سیستەمێکی تەواوە و هەم بەمانا فراوانەکەیەتی واتە تەنها باس لەبابەتە رۆژانە بینراوەکان ناکات، لێرەوە دەشێت باس لەتایبەتمندیەکانی فیقه و پاشان بەرهەم و بەرەکەی واتە فەتوا لای مامۆستا ناصیر بکەین، بەمەش زێتر بەکتێبی فەتاواکان ئاشنا دەبین:

تایبەتمەندی فەتوا لای مامۆستا ناصر:

١- سیستەماتیزە بوونی فەتوا کان :

یەکێك لەو رەخنانەی لەلایەن زانایای زانستە مرۆییەکانەوە لە (فیقه ) گیراوە بریتیە لەناسیستەماتیزە بوونی ئەو زانستە و واتە بابەتەکانی فیقه بابەتی سەربەخۆن وبۆ هەرکامیان چارەی سەربەخۆ دانراوە، واتە ئەو زانستە حوکمی سەربەخۆی هەر مەسەلەیەك بەجوێ دەدۆزێتەوە ، کە یەکێك لە پێنج حوکمە ناسراوەکەیە کەئەوانیش (واجیب، حەرام ، مەکروه، سوننەت، موباح) ن ئیتر هەرکام لەو مەسەلانە یەکەیەکی سەربەخۆن، پەیوەندی سیستەمیان بەیەکدیەوە نیە هەر بۆیە ناتوانرێت لە فیقه پرۆژە دەربهێنرێت ، چونکه پرۆژە سیستەمێکی تەواوە ، ئەمەش لە گەورەترین خەوش و عەیبەکانی ئەو زانستەیە بەلاّم دەتوانرێت بووترێت سوبحانی لە فەتواداان و مامەڵەی فیقهیدا ئەو خەوشەی تێپەراندوە ئەویش بەوەی هەموو فەتواکانی پەیوەندیان بە یەکدیەوە هەیە و بونیادێك هەیە هەموویان کۆ دەکاتەوە ، کتێبی فەتاواکانیش باشترین نموونەی ئەم گوتەیەن کە لەپێش هەموو فەتواکانی و لەپێشەکی یەکەمی کتێبەکەدا جیهانبینی و دیدی خۆی وسەبارەت بەئایین و جۆری راڤەیخۆی بۆ کیتاب و سوننەت روون کردۆتەوە بۆئەمەش لەو پێشەکیەدا ئەوەی روون کردۆتەوە کە ئایین دوو بەشە : بەشی وێناکان (التصورات ) و بەشی بەهاکان(القیم )کەدەبێت هەردوو بەشەکە لەئاییندا (بەدیاریکراوی لە قورئاندا) باسیان لێوە بکرێت، ئیدی هەموو وێناکان (وێنا بەرامبەر بە خودا ، بەرامبەر بە بوون ، بەرامبەر بەمرۆڤ) و ناشێت بابەتێك لەو بابەتانە ببێت لە قورئاندا باسی لێوە نەکرا بێت(١) هەروەك دەبێت هەموو بەهاکان لە قورئانەوە وەربگیرێن ، چونکه بەهاکان لای سوبحانیش لە حەقیقەتە ئیعتیباریەکانن ئیدی بۆ دۆزینەوەیان ناشێت

تەنها پشت بە وێناکان(التصورات) ببەسترێت، لێرەوە دەتوانین بڵێین ڕوونکردنەوە بەرابییەکانی بڕیاری ئێرانی( د سروش ) لەسەرەتای شۆڕشدا لەسەری دەردەکەوێت بەتایبەتی لەو کتێبەکەیدا کە بەناوی (دانش و ارزش) هوەیە(٢).

پاشان لە پێشەکی دووەمداباس لە بونیادی وێناکان لە قورئاندا دەکات .: دەڵێت بنەمای سەرەکی وێناکان لە قورئاندا بریتیە لە ڕێسای (هەم خەلق و هەم فەرمان و ئەرکیش تەنها بۆ ئەوە ) (الا له الخلق و والامر)(٣) ، کە هەر لەسەرەتای بوونەوە کاتێك هەموو بوون تەنها دووکەڵێك بوو (كان دخانا) پاشان هەموو گۆڕانەکانی بوون ڕوویان دا تا ئەو دەمەی کە گۆی زەوی جوێ بوویەوە و مرۆڤی خولقاند ، لەبەرئەوەیئافراندن و خولقانی هەموو شتەکان لەلایەن پەروەردگارەوەبووە ، ئیدی هەر خۆشی فەرمانی(الامر) بۆ دیاری کردوون(٤) ، لێرەوە دەچێتە نێو باسی ناوەکانی پەروەردگارەوە : کە خوا خالیقی هەموو بوونە .. تاکە کاریگەری ڕاستەقینە (الفاعل ) و..سوودبەخش و زیانگەیەنەرەو ، ئەم دوانەش مانای دوو ناوی (الرحمن والرحيم)ن .. و خاوەن (مالك يان ملك)ی هەموو شتەکان .. و بە گوێکراوی فەرماندەو(الامر المگاع) .. و پشت پێبەستراوە(المستعان)ە ، ئیدی کۆی ئەو پێنج مانایەش(النافع، الضار، الملك، الامر المطاع ، الملك، المستعان) دەکاتە مانای وشەی (الرب)، لەکاتێکدا وشەی (الاله) تەنیا دۆوانەکەیکۆتایی(فەرماندەی بەگوێکراو،پشت پێبەستراو)دەگرێتەوە (٥)، ئیدی فەتواکانی خۆی سەبارەت بەولادانانەی کە دەشێت لە هەرکام لەو ناو و مانایانەدا ڕوو بدات و وێنای مرۆڤەکان تێك بدات(دەبنە هۆی دروست بوونی شیرك ) ڕوون دەکاتەوە، بۆیە نیوەی یەکەمی کتێبەکە(نیوەی فەتاواکان ) سەبارەت بە لادانە وێناییەکان ( الانحرافات التصوريه) و ئەو لادانانە(شیرکانە) ڕوون دەکاتەوە کەلە وێنادا ڕوو دەدەن ، : بەلاّم کەمتر لە مرۆڤەکان لەخالیقیەتی خوادا وێنایان شێواوە ، بەڵکو زۆرترینیان دەربارەی کاریگەری خوا (الفاعلية)وێنا و جیهانبینیان تەواو نیە، هەر بۆیە جۆری یەکەمی شیرك لای سوبحانی بریتیە لەشیرکی( فاعیلیەت)ئەم بابەتەش بەشێك لە کتێبەکە بۆخۆی دەبات ، دواتر شیرکی پشت بەستن (المعينيه) دێت لەویشەوە باسی تێر و تەسەلی بابەتی (تەوەسول) و (شەفاعەت)دەکات.

دواتر دێتە سەر بابەتە حوکمیەکانی وەك (سەربازی لەسەردەمی ستەمکاری ، پێشەوایەتی نوێژ ، و پەیکەرتاشی ، بیدعەچیەتی) هەمووشیان دەبەستێتەوە بەو

وێنایەوە کە لە پێشەکیەکەیدادایڕشتوە، دیدی فەتواکان سیستەمێکی تەواو وبەیەکەوە بەستراون و زاراوەیەکیش لە هەرکام لەو فەتوایانەدا زۆرترین بەکارهێنانی هەیە بریتیی لە زاراوەی (وەك وتمان)(٦)، واتە دەچێتەوە سەر بەشی پێشتر و لەهەمووشیاندا دەچێتەوە سەر پێشەکیکتێبەکە کە جیهانبینی و میتۆدی کارکردنی خۆی تێدا روون کردۆتەوە ، ئەمەش یەکەم تایبەتمەندی فەتوایە لای ناصری سوبحانی(٧) .

٢_پێشینەی مەعریفی فەتوا بەهاییەکان:

هەرگیز ناشێ لە زانستەوە (بەها) دەربهێنرێت، ئەمە ئەو ڕێسایەیە کە فەیلەسوفەکانی فەلسەفەی عیلم لەوانەش (کارل پۆپەر) باوەڕیان پێیەتی فەیلەسوفە پێشینە موسڵمانەکانیش هەر هەمان رایان هەبووە، سوبحانیش بە هەمان شێوە هەر باوەڕی وەهایە، بەلام کاتێك کە دەوترێت ناشێت بەهاکان (القیم) لە زانست و وێناکانەوە دەربهێنرێن، ئەمە بەو مانایە نیە کە زانست جێکەوتی لەسەر بەهاکان نیە بەڵکو ئەمە بەو مانایەیە کە ناشێت وەك دەرئەنجام لە وێناوە حوکم دەربهێنرێت. هەرگیز بەو مانایە نیە کە زانست بێ جێکەوتە لە سەر بەها و سنووری بۆ دانانێت و مانای بەهاکان روون ناکاتەوە ، هەر بۆیەش سوبحانی لە کتێبی (فەتواکانیدا) ئەو دەمەی لە حوکمەکان دەدوێت تیۆریای مەعریفەتناسی خۆی روون دەکاتەوە :

لای سوبحانی ئامرازەکانی بە دەستهێنانی مەعریفە سیانن(دڵ، بینایی، بیستن)هەر بەپشت بەستن بە ڕێسای (وەرنەگیرانی بەهاکان لە وێناکان)ئەوە روون دەکاتەوە کە دەبێت بەهاکان لەڕێی بیستنەوە (واتە لە ڕێی وەحیەوە)وە وەربگیرێن، ئەمەش بەپشت بەستن بەوردەکاریەکی زۆر لە قورئانەوە دەردەهێنێت ئەمەش دیرترین تایبەتمەندی فەتوا حوکمیەکانی(ناوێناییەکانی)سوبحانییە(٨) .

٣_ فەتواکان گوشراوی بۆچوونەکانی سوبحانی :

لەبەرئەوەی فەتواکانی سوبحان تەنیا فەتوا نین ، بەڵکو بابەتی تەواوی ئارگۆمێنتدارن(المواضیع المحتجة لها)، لەبەرئەوە زۆربەی بابەت و راکانی دیکەی ئەو بێجگە لە فەتوا(وەك میتۆدی تەفسیر و جیهانبینی و رای دەربارەی وەك بابەتەکانی وەك سوننەت و ناسیخ ومەنسوخ و ئوصول فیقه و تەنانەت بابەتە رێزمانیەکانی

وەك نەحو صەرف و هتد...) لە فەتواكاندا بوونیان هەیە و فەتوای هیچ كەسێكی دیكە بەو شێوەیە نیە(٩) .

٤_فەتوای قورئانی :

سوبحانی دوای ئەوەی مەنهەجیەتی (میتۆدی) حوكم دەرهێنانی خۆی روون دەكاتەوە و پیشانی دەدات كە دەبێت تەنانەت میتۆدی حوكم دەرهێنانیش هەر لە قورئانەوە بێت، ئەوجاحوكمەكان دەكات بە سێ بەشەوە:

١- حوكمە ئیشارییەكان. ٢- حوكمە تەفصیلییەكان. ٣- حوكمە رێسایییەكان (الاحكام القواعدیة):

١_حوكمە ئیشارییەكان: ئەو حوكمانەنكە لە قورئاندا هاتوون ، بەلام لەبەرئەوەی لە شێوەی ئاماژەی شاراوەدان ئیدی بەخوێنەری ئاسایی قورئان (من القی السمع وهو شهید) كەشف ناكرێن، تەنانەت زۆربەی جار بە كەسی موجتەهیدیش كەشف ناكرێن(وێنەی ژمارەی رەكعاتەكانی نوێژە فەرزەكان و كاتەكانی ئەو نوێژانە ) ئەمەش یەكێك لەو شوێنانەیە كە داخوازی هاتنە كایەی سونەتی روونكەرەوەی پێغەمبەرە(السنه المبینه للرسول) ، لەراستیدا ئەمەش سونەتی گەیەنەری حوكمەكەیە (البیان) لێرەدا بەمانای (بەلاغ)ە بەرامبەر (كتمان) نەوەك (توچیح))، ئەمەش پێویستی فەرمودە لای سوبحانی و دیدی ئەو سەبارەت بە سونەتیپێغەمبەر روون دەكاتەوە كە: بێجگە لەرێی روونكردنەوەكانی پێغەمبەرەوە لە هیچ رێگەیەكی دیكەوە شیمانەی ئەو نیە كە حوكمە ناروون و ئاماژەییەكانی قورئان كەشف بكرێن(١٠)، ئەمەش بەرپەرچدانەوەیەكی تەواوی ئەو كەسانەیە كە باوەڕیان وایە سوبحانی باوەڕی بە حەدیس نەبووە ، كەشفكردنی ئەم جۆرە بابەتە لای سوبحانی و تەفسیری (الایات المتشبهات) لای موفتیزادەش كە باوەڕی وایە كە حەزرەت لە شەوی میعراجیدا بەتەواوەتی ئەو نهێنیانەی بۆ كەشف بووە، ئەمەش بەیەكێك لە نزیكیەكانی فیكری سوبحانی و موفتیزادە دادەنرێت(١١)، بە هەرحاڵ بەشی یەكەمی حوكمە قورئانیەكان حوكمە ئاماژەییەكانن كە دەبێت پێغەمبەر روونكەرەوەیان بێت.

دواتر بەشی دووەمی حوكمەكان، حوكمە تەفسیلی و بەتەواوەتی باسكراوەكانن لە قورئاندا ، (وەك ئایەتەكانی دەستنوێژ و بەشكردن و بەشەكانی میرات و ئایەتی گەورەی قەرزدان و قەرز نووسین هتد...) كە هەركەس زمانی عەرەبی بزانێت

دەتوانێت لەو حوکمانە تێبگات بۆیە لەم جۆرە حوکمانەدا تەنانەت پێویست بە موجتەهیدیش ناکات(١٢)، واتە لەم جۆرە حوکمانە ا ئیدی ڕێسای ئوصولی باوی (موجتەهید/موقەلید)پێویستی بوونی نامێنێت(١٣)، بەمەش ڕووگەی فیقهی یاسایی (الاتجاه الفقهی القانونی ) مامۆستا ناصر سەبارەت بە قورئان بە تەواوەتی دەردەکەوێت.

پاشان بەشی سێیەم و فراوانترین جۆری حوکمە قورئانیەکان دێت کە ئەوانیش حوکمە ڕێساییەکانن (الاحکام القواعدیة)، بە بۆچونی من لەم بەشەدایە سوبحانی زانستی فیقه و زانستی پێشەکی ئەو (واتە ئوصولول فیقه) بە تەواوەتی هەڵدەوەشێنێت و میتۆدێکی ئوصولی سەربەخۆ دادەمەزرێنێت و چەندین بابەتی مردووی وەك (ناسیخ و مەنسەخ) و (شرع من قبلنا) تەنانەت (اسباب النزول)زیندوو دەکاتەوە(١٤) : بەوەی هەرکام لەو بابەتانە لە بابەتێکی پارەیی(موچوع جزئی)تایبەت بەکات و شوێنێك بۆ ڕێسایەکی گشتگیر و بان زەمکان و بۆ هەموو سەردەمەکان دەگوازێتەوە:هەربەمەش لەو فەتوایەیدا کە پەیوەندی بە پەیکەرتاشییەوە هەیە ئەو دەرەنجامە دەگرێت کە هەر لەبەر ئەوەی کە پەیکەرتاشین بۆ سولەیمان پێغەمبەر جائیز بووە، کەواتە بۆ ئێمەش دروستە، ئەگەرچی شەریعەتی سولەیمان دەکەوێتە پێش شەریعەتی پێغەمبەری ئیسلامەوە، بەمەش یەکێك لە نەریتە ئوصولیەکان تێك دەشکێنێت کە کارنەکردنە بە شەرعی پێشینان (شرع من قبلنا) تا سەرچاوە حوکمیەکانی دیکە وەستابن، لێرەوە ڕێسایەکی گشتی سەبارەت بە پەیکەرتاشی دەردەهێنێت بەوەی ئەو کارە هونەرییە دروستەئەگەر لاسایی کردنەوەی خوا نەبێت لە خەلقکردندا(نەوەك لاسایی کردنەوەی خەلقە خودا وەك ئەوی باوە وا دەوترێت)(١٥).

هەر بەمەش لە (فەلسەفەی دین) ی نویّ نزیك دەبێتەوە و وەلامی ئەو پرسیارە جەوهەریەش دەداتەوە کە کتێبێکی بە قەبارە و وشە دیاریکراوو هەزار و پێنج سەدساڵ پێشتر دابەزیوی وەك قورئان چۆن دەتوانێت وەلامی پرسیارەکانی ئەمڕۆ بداتەوە !

هەربۆیە سوبحانی لە پێشاندا لە هۆکاری قەبارە بچووکی قورئان دەدوێت و دەڵێت: ئەگەر قورئان هێندە گەورە بوایە تا ڕادەی ئەوەی هەموو بابەتەکانی تێدا باسبکرانایە ، ئەو دەمە دوو شت ڕووی دەدا:

یەکەم : عەرەبەکانی سەردەمی پێغەمبەر بە بابەتەکانی سەردەمەکانی دواتر تێنەدەگەیشتن (وەك بابەتەکانی کارەبا و فڕۆکە وکۆمپیوتەر و ئۆتۆمبێل و هتد...) دووەم : قورئان هێندە قەبارەی گەورە دەبوو کەس نەیدەتوانی (ئیدی با زۆر تەمەنیشی بکردایە)تەنیا بۆ یەك جاریش قورئان خەتم بکات(١٦)، هەر بۆیەش زۆربەی حوکمەکانی قورئان حوکمی پارەیی نین بەڵکو رێسای گشتین و بۆ زۆربەی سەردەمەکان دەشێن، هەربەمەش قورئان خەسڵەتی جیهانگیری بۆ خۆی دابین کردوە ، لێرەوە کاری موجتەهیدەکان لە هەر سەردەمێکدا کەشفی ئەو رێسا گشتیانەیە کە زۆرترینیان مرۆیی وسەربە زانستە مرۆییەکانن لە هەر سەردەمێکدا، بۆیە سوبحانی باوەڕی وایە کەسی موجتەهید بێجگە لە شارەزایی لە ئایین و شەریعەتدا دەبێت پسپۆڕیشی لە یەکێك لە زانستە مرۆییەکانیشدا(سیاسەت، دەروونزانی ، کۆمەڵناسی، ماف...) ببێت، ئەمەش یەکێك لە داهێنانەکانی ئەو پیاوەیە (١٧)، پاشان بۆئەوەی نەخشەیەك بۆ رێساکانی قورئان بکێشێت پەیوەندیەکانی مرۆڤ بۆ پێنج پەیوەندی دابەشدەکات:

١_ پەیوەندی مرۆڤ لەتەك خودادا .

٢_پەیوەندی مرۆڤ لەتەك خۆیدا.

٣_پەیوەندی مرۆڤ لەگەڵ مرۆڤەکانی دیکەدا.

٤_پەیوەندی مرۆڤ لەتەك دەوڵەتدا (سیاسەت).

٥_پەیوەندی مرۆڤ لەگەڵ ماڵدا (ئابووری)(١٨).

سەبارەت بە پەیوەندی یەکەم دەڵێت : پەیوەندی مرۆڤ لەگەڵ خوادا (کە عیبادەتە ) لە بەرئەوەی ئەم پەیوەندیە لە مرۆڤێکەوە بۆ مرۆڤێکی دیکەو لە سەردەمێکەوە بۆ سەردەمێکی دیکە ناگۆڕێت، ئیدی لە قورئاندا هەمووی باسکراوە و هەرچیەك لە قورئاندا نەهاتبێت سەبارەت بەم پەیوەندیە ئەوا بیدعەیە و نابێت ببێت(١٩)، هەروەها پەیوەندی مرۆڤ لە گەڵ خۆیدا(کە پەیوەندی دووەمە ) ئەمەش زانستی ئەخلاق دروست دەکات، سوبحانی رای وایە کە ئەخلاق پەیوەندی مرۆڤە لە تەك خۆیدا نەوەك پەیوەندی مرۆڤ لە گەڵ خەڵکی دیکەدا و چاکەکردن لەگەڵیاندا، واتەئەخلاق بریتییە لەوەی کە چاکە ببێتە (مەلەکە)لای مرۆڤ نەوەك تەنها لە دەرەوە چاکە ئەنجام بدات،لەبەرئەوەی ئەم پەیوەندیەش لەمرۆڤێکەوە بۆ مرۆڤێکی دیکە ناگۆڕێت، ئیدی هەموو رێساکانی ئەمیش لە قورئاندا باسکراون(٢٠).

سەبارەت بە پەیوەندی سێیەم کە پەیوەندی مرۆڤە لە گەڵ مرۆڤەکانی دیکەدا ئەمەش زانستە کۆمەلأیەتیەکان دەگرێتەوە ، لەبەرئەوەی ئەم پەیوەندیە لە سەردەمێکەوە بۆ سەردەمێکی دیکە دەگۆڕێت لەبەرئەوە قورئان نەهاتوە هەموو حوکمەکانی باس بکات ، بەڵکو تەنها ڕێسا گشتیەکانی هێناوە (٢١).

هەروەها سەبارەت بە پەیوەندی مرۆڤ لە گەڵ دەوڵەت (سیاسەت) و ماڵ و ئابووریش قورئان تەنها ڕێسا گشتیەکانی باس کردوە و وردەکاری بۆ عەقلی مرۆڤ بەجێهێلاوە .

ئیدی دەردەکەوێت زۆربەی حوکمە قورئانیەکان ڕێسای گشتین و چەندین بابەتی وردی تەفسیلی لەژێریاندا جێدەگرێت، هەر بەم میتۆدە ڕێساییە سوبحانی چەندین هەڵەی راویەکانی حەدیس راست دەکاتەوە کە پێچەوانەی ئەو ڕێسا گشتیانەن تەنانەت با لە سەحیحی موسلیم وبوخاریشدا بن. با لە دوای قورئان متمانە پێکراواترین کتێبیش بن ، بەلأم ئەمە مانای ئەوە نیە کە شتی لاوازیان تیدا نیە(٢٢) .

٥- فەتواکانی سوبحانی ڕەوشێکی کەلامیانەی نوێ و گەڕانەوە بو هزری ئەشعەری و ئەهلی سوننەت :

ئەو ڕێسا گشتییەی لە سەردەمی مۆدیرنەدا دەردەکەوێت ئەنجامگیری ئەقڵیانەیە، بەمانای پەیوەندی لە سەداسەد و حەتمیانەی نێوان (هۆ و دەرەنجام)، ئەویش پەیوەندیەکە لە شێوەی راستەهێڵێکدایە ، بەومانایەی ئەگەر هوکار هەبوو حەتمەن دەرەنجامیش دەبێت، ئەگەر دەرمان هەبوو بەدڵنیاییەوە شیفا دەبێت ئەم ڕەوتەش ریشەی لەنێو هزری موعتەزیلەدا لە کۆمەڵە ئیسلامیەکانی (الفرق الاسلامية) شارستانیەتی ئیسلامیدا هەیە ، لەکاتێکدا ئەم پەیوەندیە راستەهێڵیە لای ئەشعەریەکان لە شێوەی سێگۆشەدایە ، واتە ئەگەر هۆ هەبوو و ویستی خوا(الارادة الالاهية)ش هەبووئەوجا دەرئەنجام دروست دەبێت، سوبحانیش ئەم رایەی دووەمیان هەڵدەبژێرێت و بەمەش چەندین بابەتی عەقائیدی وەك (شەفاعەت) و نوشتە (الرقيه) روون دەکاتەوە و لەگەڵ هزر و میتودی قورئاندا دەیانگونجێنێت:ئەویش بەوەی بە بێ بونی هۆکار (کردەوەی مرۆڤ) ناشێت پشت بە شەفاعەتی پێغەمبەر ببەسترێت و هەروەها (توسل) یش بریتییە لە کردەوەی چاکی مرۆڤ . هەروەها لە چارەی نەخۆشیدا دەبێت دەرمان بکرێت ئینجا دوعا بکرێت ودواجار دەرەنجام کە

بریتیەلە شیفا و چارەی نەخۆشی دەردەکەوێت، ئیدی ئەو پەیوەندیە دوالیزمەی نێوان ( هۆ و دەرەنجام) بۆ پەیوەندیەکی سێلیزمی (هۆ، ویستی خوا، دەرەنجام ) دەگۆڕێت ئەم تەرزە هزرەش لە سەردەمی مۆدێرنەو لەلایەن بیریارە ئیسلامیەکانیشەوە لە رووی پراکتیکیەوە کەمتر بەرگری لیّ دەکرێت، بەوەش زیتر روون دەبێتەوە کە سوبحانی فەقیهێکی پێش مۆدێرنەیە(٢٣)، دەشێت ئەوەش بوترێت کە ئەو بەم رێسایە چەندین رێسای پزیشکی جوانی دەرهێناوە بەتایبەت لەرووی پۆلێنکردنی نەخۆشیەو کە زانستی پزیشکی نویّ لێی بیّئاگایە(٢٤)!

٦_گۆڕانی فەتوا بەگوێرەی کەسەکان:

یەکیك لە تایبەتمەندیەکانی فەتوا لای ناصری سوبحانی بریتیە لە گۆڕانی فەتوا بەگوێرەی کەسی فەتوا بۆدراو (المفتی لە ) کە ئەمەش لای هیچ کام لە موفتی و تەنانەت خاوەن مەزهەبەکانیش وانیە(دەکاریّ بوترێت لای ئیمامی غەزالی شتی لەو بابەتە بوونی هەیە )، بەلاّم ئەم مەسەلەیە لای ئەهلی تەسەوف و عیرفان بە تەواوەتی دیارە ، کە حوکم و ئادابەکانی مرۆڤی عاریف بەگویرەی مەقامەکان دەگۆڕێن بلیمەتی سوبحانی لێرەدا لە گواستنەوەی ئەو بابەتەدایە لە کایەیەکی وەك عیرفانەوە بۆ زانستی فیقھ بە سەرکەوتوانەش ئەو کارەی ئەنجام داوە ، ئەمەش موجتەهیدی و بتوێری ئەو پیاوە دەسەلمێنێت بۆیە لە پەراوێزی هەندێك لە فەتواکاندا دەنوسێت (پێویستە ئاگاداری ئەوزە بین ئەمە تایبەتە بە ئەهلە ئیلتیزامەوە لە موسڵمانان) بە تایبەت لە فەتوای تایبەت بە نەچوونە ژێر ئەرکی سەربازی لە دەوڵەتی ستەمکاریدا، هەروەهالەئیمامەتی نوێژ و هتد..

بۆ ئەوەی قووڵایی و زانستی بوونی فەتواکانت زێتر بۆ دەربکەوێت ، پێویستە خودی کتێبەکە بخوێنیتەوە بۆیە لێرە بەم خوێندنەوە کورتە ئیکتیفا دەکەین، لەوانەیە دیارترین رەخنەیەکیش کە بشێت لەو تەرزە فەتوادانە بگیرێت بریتی بێت لەدیدی سەرجەمگیری و شمولیانەی بۆئایین ، ئەمەش یەکێك لە تایبەتمەندیەکانی مامەڵەی فیقهیانەی ئایینە کە سوبحانی ویستوویەتی خۆی لیّ دەرباز بکات ، بەلاّم هەر هێندەی بۆ کراوە کە لە حیددەتی کەم بکاتەوە .

پەراوێزەکان:

١- ناصری سوبحانی ، کتێبی (الفتاوی) ، دەستنووس، ل١٠.

٢- هەمان سەرچاوە ل٢.

٣- هەمان سەرچاوە ل٣.

٤- هەمان سەرچاوە ل٢.

٥- هەمان سەرچاوە ل٢.

٦- هەمان سەرچاوە ل٧٨.

٧- هەمان سەرچاوە ل ٨٨.

٨- هەمان سەرچاوە ل ٤٥.

٩- هەمان سەرچاوە ل٥٦.

١٠-هەمان سەرچاوە ل٤٥.

١١- ئەحمەدی موفتیزادە کاسێتەکانی ئیسرا و میعراج کاسێتی (١).

١٢-سوبحانی، فەتاوی، ل٤٥.

١٣- هەمان سەرچاوە ل٤٦.

١٤- هەمان سەرچاوە ل٧١.

١٥- هەمان سەرچاوە ل٧٠.

١٦- سوبحانی، کاسێتەکانی سیستەمی سیاسی ژ (٤).

١٧- هەمان سەرچاوە ل٨٩.

١٨- هەمان سەرچاوە ل٨٩.

١٩- هەمان سەرچاوە ل٩٠.

٢٠- هەمان سەرچاوە ل٨٩.

٢١- هەمان سەرچاوە ل٨٩.

٢٢- هەمان سەرچاوە ل٦٨.

٢٣- هەمان سەرچاوە ل٧٨.- هەمان سەرچاوە ل٧٨.